SONG & MUSIC IN ISLAM

# سروود و مۆسیقا

# و

# چەند بابەتێكی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا





چاپی دووەم

عەلی باپیر

التفسير

# سرووود و مۆسیقا و
# چەند بابەتێکی هونەریی
## لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا

- وێنەگرتن و وێنەکێشان و پەیکەرتاشین.
- نوانـدن(التمثیل).
- وەرزش و یاریی.
- شایی و هەڵپەڕین و چەپڵەلێدان وفیکە کێشان.
- پێکەنین و نوکتەو گاڵتەو قسەی خۆش.

عەلـی باپیـر

چاپی دووەم





# سروود و مۆسیقا و چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا


نوسـەر: عـەلـی باپـیـر

بـڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن/ هەولێر

خـەت: نـەوزاد کـۆیی

نەخشەسازی ناوەوە: عزالدین محمد عمر

بـەرگ : أمین مخلص

نۆرە و ساڵی چاپ: دووەم ١٤٣٦-٢٠١٥

تـیراژ: ١٥٠٠ دانـە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٣٧١) ساڵی ٢٠١٤ پێدراوە







نوسینگەی تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر – شەقامی دادگا – ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

Mob: +964 750 460 51 22

Tel: +964 750 818 08 66

www.tafseer-pub.com

tafseeroffice@yahoo.com

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد ومن والاه

بەندە (عەلی باپیر) ڕێگەم بە مامۆستا مخلص و

نووسینگەی تەفسیرم تەخویل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا بەرەکەت و پێزی زیاتر

بخاتە ئیش و کاریانەوە.

وە جگە لەوان هیچ کەسی دیکە مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە.

ع

عەلی باپیر

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

# نێـوەڕۆك


پێشەکی چاپی دووەم........................................................١٤
پێـــشــەکی...................................................................١٦
چــەند ڕوونکردنەوەیەکی پێویست.........................................١٩
ڕێ خۆشـــکردن ...............................................................٢٥
بەشـــی یەکـــەم.................................................................٢٧
پێناســەی هونــەرو چــوار ڕاســتی گرنگ...................................٢٧
١- پێناســەی هونــەر:........................................................٢٨
یــەك: لەڕووی زمـــانەوانیــیەوە:.......................................٢٨
دوو : لەڕووی زاراوەیی یـــەوە:...........................................٢٩
٢- هــونەری هــەر کۆمەڵگایەك هــەڵقوڵاوی واقیعـــی فیکریــی و کلتــووریی و شـارســتانییەتی:...................................................................٣٢
٣- زۆرێك لە مسوڵمانانی ئەم ڕۆژگارە لــەبواری هونــەردا دووچــاری تێپەڕانـدن و بەزایــەدان بوونە :...........................................................٣٣
٤- ئیســلام مامــەڵەیەکی واقیعــییانەی لەگەڵ مرۆڤ دا کردوەو ڕەچـــاوی هـــەر کـام لـــــە: جەســتەو ڕووح و عەقڵ و ویژدانی کردوە:..........................٣٥
٥- قورئان و سوننەت لە هەموو بوارەکانی ژیاندا گرنگییان بە جوانیی داوە:...٤٠
بەشـــی دووەم.................................................................٤٥
چەند بنچــینەیەکی شــەرعیی بۆ هــەڵس وکەوت کردن لەگەڵ هونەردا.............٤٥
١- بناغــە لە شــتاندا ڕەوایی یــە (الأصل في الأشياء الإباحة):.......................٤٦
٢- بنـــاغە لـــە خـــواپـــەرستـــییەکـــانـــدا ڕێ لێـگیرانـــەو بنـــاغـــە لەهەڵسوکەوتەکاندا دەستکراوەیی یە (الأصل في العبادات الحظر والأصل في المعاملات العَفو)......٤٧
٣- هــەرچی پــاك و چــاك (طيبات)ە هــەمووی حــەڵاڵە:.........................٥٠
٤- بناغــە لە هەڵس و کەوتەکاندا بەدوای حیکمــەت و هۆکاردا گەڕانە، بــەڵام بناغە لە خوا پەرستییەکاندا پابەندیی و گەردن،کەچییــە:..........................٥٣
٥- بەحــەڕام دانان (التحريم) پەکی لەســەر دەقێکی شەرعیی ڕاستو ڕاشـــکاو

كــەوتوە:.................................................................................................... ٥٥
٦- ئەو شتانەی،كە خەڵكی لەكاتی دابەزینی شــەریعەتدا بەگشــتیی گیــرۆدەیان بوون، ناگونجێ حوكمەكــەیان ڕوون و ئاشــكرا نەبێ (ما تعم به البلوى في عهد التنزيل لا يصح تصور خفاء حكم الشرع فيه):....................................................................................... ٥٧
٧- ڕێی گـوناهـگرتن (سَدُّ الذريعة) نابێ بكرێتــە پاســاوی شــتی ڕەوا لــە خــەڵك قەدەغــەكردن و هەرشــتێك لە ڕۆژگاری دابــەزینی شــەریعەتدا ڕەوا بــووبــێ، هــەر ڕەوایــە:.......................................................................................... ٥٩
٨- فەرمــودەی بێــهێز (الحديث الضعيف) حوكــمی شــەرعیی لەســەر بنیــات نــانرێ:........................................................................................... ٦١
٩- ئەو دەقانەی هــەواڵدان بە شــتێكی ئایندەیان تێدایــە، خۆیــان بەتــەنیا نابنــە بەڵگــەی حوكمێكی شەرعیی (لا تدل النصوص المُخبِرة عن أمر مستقبليّ بمفردها على حكم شرعي):٦٣
١٠- بیروبۆچوونی هاوەڵان -خوا لێیان ڕازی بێ- بــەگشــتیــی لەهــی خــەڵكی دیكە لەپێشــترە، بەڵام هیچ بیــروڕایەك لــەبــەر پــایــەو شــكۆی خــاوەنــەكــەی نــابــێتــە بــەڵــگــەی شـــــەرعیـــی:.................................................... ٦٦
١١- قســەو بیروڕای زانایان بــە بەڵگـــە ناهێنرێتــەوە، بــەڵكو بەڵگــەی لەســــەر دەهێنرێتەوە (أقوال العلماء وآراؤهم يُستدلُّ لها ولا يُستدلُّ بها):............................................ ٦٦
١٢- ئامرازەكــان حوكمی ئامانجــەكانیان هــەیە (للوسائل حكــم المقاصد):..... ٦٧
بەشــی ســێــیەم.............................................................................. ٦٩
گــــۆرانـــــیـــــــی و ســـــــروود و مـــــۆســـــیـــــقـــا...................................................... ٦٩
باسی یەكــەم: ڕوونكــردنەوەی چەمك و واتای چەند وشــەیەك:................... ٧٠
١- لَـهُــو :................................................................. ٧٠
٢- لـــغـــو :............................................................ ٧٤
٣- غـــنـــاو:.............................................................. ٧٧
٤- مـــعـــازف:.......................................................... ٧٩
٥- مـــزامـــیـــر:........................................................ ٨١
٦- مـــوســیـــقـــی:...................................................... ٨٣
باســی دووەم: ئامێــرە مۆســیقایــیەكان و جۆرەكانیــان :.......................... ٨٤
یەكـــەم : پێداكێشــراوەكان (ذوات الضَّــرْب):.......................................... ٨٤

دووەم : ژێدارەکـــان (ذوات الاوتــار) :........................ ٨٥
سێیەم: فووداره‌كان (ذوات النّفخ):.................................. ٨٥
باسی سـێیەم: زانایـان لـەبارەی گـۆرانیی و مۆسـیقاوە ڕاجیاییـان هەیـەو یەکدەنگیی (إجماع) هەبوون لەسـەر قەدەغەکرانیان، قسەیەکی بێ بناغەیە :.....٨٧
باسی چوارەم: هەرچەندە بناغەی هەڵس و کەوت لەگەڵ بابەتـە خـیلافییـەکاندا تەبایی و کراوەیی یە، بەڵام هەندێك لە زانایان لـەبارەی گۆرانیـی و مۆسـیقـاوە بەهـۆی دەمـارگیـریی و کاردانـەوەوە گیـرۆدەی زێدەڕۆیی و بـەزایـەدان بـوونـە :.................................. ٩٥
باسی پێنجـەم: زانایانی پێشـین لـەبارەی گـۆرانیی و مۆسـیقاوە هـەڵوێسـتیان نەرمتـر بووە لەوانەی پاشـین.................................. ١٠١
١- هـاوەڵان ( الأصحاب ) :.................................. ١٠١
٢- شـوێنکەوتـوان ( التـابعیـن ) :.................................. ١٠٢
٣- قـازییـەکـان ( القضـاة ) :.................................. ١٠٣
٤- فەرمـوودە ناسـان ( المحدِّثیـن ) :.................................. ١٠٣
٥- قورئـان خوێنـان ( القـرّاء ):.................................. ١٠٤
باسی شـەشـەم: هیـچ زانایەك بەڕەهایی و بێ مەرج و بەند، گۆرانیی و مۆسـیقای بـەڕەوا دانەنـاوە:.................................. ١٠٨
باسـی حـەوتەم: بەڵـگـەکانی بەقەدەغـە دانـەرانی گۆرانیـی ومۆسـیقا بـە گشتیی وبەرپەرچـدانەوەیان[1]:.................................. ١١٠
جـۆری یەکـەمی بەڵگـەکـانیـان: چەنـد ئایەتێکـی قورئـان :.......... ١١١
جۆری دووەمی بەڵـگەکـانی بە قەدەغە دانەرانـی گـۆرانیی و مۆسـیقـا : چەند دەقێکـی سـوننـەت :.................................. ١٢١
پوختــەی قسـان :.................................. ١٣٣
جـۆری سـێیەمی بەڵـگەکـانی بەقەدەغەدانـەرانی گـۆرانیی و مۆسـیقـا : یەکـدەنگـیی زانـایـان :.................................. ١٥٨
جۆری چوارەمی بەڵگەکانی بەقەدەغەدانەرانی گۆرانیی و مۆسیقا: گـۆرانیی و مۆسیقا عادەتی خراپەکارانەو خۆ وێچواندنی وانیش قەدەغەیـە :............. ١٦٠
جـۆری پێنجـەمی بەڵـگـەکانی بەقەدەغەدانـەرانی گـۆرانیی و مۆسیقـا :

ڕێگــرتن لە گوناهــو خراپــە (سَدُّ الذريعـة) :........................ ١٦٣
جــۆری شەشــەمی بەڵگــەکانی بەقەدەغەدانــەرانی گــۆرانیی و مۆسیقــا :
گۆرانیــی و مۆسـیقا بــۆ تێکــدانی خــەڵك لە شــەڕاب خراپتــرن :.... ١٦٥
جۆری حەوتەمی بەڵگــەکانی بەقەدەغەدانەرانی گۆرانیی و مــۆســیقــا :
دەنــگــی گۆرانـــیی و مۆسـیقــا مــایـــەی سەرگەرمبوون و بەکـەیف
هاتنی مرۆڤە :........................................................... ١٦٧
باسـی هەشــتەم: چـەند بەڵـگـەیەك لەســەر لە بنەڕەتەوە ڕەوابوونی گۆرانیــی
و مۆســیقا :........................................................... ١٦٩
یـەك: چەنــد ئایەتـێکــی قورئــان:........................................ ١٧٠
دوو: چەنـد فەرمووده‌یەکــی پێغــەمبەر ﷺ:............................. ١٧٣
سێ: چەند شـوێنەوارێك لـە هـــاوەڵانەوە لەسـەر لـە بنەڕەتــەوە ڕەوابوونــی
گۆرانیی و ئامێرە دەنگـیـیەکــان :......................................... ١٨٦
چــوار: ئامانجــەکانی شــەریعەت:.......................................... ١٩٠
یـــەك : گـــوێ بیســـت بوونی پیاوان و ئافرەتــان بـۆ دەنگـی یەکـــدی
شتێکــی ڕەوایــە : بە بەڵگــەی ئــەوە کە :................................ ١٩٤
ســێ : بـابـای گۆرانیی بێژو مۆســیقارو ئەوەش کە گوێیان لـێدەگرێ، بـەو
ڕەفتارەیــان دادگەریی لەدەسـت نادەن:.................................... ١٩٦
چــوار: لــەم ڕۆژگارەدا مـۆســیقا بۆ زۆر ئــامانجــی گرنگ بـــەکاردێ،
بەتایبەت لە بواری تەندروستیی و لە بواری ئابــووریــیدا:.................. ١٩٧
پێنج: هیچ بەڵـگەیەك لەسەر ئەوەنیە، کە ئافرەتانی دەف لـێدەری ڕۆژگـــاری
پێغەمبەر ﷺ کچــی گچکــەی نابالغ بووبن:................................ ١٩٨
شـەش : هیچ بەڵـگـەیەك لەسەر ئەوە نیە، کـە دەف لێدان تـایبەتــە بـە
ئـافرەتـانەوەو پیاوی دەف لـێدەر خۆی بە ئــافرەتان شـوبهاندوە :............ ١٩٩
حـەوت : شیعر کەرەسـەی خاوی گـۆرانیی و سـروودە، بـەپێی نێوەڕۆکەکـەی
حوکمــی دەگــۆڕێ :...................................................... ٢٠١
پوختــەی قسان لەبارەی حوکمی گۆرانیی و سـروودو مۆســیقاوە ................ ٢٠٣
بەشی چــوارەم............................................................. ٢٠٧
وێنــەگـرتـــن و وێنــەکێشـــان و پـــەیـکـەرتـــاشـــیـــن
(التصـوير والرسّم و النَّحت) ............................................. ٢٠٧

باسی یەكەم: ڕوونكردنەوەی چەمك و واتای: تصویر، رَسمْ، نَحْت:...... ٢٠٩
١- تَصْویرْ :........................................ ٢٠٩
٢- رَسْم: ........................................ ٢٠٩
٣- نَحْتْ : ........................................ ٢١٠
باسی دووەم: چەند دەقێكی قورئان و سوننەت لەبارەی وێنە كێشان و پەیكەرتاشینەوە :........................................ ٢١٣
یەكەم: چەند ئایەتێكی قورئان:........................................ ٢١٣
دووەم : چەند دەقێكی سوننەت :........................................ ٢١٥
باسی سێیەم: ئەنجامگیریی: حوكمی وێنەكێشان و پەیكەرتاشین و بەكارهێنانی وێنەو پەیكەر :........................................ ٢٢٢
باسی چوارەم: وێنەی فۆتۆگرافیی و سینەمایی و كاریكاتێریی :........... ٢٣٨
یەكەم: وێنەی سینەمایی و ڤیدیۆیی :........................................ ٢٣٨
دووەم: وێنەی فۆتۆگرافیی :........................................ ٢٣٨
سێیەم: وێنەی كاریكاتێریی :........................................ ٢٤٢
باسی پێنجەم: وێنەی ئافرەت:........................................ ٢٤٤
پوختەی مەبەست :........................................ ٢٥٠
بەشی پێنجەم........................................ ٢٥٢
نواندن (التمثیل)()........................................ ٢٥٢
باسی یەكەم: پێناسەی نواندن (التمثیل):........................................ ٢٥٣
١- پێناسەی نواندن لەڕووی زمانەوانییەوە :........................................ ٢٥٣
٢- پێناسەی نواندن لەڕووی زاراوەییەوە :........................................ ٢٥٤
باسی دووەم: حوكمی نواندن (التمثیل):........................................ ٢٥٦
پوختەی مەبەست:........................................ ٢٦٥
بەشی شەشەم........................................ ٢٦٦
وەرزش و یاریی........................................ ٢٦٦
باسی یەكەم: پێناسەو جۆرەكانی وەرزش و یاریی:........................................ ٢٦٨
یەك: پێناسەی وەرزش و یاریی :........................................ ٢٦٨

دووەم: جۆرەکانی وەرزش و یاریی :.................................................. ٢٦٩
باسی دووەم: حوکمی وەرزش و یاریی بەگشتیی:...................... ٢٧٠
باسی سێیەم: حوکمی جۆرەکانی وەرزش و یاریی:...................... ٢٧٥
بەشی حەوتەم.............................................................................. ٢٩٠
شایی و هەڵپەڕین و چەپڵە لێدان و فیکە کێشان.......................................................................... ٢٩٠
باسی یەکەم: شایی و هەڵپەڕین:........................................ ٢٩٢
١- پێناسەی شایی و هەڵپەڕین :........................................ ٢٩٢
٢- حوکمی شایی وهەڵپەڕین :........................................... ٢٩٢
باسی دووەم: چەپڵە لێدان و فیکە کێشان:.............................. ٢٩٦
١- پێناسەی چەپڵە لێدان و فیکە کێشان :............................ ٢٩٦
٢- حوکمی چەپڵە لێدان و فیکە کێشان :.............................. ٢٩٧
بەشی هەشتەم.............................................................................. ٣٠٠
نوکتەو گاڵتەو قسەی خۆش و پێکەنین ............................................ ٣٠٠
باسی یەکەم: پێکەنین لە قورئان و سوننەتدا :.......................... ٣٠٢
باسی دووەم: گاڵتەو قسەی خۆش و پێکەنین لەژیانی پێغەمبەر ﷺو هاوسەرو هاوەڵانیدا:.......................................................................... ٣٠٣
باسی سێیەم: حوکمی نوکتەو قسەی خۆش و پێکەنین و ئەو سنوورانەی نابێ ببەزێنرێن:.......................................................................... ٣١١
١- نابێ درۆکردن بکرێتە هۆکاری پێکەنینی خەڵك :............... ٣١٢
٢- نابێ گاڵتە بە خەڵك کردن و بە سووك سەیرکردنیانی تێدابێ:.... ٣١٢
٣- نابێ ببێتە مایەی ترساندنی هیچ کەس :............................ ٣١٣
٤- پێویستە لەکاتی گونجاودا بێ و، بێ جێ نەبێ :..................... ٣١٣
٥- نابێ لە ئەندازەی سروشتیی و ماقووڵی بچێتە دەرێ :....... ٣١٤



﴿... قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِۚ ...؟! ﴿٣٢﴾ الأعراف﴾.

(( إن الله جميل يحب الجمال )) متفق عليه.

# پێشکەش بێ

بە هەموو ئەوانەی دەستپێشخەر، یان هاندەری بووژاندنەوەو گەشەپێدانی هونەریی ڕەسەنن لەنێو میللەتە مسوڵمانەکەیاندا.

# پێشەکی چاپی دووەم

الحمدلله الجليل الجميل، والصلاة والاسلام على محمد الهادي بإذن ربـه إلى سـواء السبيل، وآله الملتزمين بمنهاجه المبين وهديه المتين.

خوێنەری بەڕێز!

هونەر بابەتێکی گـرنگ و کاریگـەرە لـە ژیـانی کۆمـەڵگاو، وەك تـایغێکی دوودەمیش وایە بۆ هەردووك باری خێر و شەڕ. دیارە هەردووك حاڵەت زێدەڕۆیی (افراط) کردن و بەکارهێنانی هونـەر بـەباری شـەڕ و خراپـەو بـە لاڕێ دابردنـی کۆمەڵگا بە تایبـەت چـینی گـەنج و لاو، وە کەمتـەرخـەمی (تفـریط) کـردن و پشتگوێ خستنی هونەر و بەهرە لێ وەرنەگرتنی بۆ گەشەپێدان و بەرەوپێش بردنی لایەنی چاکەو خێر و بەها بەرز و پەسندەکان لە کۆمەڵگادا، هەڵەن و پێویستییان بە چارەسەر هەیە.

منیش ئەم بەرهەمەم بە نیەتی ئەوە نووسیوە، کە کۆمەڵگایەکەمان هەرکام لەو دوو حاڵەتەی تێپەڕاندن و بەزایـەدان لـە بـواری مامەڵـەکردن لەگـەڵ هونـەردا، هـەڵبوێرێ و هەرچـی زیـاتر حاڵـەتی هاوسـەنگیی (تـوازن) بـەخۆوە بگرێـت، بێگومانیش دۆزینەوەی ڕاستەشەقام (الصراط المستقيم) و نیشانە پێکان لە هەموو

بوارەکاندا، بە تایبەتی بواری هونەر، کە هەست و سۆز (عاطفة) ڕۆڵی گەورەی تێدا دەگێڕێت، ئاسان نیە.

شایانی باسیشە ئەم کتێبە لە چاپی دووەمیشیدا وەك خۆی هێڵراوەتەوەو هیچ جۆرە دەستکارییەکی نەکراوە، هەڵبەتە ئاگاداریشم کە هەندێك کەس قسەو باسیان لەسەر ئەم بەرهەمەم هەبوو، بەڵام شتێکی وام تێدا بەدی نەکردن شایانی باس بێت و، زیاتر قەناعەت هێنان و بڕیاردانی پێش بیرلێکردنەوەو خوێندنەوەیم تێدا بینی، تاکو خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنی بابەتیانە.

بۆیە لەم چاپەشدا ئەم کتێبە کت و مت وەك خۆی هێڵرایەوەو هیوادارشم بەردەوام ئامانج و نیشانەکانی خۆی بپێکێ.

نووسەر
٤/ ربیع الأول/١٤٣٥هـ
٢٥/ کانونی دووەمی/ ٢٠١٤م
هەولێر

# پێشەکی

الحمدلله ذي الجلال والجمال المُتَسمِّي بكلِّ الأسماء الحسْنى والمتَّصفِ بجميع صفات الكمال، والصلاة والسلام والبركات على أحسن الناس خُلُقاً وأزكاهم نفساً وآله المهتدين بهداهُ الى يوم المآل.

خوێنەری بەڕێز!

خوای بەخشەر (تبارك وتعالى) پشتیوان بێ، لەم زنجیرە باسەدا، کە سەرەتا بەچەند ئاڵقەیەك لە هەفتەنامەی ( کۆمەڵ ) دا و، پاشان لە دوو توێی کتێبێکدا بڵاودەکرێتەوە، هەوڵ دەدەین لە بابەتێکی گرنگی ئەم ڕۆژگارەمان بکۆڵینەوەو تیشکی قورئانو سوننەتی بخەینە سەر، چونکە لەنێو مسوڵمانان بەگشتیی‌و لەنێو تەوژمی ئیسلامییدا بەتایبەت، مشتو مڕێکی زۆری لەسەر دەکرێ.

ئەویش بریتیە لە (هونەر)و، ئەو مەسەلە هونەرییانەش، کە بەپێویستمان زانی بیانخەینە جوغزی ئەو لێکۆڵینەوەمانەوە،کە بریتین لە:

١- گۆرانیی‌و سروودو مۆسیقا.
٢- وێنەگرتن‌و وێنە کێشان‌و پەیکەر تاشین.
٣- نواندن (التمثيل).
٤- وەرزش‌و یاریی.
٥- شایی‌و هەڵپەڕین‌و چەپڵە لێدان‌و فیکە کێشان.

٦- نوکتەو گاڵتەو قسەی خۆش‌و پێکەنین.

سەرچاوەی ئەم نووسینەشم وێڕای بیرکردنەوەو ڕامانی خۆم لە قورئان‌و سوننەت، ژمارەیەکی زۆر لە کتێب‌و بەرهەم‌و لێکۆڵینەوەی زاناو شارەزایانی ئیسلامە لە کۆن‌و هاوچەرخدا، کە ئەمانە گرنگترینیانن:

١- رسالة في الغناءِ المُلْهي: أَمُباحٌ هو أم محظور؟! .نووسینی: ابن حزم الأندلسي.

٢- المحلّى بالآثار في شرح المُجلَّى بالإختصار، مسألة: ٥٥٣. نووسینی: ابن حزم الأندلسي.

٣- إحياءُ علوم الدين: كتاب آداب السَّماع. نووسینی: أبو حامد الغزالي.

٤- إيضاحُ الدِّلالات في سَماع الآلات. نووسینی: عبد الغني النابلسي.

٥- إبطالُ دعوى الإِجماع في تحريم مطلق السَّماع. نووسینی: محمد بن علي الشوكاني.

٦- نظام الحكومة النَّبوية، المسمّى: التراتيب الإدارية. نووسینی: محمد عبدالحيِّ الكتّاني.

٧- الموسيقى والغناء في ميزان الإسلام. نووسینی: عبدالله بن يوسف الجُديع.

٨- فقه الغناء والموسيقى في ضوء القرآن والسنة. نووسینی: د.يوسف القرضاوي.

٩- الإسلام والفن. نووسینی: د.يوسف القرضاوي.

١٠- الشريعة الإسلامية والفنون. نووسینی: أحمد مصطفى علي القضاة.

١١- الإسلام والفنون الجميلة. نووسینی: د. محمد عمارة.

١٢- الغناء والمعازف في الإعلام المعاصر وحكمهما في الإسلام. نووسینی: د. محمد عبدالرحمن المرعشلي.

لە سەرەتاشەوە بە پێویستی دەزانم بە هەموو لایەکی ڕابگەیەنم کە:

هەرچەندە ئەوەندەی بۆم لواوەو پێم کراوە هەوڵمداوە، کە ئەوەی لەم زنجیرە باسەدا لەبارەی ئەو بابەتە هونەرییانەوە، کە ئاماژەمان پێکردن، دەیخەمەڕوو، ئەوە بێ کە ڕاستو هەق، یان لانی،کەم ڕاستتر بێ، وەك عادەتی خۆم ویستوومە بێ،جگە لە گوشاری بەڵگە نەقڵییو عەقڵییەکان، هیچ جۆرە گوشارێکی دیکەم لەسەر نەبێو، چی لەگەڵ دەقەکانی قورئانو سوننەتو ڕووحی شەریعەتدا دێتەوە، هەر ئەوە بڵێم.

،بەڵاّم بێگومان نە ئەم بەرهەمەو، نەهیچ بەرهەمێکی دیکەشم بەهەقو ڕاستی ڕەها (مطلق) نازانمو، پڕ بەدڵیش حەز دەکەم هەرکەسێك سەرنجو ڕەخنەیەکی لەسەر هەر مەسەلەیەك هەبوو، بەخستنە ڕووی بەهرەمەندم بکات.

هیواداریشم هەموو لایەکمان بتوانین لە هیچ ڕووێکەوە بەقەناعەت هێنانی پێش بیرکردنەوەو بیستنو ڕامانەوە، قسەنەکەینو هەڵوێست وەرنەگرینو، هەرکات هەقو ڕاستیشمان،کەوتە بەرچاوو گوێ، هەرچەندە دژو پێچەوانەی قەناعەتو بیروڕا پێشووەکانیشمان بێ، بێ سێو دوو وەری بگرین.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ألاّ إله إلاّ أنت أستغفرك وأتوب إليك.

٢٨ صفر ١٤٢٩ ك
٦ مارسی ٢٠٠٨ ز
هەولێر

# چەند ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

یەکەم: وەك لە سەرەتاو کۆتایی ئەم کتێبەدا گوتوومە: من لەم توێژینەوەیەمدا لەبارەی ئەو بابەتە هونەرییانەوە، کە ناویان هێنراوە، هەوڵمداوە چ ڕایەك ڕاست، یان ڕاستترەو بەڵگەکان زیاتر پشتگیریی دەکەن، هەڵی بژێرم‌و، تا ڕاددەیەکی باشیش لەوبارەوە خۆمم ماندووکردوە، ،بەڵام بێگومان لە بابەت‌و مەسەلە خیلافیی‌و مشت‌ومڕاوییەکاندا، هیچکەس ناتوانێ بڵێ: بۆ دواجار کۆتایی نوختەم لەسەر پیتداناوەو دەرفەت‌و بواری قسەو باسی دیکە نەماوە!

بۆیە منیش زۆرم پێ ئاساییە لەبارەی ئەم کتێبەم‌و بابەتەکانییەوە، قسەو باسی جیاواز بکرێ‌و ڕەخنەم ئاڕاستە بکرێ، ،بەڵام هیوادارم:

١- هەرکەسێك قسە لە هەر بابەت‌و مەسەلەیەك دەکات لەمەڕ ئەوانەی، کە لەم کتێبەدا هاتوون، سەرەتا باش باش لێکۆڵینەوەکەی من بخوێنێتەوەو لێی تێبگات‌و، هەمیشەش ئاگاداری ئەو دوازدە بنەماو بنچینە شەرعییانە بێ، کە لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا هاتووە، چونکە زۆربەی زۆری باس‌و بابەتەکانی دیکەی ئەم کتێبە، وەك دیوارێك وان، کە لەسەر بناغەی ئەو بنەمایانە هەڵچنراوە.

٢- من،کە دەڵێم بابەت‌و مەسەلە خیلافییەکان، قسەو باسی جۆراو جۆریان لەبارەوە کراون‌و دەکرێن، لەوە بێ‌ئاگانیم، کە زۆر کتێب‌و سەرچاوە هەن، قسەو باسی زۆرو جۆراوجۆری جیاواز، لە هەندێك لەو بیروڕایانەی بەندەیان تێدایە، ،بەڵام گرنگ ئەوەیە بزانرێ، کە ئەو قسەو باسانەش، هەر بیروڕان‌و، هیچیان

ناتوانن وەك خودی ئیسلام، یان بەهێزو بێهێز، یان ڕاستو ڕاستتری نێو بیرو ڕایەکاندا، تەنیا بەڵگە دەور دەبینێ، نەك هیچ ئیعتیبارێکی دیکە، کەواتە:

داواکارم وهیوادارم لەهەرکەسێك، کە شتێك لەبارەی ئەم کتێبەمەوە دەنووسێ، وەك هەڵسەنگاندنو ڕەخنە لێگرتن، با تەنیا بەوەندە واز نەهێنێ، کە ئەو قسەو بیروڕا جیاوازانە ڕیز بکات، بەڵکو، با هەوڵبدات وەڵامی ئەو بەڵگانە بداتەوە، کە من پشتگیریی ڕایەکانم پێکردوون، ،ئەگەرنا قسەو باسی جیاواز هێنانو ڕیزکردنیان، هیچ دادێکی نادات‌و، ئازایەتیشی تێدانیە، من پێش وەخت گوتوومەو دەڵێم: لەوبارەوە قسەوباس زۆرن!

شایانی باسیشە قسەو بیروڕای زانایان، ناگونجێ‌و ڕاست نیە وەك خودی ئیسلام مامەڵەی لەگەڵ بکرێ، ،ئەگەرنا، ئیسلامان زۆر دەبن‌و، هیچ زانایەکیش هەقی ڤیتۆی لە بەرانبەر خەڵکی دیکەدا پێنەدراوەو، وەك پێشتر گوتم، یەکلاییکەرەوەی نێوان مەسەلە مشت‌ومڕاوییەکان، ،جگە لە بەڵگە، شتێکی دیکە نیە.

٣- هەمیشە دەستهەڵگرتنی مرۆڤ لەو بیروڕاو قەناعەتانەی، کە ماوەیەك تەبەننی کردوون، شتێکی زەحمەتە، ،بەڵام پێویستە هەموو لایەکمان بوێریی ئەوەمان هەبێ، کە دەمارگیریی ڕێی گۆڕین‌و لابردنی ئەو قەناعەت‌و بیروڕایانەمان لێ نەگرێ، کە بە بەڵگە بۆمان ساغ دەبێتەوە هەڵەن، دیارە هەمیشەش دەستبەرداری فیکرو هەڵوێستی هەڵەی خۆبوون، باج‌و مەسرەفی یەکجار کەمترە لە بەردەوام بوون لەسەری!

هەرچۆنێکیش بێ، گرنگ ئەوەیە بابێی مسوڵمان وریا بێت‌و، مەسەلەو بابەتە خیلافییەکان لە سنووری خۆیان نەباتە دەرو، نەیانکاتە بیانووو پاساوی تۆمەتبارکردنی خەڵك‌و بوغزاندنیان و...هتد، بەڵکو پێویستە هەموولایەکمان وێڕای مافی ئازادیی بیروڕا دەربڕین بەخۆدان، ئاگاداری فەرزی پاراستنی برایەتی‌و یەکڕیزیی نێوانیشمان بین، لەبەر جیاوازیی بیروڕا لەمەڕ چەند بابەت‌و مەسەلەیەکی مشت‌ومڕ هەڵگر، مافەکانی برایەتیی بەرانبەر بە یەکدی، زایە

نەکرێن.

دووەم: وەك لە چەند شوێنێکی ئەم کتێبەدا بە چەند بۆنەیەکەوە باسم کردوە:

مەرج نیە هەمیشە پارێزکاریی‌و دینداریی لە سەختگیریی‌و توندیی دابێ، بەڵکو نەرم‌و نیانیی‌و کراوەیی و ئاسانکاریی‌و سەماحەتدا بشکێتەوە، وەك ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیگەیێنێ:

((ما بالُ رجالٍ بَلَغهم عنّي أمْرٌ تَرَخَّصْتُ فيه فكرهوهُ وتنزَّهوا عنه! فوالله لأنا أعلمهم بالله وأشدّهم له خشيةً)) رواه البخاري برقم: ٦١٠١، ومسلم برقم: ٢٣٥٦ عن عائشة رضي الله عنها.

واتە: ئەوە بۆچی پیاوانێك شتێکیان لەمنەوە پێگەیشتوە، کە مۆڵەتم تێدا وەرگرتوە، پێیان ناخۆش بووەو، خۆیانیان لێ پاراستوە؟ دە بەخوا من لە هەموویان بەخوا زاناترم‌و، لە هەمووشیان چاکتری لێ دەترسم!

سێیەم: بێگومان لەم ڕۆژگارەماندا زۆربەی بوارو بابەتەکانی هونەر، لەلایەن،کەسانێکی لارو بێ بەندوبارەوە، بۆ بڵاوکردنەوەو پەرەپێدانی خراپە ئیستیغلال کراون، بەتایبەت هونەری گۆرانیی‌و مۆسیقاو نواندن، ،بەلاّم بێگومان چارەسەری ئەو حاڵەتە خراپ‌و نەویستراوە بەوە ناکرێ، کە ئێمە بەشێوەیەکی گرژبوانەو لەسەر بناغەی کاردانەوە، هەستیاریی (حسّاسية) بەرانبەر بە هونەرو هونەرمەندان بەگشتیی پەیدا بکەین‌و، لەبەر هونەری خراپ بەکارهێنراوو هونەرمەندانی لادەرو تێکدەر، سەنگەر بەرانبەر بە هونەرو هونەرمەندان بەگشتیی بگرین!

بەڵکو پێویستە لەسەر بناغەی شەریعەت‌و لە بازنەی فراوانییدا، هەوڵبدەین هونەری ڕەسەن ببووژێنێتەوەو هونەرمەندانی ڕاست‌و ڕێك‌و پاك‌و چاك، لە هەموو بوارو مەیدانەکاندا بکەینە بەدیلی ئەوەی، کە ،بەلاّمانەوە خراپ‌و زیانبەخشە، دیارە شەریعەتی خوای کاربەجێش، هەر حەرامێکی زیانبەخشی قەدەغە کردبێ، چوار دەوری خەڵك بە قەدەغەکراوەکان بتەنێ‌و وازیان لێبێنێ، یان بە بیانووو پاساوی پارێزگاریی لێکردنیان لە گوناهو خراپە، بازنە شتە

ڕەوایەکانیان لێ تەنگ بکاتەوەو حەڵاڵیان لێ حەڕام بکات!

چوارەم: سوپاس و ستایش بۆ خوا، بەندە لەبەر سەرقاڵییم بە کاری ئیسلامییەوە، مەگەر چۆن، دەنا نامپەرژێتە سەر گوێگرتن لە گۆرانیی و مۆسیقاو تەماشاکردنی فیلم و شانۆگەرییەکان و...هتد، ،بەلاّم بایی ئەوەندەش لە قورئان و سوننەت و دین و ژین تێگەیشتووم، کە ناگونجێ خەڵکی هەموو، وەك بەندەو هاوڕێنانم، ژیان بەرنەسەرو هەمیشە بەو جۆرە بیگوزەرێنن!

بەڵێ، ئایین و بەرنامەی تێرو تەواوو گشتگیری خوای کاربەجێ - عزّ وجلّ - بۆ تێکڕێی خەڵکی هاتوە، بە هەموو چین و توێژو جۆرو ئاستەکانیانەوە، هەرکەسێك وا لە ئیسلام حاڵی بووبێ، کە تەنیا بەرنامەو ڕێبازی کۆمەڵێکی تایبەتی خاوەن سەلیقەو مەشرەبێکی دیاری کراوە، پێویستە چاو بە جۆری تێگەیشتنەکەیدا بگێڕێتەوە، بەرنامە بەزەیی فراوانی خوا لە خەڵك تەسك نەکاتەوە، وەك ئەو هاوەڵەی، کە گوتی: ((اللّهم ارحمني و مُحمداً ولا تَرحَمْ مَعَنا أَحَداً))، واتە: خوایە بەزەییت بەمن و بە موحەممەد دابێ، ،بەلاّم لەگەڵ ئێمەدا بەزەییت بە کەسی دیکەدا نەیەت!

پێغەمبەریش پێی فەرموو: ((لَقَدْ حَجَّرْتَ واسِعاً))، واتە: بەڕاستی شتێکی فراوانت تەسك کردەوە!

پێویستە بشزانرێ، کە ڕەچاوکردنی ئاسانیی و کراوەیی و باری شانی خەڵك قورس نەکردن و دین لێ وەزەحمەت نەخستنیان، شتێکی ڕیشەیی و زەقە لە ئایین و بەرنامەی خوادا، بۆ وێنە خوا - عزّ وجلّ - فەرموویەتی:

﴿...يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ...﴿١٨٥﴾ البقرة﴾،

واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ و سەغڵەتیی لێتان ناوێ.

هەروەها پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: ((بَشِّروا ولاتُنَفِّروا ويَسِّروا ولا تُعَسِّروا)) متفق عليه، واتە: خەڵکی دڵخۆش بکەن و مەیان سڵەمێننەوە، دینداریيان بۆ ئاسان بکەن و پێیان وەزەحمەت مەخەن.

دیارە پێغەمبەری پێشەواشمان ﷺ هەمیشە لێی ئاسانیی گرتوە، وەك دایكمان عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ - لەبارەیەوە گێڕاویتەوە: (( ما خُيِّر

رسول الله ﷺ بين أمْرَين قطّ الاّ أخَذَ أيْسَرهما ما لم يكن إثْماً...))، واتە: هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێوان دوو شتاندا سەرپشك نەكراوە، مەگەر ئاسانەكەیانی هەڵبژاردوە، مادام گوناهـ نەبووبێ..

پێنجەم: ئامانجی سەرەكییم لەم كتێبە ئەوەیە، كە لەسەر بناغەی شەریعەت و لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا[1] چوارچێوەیەكی فراوان دیاری بكەم بۆ هەموو ئەوانەی، كە دەیانەوێ هونەری ڕەسەنی پابەند بە شەریعەتەوە، لەنێو كۆمەڵەگاكەیاندا گەشە پێبدەن، تاكو مسوڵمانان ناچار نەبن، یان بۆ تێركردنی لایەنی هونەرییان، پەنا نەبەنە بەر هونەری بێبەندوباری خەڵكێكی لادەر، یان خۆیان گیرۆدەی دەردی دورخراویی و وشكەطەبیعەتیی بكەن، پاشان بۆ پاساودانەوەی ئەو حاڵەتە نەخۆش و نەگونجاوەیان، بە بیانووی تەقواو دیندارییەوە، سەنگەر لە سەرجەم جۆرو بابەتەكانی هونەرو تێكڕێی هونەرمەندان بگرن!

چونكە بێگومان هیچ كام لە:

تەسلیم بوونی واقیعێكی هەڵەو لارومل بۆ كەچكردنی و، خۆ لێشاردنەوەو

---

١) مەبەستم لە (شەریعەت) و (قورئان و سوننەت) هەر یەك شتە كە (ئیسلام)ە، بۆیەش من هەوڵدەدەم، كە تەنیا بە پشت بەستن بە قورئان و سوننەت قسە لەسەر هەر بابەتێك بكەم، چ عەقیدە بێ، چ عیبادەت، چ تەزكیە، چ هونەر، چ حوكم و سیاسەت...هتد، چونكە بێگومان (ئیسلام) لە قورئان و سوننەتدا كورت هەڵاتوە، غەیری وەحی خوای بەرجەستە لە كتێب و سوننەتدا، هەرچی لە لایەن زانایان و پێشەوایانەوە گوتراوە، بە هاوەڵان (أصحاب)یشەوە - خوا لێیان ڕازی بێ- هەمووی بە تێگەیشتنی ئەوان لەبارەی ئیسلامەوە دادەنرێ،جا هی هەركەسێك بێ، بەتایبەت لە بواری هەڵس وكەوتەكاندا، كە بۆشایی (فراغ) زۆر بەجێهێڵراوە، مۆركی ئەو كات و شوێن و ژینگەو كۆمەڵگایەی پێوە دەبێ، كە خاوەنەكەی تێیدا ژیاوە، بۆیە زۆر ئاساییە، كە بۆ كات و شوێن و ژینگەو كۆمەڵگایەكی دیكە نەشێ!

لێڕاکردنی، شایستەی ئینسانی مسوڵمان نین‌و هەق‌و ڕاست ئەوەیە،کە واقیع پاکسازیی‌و چاکسازیی بکرێ‌و، لە بەرانبەر هەموو شتە خراپ‌و بەکەڵك نەهاتووو زیانبەخشەکاندا. شتی باش‌و بەکەڵك‌و سوود پێشکەش بکەین‌و، تەنیا بە خەڵك نەڵێین: وامەکەن‌و وامەکەن! بەڵکو پێشیان بڵێین: ئاوا بکەن‌و ئاوا بکەن!

لە کۆتاییشدا هیوادارم:

کە ئەم لێکۆڵینەوەیە، وەك خۆم مەبەستم بووەو ڕام گەیاند، ئاوا لێم وەربگیرێ‌و خوێنەرانی لە هەردوو دەردی تێپەڕاندن‌و بەزایەدان پارێزراو بن‌و، لە ئەنجامی لێتێنەگەیشتنم، یان لە یەك پچڕاندنی قسەکانمدا، شتێکم بەزارەوە هەڵنەبەستن، کە نەمگوتووەو بە مەبەست بووە.

# ڕێ خۆشــکردن

**خوێنەری سەنگیــن !**

**ئەم کتێبە سەرجەم لە هەشت بەشان پێکهاتووە:**

**بەشی یەکــەم: پێناســەی هونــەرو چــوار ڕاسـتی گـرنگ تــەرخان کـراوە، بـۆ ڕوونکردنەوەی چەمكو واتای وشەی هونەرو، خستنەڕووی چەند ڕاستییەك لەبارەی هونەرەوەو، سەرەنجام ئەم بەشی یەکەمە شێوەی دەروازەیەکی هەیە بۆچوونە نێـو بەشو باسەکانی داهاتوو.**

**بەشی دووەمیش: (چەند بنچینەیەکی شەرعیی بـۆ هەڵسوکـەوتکردن لەگـەڵ هونەردا)،کەسەرجەم دوازدە بنەماو بنچـینەی گـەورەو گرنگـی شـەرعیی تێـدا خراونەڕوو، بـۆ چـۆنیەتی مامەڵـەکردن لەگـەڵ هونـەردا، بەتایبـەتیو تێکڕێـی بابەتەکانی بواری هەڵسوکەوتەکاندا بەگشتیی، بەڵێ ئەم بەشی دووەمــە، دەوری بناغە دەبینێ بۆ بینێی تێکڕێی بابەتو باسەکانی داهاتوو:**

**بەشی سێیەمیش: (گـۆرانییو سـروودو مۆســیقا)،کەسەرجەم لــە نـۆ باسـی سەرەکی پێکدێو، زۆرترین پانتایی ئەم کتێبەی بەرکـەوتوە، تــەرخان کـراوە بـۆ توێژینــەوە لــەبارەی گــۆرانییو ســروودو مۆســیقاوە، یــان گــۆرانییو ئــامێرە دەنگییەکان، چـونکە وشـەی گـۆرانیی (غِنـاء) سـروودیش دەگرێتــەوە، وشـەی (مۆسیقا)ش چەمکەکەی تێکڕێی ئامێرە دەنگیەکان دەگرێتەوە، وەك لــە باسـی یەکەمدا ڕوونمان کردۆتەوە.**

**بەشی چوارەمیش: (وێنەگرتنو وێنە کێشانو پەیکەرتاشین) تەرخان کراوە، بـۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی وێنە (صورة)ەوە بەگشتیی، جا چ بەدەست کێشـرابێ، چ بـە**

ئامێر گیرابێ‌و، چ وەستاو بێ، چ جووڵاو، چ بێ سێبەر بێ، چ سێبەردارو...هتد.

بەشی پێنجەمیش (نواندن) بۆ لێتوێژینەوەی بابەتی نواندن (تـمثیل) تـەرخان کراوەو ڕوونکراوەتەوە، کە چ کاتێك ڕەوایەو مەرجەکانی چین؟!

لە بەشی شەشەمیشدا هەردوو بابەتی (وەرزش و یاریی) وێکڕا قسەیان لەبارەوە کـراوە، هـەم بـە گشـتیی‌و تێکڕایـی‌و، هـەم بەتایبـەتیش لـەبارەی جـۆرە سەرەکییەکانیانەوە قسەوباس کـراوەو، پـاك‌و پـیس‌و ڕەواو ناڕەوایـان وەك دان‌و کالەیەك هەڵاوێرراون.

لە بەشی حەوتەمیشدا ،هەتا ڕاددەیەکی باش قسە لەبارەی: (شایی‌و هەڵپەڕین‌و چەپڵەلێدان و فیکەکێشان)ەوە کراوەو ڕوونکراوەتـەوە، کـە ئـەمانیش وەك هـەر هەڵس‌وکەوتێکی دیکەی، دەقی قورئان‌و سوننەت ڕێ لێنەگرتوو لە بنەڕتـدا ڕەوا (مُباح)ن، ،ئەگەر لە سۆنگەی بۆ ئامانجی خراپ بەکارهێنرانەوە تێك نەدرێن.

لە کۆتاییدا بەشی هەشتەمیش تەرخانکراوە بـۆ توێژینـەوە لـەبارەی (نوکتـەو گاڵتەو قسەی خۆش‌و پێکەنین)ەوەو، لەبـەر ڕۆشـنایی چـەند دەقێکـی قورئـان‌و سوننەتدا وەك سەرجەم بابەتەکانی دیکە، قسە لەسەر ئەم بابەتە گرنگەش کراوەو وێڕای خستنەڕووی لە بنەڕەتەوە، ڕەوابوونی هەر کام لە نوکتەو گاڵتەو سوعبەت کردن‌و قسەی خۆش گێڕانەوەو پێکەنین، چەند ئەدەب‌و سنوورێکیش خراونەڕوو، کە بۆ ئەو جۆرە هەڵس‌وکەوتانە چوارچێوەو پەرژینێك پێك دێنن، نابـێ ببـەزێنرێن، ،ئەگەر بویسترێ ڕەوایەتییان لەدەست نەدەن‌و بەناڕەوا دانەنرێن .

# ١- پێناسەی هونەر:

بۆ ئەوەی چەمكو واتای وشەی هونەر (فَنّ)مان بۆ ڕوون بێتەوە، پێویستە گوێ بۆ پسپۆڕو شارەزایانی ئەو بوارە بگرین:

## یەك: لەڕووی زمانەوانییەوە:

ئاشکرایە، کە وشەی (هونەر) تەرجەمەی وشەی (فَنّ)ی عەرەبییە، جا شارەزایانی زمانی عەرەبی لەبارەی وشەی ناوبراوەوە گوتوویانە:

(فَنَّ فلانٌ: كثُر تَفَنُّنُه في الأمور، وفَنَّ الرجُلَ: أتْعَبَهُ ومَطَلَه. وفَنَّ فلانٌ فُلاناً في البيع: غَبَنَهُ. وَفَنَّ الشيءَ: زَيَّنَهُ، وَفَنَّ الشيءَ: جَعَلَهُ فنوناً وأنواعاً، وفَنَّن الكلامَ أو الرأي: تَقَلَّب فيه ولم يَثْبُتْ، وتفَنَّنَ الشيءُ: تنوَّعَتْ فُنونُهُ، وتفَنَّنَ في الأمر: مَهَرَ فيه، وتفَنَّنَ في السَّيْرِ: إضطَرب وتَمايَلَ) المعجم الوسيط، ص٧٠٣.

وەك دەبینین وشەی (فَنّ) بەهەردوو جۆری (لازِم و مُتعدِّي) هاتووە، سەرجەم مانایەکانیشی ئەمانەن، بەپێی ئەو ڕیز بەندییەی سەرەوە:

١- وردەکاریی کرد لە کارروباردا.

٢- غەیری خۆی ماندوو کردو خافلاند.

٣- فێڵی کرد، یان لەکڕین و فرۆشتنندا زیانی گەیاند.

٤- ڕازاندییەوە.

٥- جۆراو جۆری کرد.

٦- تێیدا ڕاڕا بوو.

٧- جۆراو جۆر بوو.

٨- تێیدا کارامەو دەستڕەنگین بوو.

٩- لە ڕۆیشتنندا بەناڕێکی ڕۆیی و بەملاولادا لار بوو.

واش پێ دەچێ، کە لە مانای زاراوەیی (المعنى الأصطلاحي) وشەی (فَنّ)دا، مانای ژمارە (٨) وەرگیرابێ، کە بریتییە لە ئەنجامدانی کارێك بەکارامەیی و دەستڕەنگینی، وەك دوایی ڕوون دەبێتەوە.

## دوو : لەڕووی زاراوەیی یەوە:

پسپۆڕانی بواری هونەر گەلێك پێناسەی جۆراو جۆریان هێناون، کە ئێمە تەنیا سێیان لێ بەنموونە دێنینەوە:

١- (الفَنُّ: هو التطبيق العملي للنظريات العلمية بالوسائل التي تُحَقِّقُها وَيُكْتَسَبُ بالدراسة والمرانة، والفن هو جملة القواعد الخاصة بحرفةٍ أو صناعة، وهو جملة الوسائل التي يستعملها الأنسان لإثارة المشاعر والعواطف وبخاصة عاطفة الجمال كالتصوير والموسيقى والشعر، وهو مهارة يحكمها الذوق والمواهب.. والفنان: هو صاحب الموهبة الفنيَّةِ كالشاعر والكاتب والموسيقيِّ والمصوِّر والمُمثِّل..) المعجم الوسيط، ص٧٠٣.

واتە: هونەر: بریتییە لە پراکتیزەکردنی کردەیی بیردۆزە زانستییەکان بەو ئامڕازانەی، کە دەیانهێننە دی و بەهۆی لێکۆڵینەوەو ڕاهاتنەوە وەدەستدا، هەروا هونەر بریتییە لە بنچینە تایبەتییەکانی پیشەیەك، یان پیشەسازییەك، وەبریتییە لەسەرجەم ئەو ئامڕازانەی، کە مرۆڤ بۆ وورووژاندنی هەست و نەست و سۆزەکان بەکاریان دێنێ.

بەتایبەت سۆزی جوانیی، وەك وێنەگرتن و مۆسیقاو شیعر،وە هونەر کارامەیی‌یەکە، کە سەلیقەو بەهرەکان ڕۆڵی تێدا دەگێڕن... هونەرمەندیش بریتییە لە خاوەنی بەهرەیەکی هونەریی، وەك شاعیرو نووسەرو مۆسیقارو وێنەگرو نوێنەر...

٢- (محمد قطب)یش لەبارەی پێناسەی هونەرەوە گوتوویەتی:

(الفن في أشكاله المختلفة هو محاولة البشر لتصوير الأيقاع الذي يتلقّونه في حسِّهم من حقائق الوجود، في صورة جميلة موحيةٍ مؤثِّرة، والفنان شخص موهوب ذو حساسية خاصَّةٍ تستطيع أنْ تلتقط الأيقاعات الخفيّة اللَّطيفة التي لاتدركها

الأجهزة الأخرى في الناس العاديّين، و ذو قدرة تعبيرية خاصة تستطيع أن تحوِّل هذه الإِقاعات التي يتلقّاها حسُّهُ مكبّرة مُضَخَّمة الى لونٍ من الأداء الجميل يثير في النفس الأنفعال ويُحرِّك فيها حاسَّة الجمال) منهج الفن الاسلامي، ص١١.

واتە: هونەر بەشێوە جۆراو جۆرەکانییەوە بریتیە لە هەوڵدانی مرۆڤەکان بۆ وێناکردنی ئەو ئاوازو سەدایانەی، کە بەهەستەکانیان لەڕاستییەکانیانی بوونەوە وەریان دەگرن، لەوێنەیەکی جوانیی مانا بەخشی کاریگەردا.

هونەرمەند بابایەکی بەهرەمەندی خاوەن هەستیارییەکی تایبەتە، کە دەتوانێ ئەو ئاوازە کپو پەنهانانە وەربگرێ، کە هەستەکانی خەڵکی دیکەی ئاسایی، توانێی دەرك کردنیانیان نیە، هەروا خاوەنی توانایەکی دەربڕینی تایبەتە، کە دەتوانێ ئەو ئاوازانەی بەرهەستی دەکەون، بەگەورەکراویی بگۆڕێ بۆ ڕەنگێك لە تەعبیری جوان، کە سۆزو هەڵچوونو هەستەوەری جوانیی لەدەروون‌دا دەجووڵێنێ.

٣- هەروەها (محمد قطب) لەشوێنێکی دیکەدا لەبارەی هونەرەوە هەر بەکورتی گوتوویەتی: (والفنُّ صورة من الحياة) جاهلية القرن العشرين، ص١٦٧.

واتە: هونەر وێنەیەکە لەژیان.

چۆنیەتی بەرهەم هاتنی هونەریش - هەرکام لە جۆرو شێوەکانی هونەر-و قۆناغەکانی هاتنەدی بەکورتی بەمجۆرەیە: وەك (محمد قطب) گوتوویەتی:

(١- الأنفعال النفسي بالتجربة الجديدة.

٢- إستبطان هذا الأنفعال في داخل النفس حتى يَمْتَزِجَ بأعماقها ويُعْطِيها من لَوْنِهِ ويأخذ من أَلْوانِها.

٣- إرتداد التجربة الى الخارج في صورة إِفرازٍ أَو تعبير.) منهج الفن الأسلامي، ص٦.

واتە:

(١- کارتێکرانی دەروونی بەهۆی ئەزمورونی تازەوە.

٢- لەنێو دەرو دەرووندا شاردنەوەی ئەو کارتێکرانـە ،تـاکو لەگـەڵ نـاخیدا ئاوێتە دەبێو لەڕەنگی خۆی بەدەروون دەبەخشێو، لە ڕەنگەکانی ویـش وەردەگرێ.

٣- گەڕانەوەی ئەو ئەزموونە بۆ دەرەوەی دەروون لە شێوەی دەردانێـك، یـان دەربڕینێکدا.)

ئنجا ئێستا لەبەر تیشکی ئەوەدا، کە ڕابرد دەتوانین بـەم شـێوەیە پێناسـەی (هونەری ئیسلامیی) بکەینو بڵێین:

(الفن الاسلامي هو: الذي يَرْسُمُ صورةَ الوجود من زاوية التصوّر الأسلامي لهذا الوجود، وهو التعبير الجميل عن الكون والحياة والإنسان من خلال تصـور الأسـلام للكون والحياة والإنسان )، منهج الفن الاسلامي، ص٦.

واتە: هونەری ئیسلامیی ئەو هونەرەیـە، کـە لـە گۆشـە نیگێـی تێڕوانینـی ئیسلامییەوە لەبارەی بوونەوە، بوون وێنا دەکات، وەبریتیە لـە دەربڕینـی جـوان لەبارەی بوونەوەرو ژیانو ئینسانەوە، لە میانەی تێڕوانینی ئیسلام بۆ بوونـەوەرو ژیانو مرۆڤـ.

دەتوانین بڵێیـن:

(هو التعبير عن تصور الأسلام للوجـود وذلـك ضـمن قواعـد الاسـلام الخاصـة ليؤَدِّيَ هَدَفاً شرعياً ويُثِيرَ انفعالاً مُعيناً يَتَّفِقُ مـع تصـور الاسـلام للكـون والحيـاة والإنسان). الشريعة الاسلامية والفنون، ص٣١، أحمد مصطفى علي القضاة.

واتە: بریتیە لەدەربڕین لەبارەی تێڕوانینی ئیسلام بۆ بوون، ئەویش لە جوغزی بنچـینە تایبەتییـەکانی ئیسـلامدا،تاکو ئامـانجێکی شـەرعیی بێنێتـەدیو کارتێکرانێکی تایبەتی بورووژێنێ، کە لەگەڵ تێڕوانینـی ئیسـلام بـۆ بوونـەوەرو ژیانو ئینساندا بگونجێ.

## ٢- هونەری هەر کۆمەڵگایەك هەڵقوڵاوی واقیعی فیکریی و کلتووریی و شارستانییەتی:

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

هونەری هەر گەلو کۆمەڵگایەك وەك ئاوێنەیەك وایە، کە نێوەڕۆكو کەسێتییەکەی پێشان دەدات، پێشینانیش جوانیان گوتوە: (گۆزە چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ).

ئنجا ئەم ڕاستییەی گوتمان بنچینەیەکی گشتییەو، هیچ شتێکی لێ هەڵناوێرراوەو،گەر سەرنجی هەرکام لەجۆرو بەشەکانی هونەر بدەی، هەر بەو ئەنجامە دەگەی، بۆ نموونە: ،ئەگەر سەرنجی شیعرو ئەدەب بدەین دەبینین، بۆ وێنە: شیعرو ئەدەبی عەرەبی پێش هاتنی ئیسلام - کە بەچاخی نەفامیی (العصر الجاهلي) ناسراوە- زۆر جیاوازە لەو شیعرو ئەدەبەی، کە پاش هاتنی ئیسلام لەنێو کۆمەڵگا عەرەبییەکاندا بەرهەم هاتوە، هی سەردەمی نەفامیی بەزۆری باسی شەڕو شۆڕ مەیخواردنەوەو ڕاو و ڕووتو خۆ هەڵکێشانو ئەو جۆرە بابەتانەیە، ،بەڵام شیعرو ئەدەبی ڕۆژگاری ئیسلامەتیی، باسی ئیمانو ئیسلامو جەنگو جیهادو خواپەرستییو بانگەشە بۆ ڕەوشت بەرزییو چاکەکارییو ...هتدە

نموونەیەکی دیکە:

بابەتی پەیکەر تاشیی (النَّحت)، کە لەنێو زۆربەی هەرە زۆری گەلانی دنیادا باو بووەو شوێنەوارەکانیان بەڵگەو شایەدن لەوبارەوە، بەتایبەت ئیغریقییو ڕۆمانییەکان، کە لە مۆزەخانەکاندا سەدان پەیکەری جۆراو جۆریان بەیادگار لێ جێماوە، ،بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە، کە مەسەلەی وێنەکێشان بەگشتییو، پەیکەرتاشیی بەتایبەت، بەدرێژایی مێژووی بەشەر دەروازەیەکی گەورەی بتپەرستیو هاویەشدانان (الوثنیة والشرك) بووە، دەبینین،کە لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا، مەگەر بەدەگمەن، ،ئەگەرنا دیاردەی پەیکەرتاشیی بەرچاو

ناکەوێ‌و، هونەرمەندانی مسوڵمان لەوبارەوە ڕوویان بەرەو هونەری بیناسازیی وەرچەخاندوەو، نەخش‌و نیگاری زۆریان لەبواری بیناسازیی‌و دروستکردنی گومبەزو منارەو زەخرەفەی دەرودیواردا بەرهەم هێناوە.

کەواتە: لەسەر هونەرمەندانی مسوڵمان لەهەموو بوارو مەیدانەکانی هونەردا پێویست ،کەڕەچاوی تایبەتمەندێتی ئیسلامیی هونەرەکەیان بکەن‌و، هەر بەرهەمێکی هونەریان پێشکەشکرد، هەوڵبدەن مۆرك (طابِع)ی ڕەسەنایەتیی ئیسلامیی پێوەبێ‌و خزمەتی ئەو ئامانجە بەرزانە بکات، کە شەریعەتی ئیسلامیی دەیەوێ لەژیان‌و گوزەرانی مرۆڤدا بیانهێنێتەدی، بۆ نموونە:

بابایەکی ئیسلامیی، کە پارچە شیعرێك، یان پەخشانێك دەنووسێ، یان گۆرانیی‌و سروودێك دەڵێ، یان چیرۆك‌و ڕۆمانێك دەنووسێ، یان شانۆگەرییەك ساز دەکات...هتد، پێویستە بەوردیی‌و لێزانانە ڕەچاوی سنوورو ئەدەب‌و ئامانجە شەرعییەکان بکات‌و، بەکورتی:

ڕووحێکی ئیسلامییانە بەبەر بەرهەمە هونەرییەکەیدا بکات، ئیدی ئەو کاتە ،ئەگەر پێویستی نەکرد، باهیچ ئایەت‌و فەرموودەشی تێدا باس نەکات‌و لەگەڵ ئاوێتەنەکات، زیانی پێناگات!

## ٣- زۆرێك لە مسوڵمانانی ئەم ڕۆژگارە لەبواری هونەردا دووچاری تێپەڕاندن و بەزایەدان بوونە:

دیاردەی تێپەڕاندن‌و بەزایەدان (إفراط وتفریط) لەزۆر بواردا، دیاردەیەکی لەمێژینەی مێژووی بەشەرە، شایانی باسیشە، کە حاڵەتی تێپەڕاندن‌و بەزایەدان بەزۆری لەو مەسەلانەدا ڕوو دەدات، کە پەیوەستن بەدڵ‌و دەروون‌و لایەنی عاتیفەو سۆزەوە، جا لەسۆنگەی ئەوەوە، کە هونەریش بەهەموو جۆرو شێوەکانییەوە

بەپلەی یەکەم، پەیوەستە بەدڵو دەروونو عاتیفەوە، بۆیە کێڵگەیەکی بەپیزی تیدا ڕوانو گەشەکردنی تۆوی ئەو دیاردەیەیە.

ئنجا وەك دواتریش - بۆ نموونە- لەکاتی توێژینەوەمانەوە لەبارەی گۆرانییو مۆسیقاوە دەیخەینە ڕوو، زۆرێك لە هەڵوێستی هەڵەو نەگونجاوی مشتو مڕکەران، لەبارەی گۆرانییو مۆسیقاوە، زادەو بەرهەمی ئەو حاڵەتی زێدەڕۆیی و کورت هێنانە بووە.

ئێستاش لەم ڕۆژگارەماندا، مسوڵمانان بەگشتیی لەبارەی بابەتە هونەرییەکانەوە بوونەتە دوو دەستەی دژ بەیەك: دەستەیەکیان بەکوڵكو پێستەوە بابەتە هونەرییەکانی قبووڵە، بێ ڕەچاوکردنی سنوورو ئەدەبو ئامانجە شەرعییەکانو لە شێوازە چۆتە دەرێ، دەستەیەکیشیان بەپێچەوانەوەو لەکاردانەوەی ئەو تێپەڕاندنو زێدەڕۆییو سنوور بەزاندنەدا، دووچاری،کەمتەرخەمییو کورتهێنانو بەزایەدان بووەو، هەستیاریی (حسّاسية) بەرانبەر تێکڕای بابەتە هونەرییەکانو سەرجەم هەنەرمەندان پەیداکردوە، بەبێ لێك هەڵاواردنی چاكو خراپو پاكو پیس!

ئیدی سەرەنجام هەندێك لە مسوڵمانان، لەژێر کاریگەریی هونەرمەندانی ناپابەندو بێ بەندوبارو بێ سەروبەردا، تووشی زۆر جۆرە هەڵەو پەڵەو خلیسکان بوونەو، نەك هەر ڕەسەنایەتیی ئیسلامیی، بگرە هەیانە هەر کەسێیەتیی ئاسایی مسوڵمانانەی خۆشیی لەدەستداوەو، لەبەرانبەریشیاندا، هەندێکی دیکە خۆیانو دەوروبەریان گیرۆدەی حاڵەتێکی وشکییو داخراوییو نەگونجاوییی کردوەو، ،ئەگەر ئەوانەی پێشێ ژیان بەس لەشاییو بەزمو هەڵپەڕیندا دەبینن، ئەوانی دیکەش بەپێچەوانەوە ژیان تەنیا لەخەمبارییو ماتەمو شینندا کورت هەڵدێنن!

،بەلام بێگومان تێپەڕاندنو بەزایەدان، هەردووکیان هەڵەو خراپنو هاوسەنگیی (توازن) دینو ژین تێك دەدەنو، تاكو خێزانو کۆمەڵگاش تووشی ئاکامی خراپ دەکەن، هەربۆیەش خوای کاربەجێ لەزۆر جێیاندا فەرمانی بە مسوڵمانان کردوە،

کە ڕاستە ڕێ بگرن‌و خۆیان لە هەردوو حاڵەتی زێدەڕۆییی‌و بەزایەدان دوور بگرن، وەك فەرمووبیەتی: ﴿ فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطۡغَوۡاْۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴾ هود.

واتە: دەجا وەك فەرمانت پێکراوە ڕێك‌و ڕاستبە، خۆت‌و ئەوانەش، کە لەگەڵتدا گەڕاونەوە - لێی خوا- وە سنوور شکێنی مەکەن، بێگومان ئەو، بەوەی دەیکەن شارەزایە.

هەروەها لەسەر زمانی مسوڵمانان فەرموویەتی:

﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ الفاتحة.

واتە: - ئەی خوایە!- ڕێی ڕاستمان پیشان بدەو لەسەری بەردەوامان بکە.

ئاشکراشە، کە هاوسەنگیی‌و خەتی نێوەڕاست گرتن‌و بەملاو لادا لانەدان، بناغەی دینداریی‌و دنیا داریی‌یەکی شایستەی ئیسلام‌و مسوڵمانانەو، هیچ شتێکیش هێندەی هاوسەنگیی (توازن)، جوانیی‌و ڕەونەقی بەرنامەی تێرو تەواویی خوا ناخاتە ڕوو، هەمیشەش هەڵس‌وکەوت‌و ڕەفتاری بنیاتنراو لەسەر بیرکردنەوەی پەڕگیر (مُتَطَرِّف)انە، تەمەنی کورت‌و ئاکامیشی بێ‌خێر دەبێ‌و، تەنیا شتی هەق‌و ڕاست لەگەڵ شەریعەت‌و فیطرەتدا، گونجاو دەتوانێ بەردەوام بێ.

## ٤- ئیسلام مامەڵەیەکی واقیعییانەی لەگەڵ مرۆڤـ دا کردووەو ڕەچاوی هەر کام لە: جەستەو ڕووح و عەقڵ و ویژدانی کردوە:

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

ئیسلامیی بەرجەستە لەقورئان‌و سوننەتدا بەشێوەیەکی واقیعییانە، تەماشێی مرۆڤی کردوەو مامەڵەی لەگەڵدا کردوەو، لەیەك کاتدا سەرجەم پێکهاتەکانی

لەبەرچاو گرتوەو، هیچ لایەنێکی لێ فەرامۆش نەکردوەو، هیچ لایەنێکیشی لەسەر حیسابی لایەنەکانی دیکەی لێ گەورە نەکردوە، بەڵکو خۆی لە واقیعدا چۆنە، بەوشێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردووە.

ئنجا دیارە وەك چۆن جەستە پێویستی بەخۆراكو جووڵەو وەرزش هەیەو پێیان گەشە دەکاتو، ڕوح بەخواپەرستییو یادی خوا ئارام دەگرێو ئۆخژنی بۆ دێو، عەقڵو هۆش بەبیرکردنەوەو ڕامان بەرەو پێش دەچێو بەهێز دەبێ، لایەنی عاتیفەو ویژدانیش بەهۆی هونەرە جۆراو جۆرەکانەوە تێر دەبێو گەشە دەکات.

ئێستاش با سەرنجی چەند ئایەتێکی قورئانو فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەین، تاکو بۆمان دەربکەوێ چۆن دوایین ئایینو بەرنامەی خوا، هەموو لایەنو پێکهاتەکانی مرۆڤی بینیونو ڕەچاو کردوون:

١- ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣١﴾ الأعراف ﴾. واتە: ئەی وەچەی ئادەم لەلای هەموو مزگەوتێك خۆتان برازێننەوە، بخۆنو بخۆنەوە ،بەلاّم زێدەڕۆیی مەکەن، بێگومان ئەو - خوا- زێدەڕۆیی،کەرانی خۆش ناوێ.

٢- ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ الرعد ﴾. واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو دڵەکانیان بەیادی خوا ئارام دەگرن، ئاگاداربن! بەیادی خوا دڵان ئارام دەگرنو دادەمرکێن.

٣- ﴿ إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ... ﴿١٩١﴾ آل عمران ﴾.

واتە: بەڕاستی لە دروستکرانی ئاسمانەکانو زەویو جێگۆڕکەی شەو و ڕۆژاندا، بەڵگەو نیشانە هەن بۆ خاوەن عەقڵان - لەسەر پەروەردگاریێتی خوا- ئەوانەی، کە بەپێوەو بەدانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتەکانیان یادی خوا دەکەنو بیر لەدروستکرانی ئاسمانەکانو زەوی دەکەنەوە...

٤- ﴿ وَٱلْأَنْعَٰمَ خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾ النحل﴾.

واتە: - خوا- ئاژەڵی خولقاندوە، کە مایەی پۆشاکی گەرمو چەندان سوودو بەرژەوەندییەو لێیشی دەخۆن. هەروەها جوانیی تێدایە بۆتان لەدەمی ئێواراندا، کە دەیهێننەوەو بەیانیان، کە دەیبەن بۆ لەوەڕگا.

وەك دەبینین خوای کاربەجێ لە ئایەتەکانی (٥،٦)ی (النحل)دا وێڕای سەرنجڕاکێشانمان بۆ سوودو کەڵکە زۆرو جۆراو جۆرەکانی ئاژەڵ، سەرنجیشمان ڕادەکێشێ بۆ مەسەلەی جوانیی (جمال)، بەتایبەت لە دیمەنی بردنە لەوەڕگاو هێنانەوەی لە بەیانیانو ئێواراندا، ئنجا جێی سەرنجیشە، کە خوای زانا لەp ئایەتەکەدا، هێنانەوەی ئێوارانی پێش بردنی بەیانیان خستوە! ڕەنگە حیکمەتەکەیشی ئەوەبێ، کە دیمەنی هێنانەوەی ئێوارانی ئاژەڵ، بەتێرو پڕیی‌و گوان پڕ لە شیریی، جوانترە لە دیمەنی بردنی بەیانیان بۆ لەوەڕگا بە برسیەتی!

پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم لە بۆنەیەکدا، کە بریتیە لەوەی سێ‌کەس لە هاوەڵانی، پاش پرسیارکردن لەبارەی خوا پەرستیی پێغەمبەرەوە بڕیاریاندابوو کە: یەکیان هەمیشە بەڕۆژوو بێتو نەیسێنێتەوەو، یەکیشیان هەردەم شەوانە شەو نوێژ بکاتو نەنوێو، یەکیشیان هەرگیز ژن نەهێنێ، فەرمووی: (أما والله إني لأخشاكم لله وأتقاكم له لكنِّي أصومُ أُفْطِرُ وأُصلِّي وأَرْقُدُ وأتزوج النساءَ، فمن رَغِبَ عن سُنَّتي فليس منِّي) رواه مسلم عن أنس.

واتە: ئاگاداربن! بەخوا من لە هەمووتان لەخواترسترم‌و پارێزکارترم ، بەلاَم بەڕۆژوو دەبم‌و بەڕۆژووش نابم - واتە هی سوننەت- شەو نوێژ دەکەم و دەشخەوم، ژنانیش دێنم، جا هەرکەسێك لەڕێبازی من لابدات، ئەوە لەمن نیە.

ئەم فەرموودەیەش، کە وتووێژێکی نێوان سەلمانی فارسی‌و ئەبو دەرداء دەگرێتە خۆی، زۆر باش هاوسەنگییەك، کە ئیسلام لەژیانی مرۆڤدا دەیەوێ بۆمان بەرجەستە دەکات:

(عن أبي جُحَيفة وهب بن عبدالله قال: آخى النبيُّ ﷺ بين سلمان وأبي الدرداء فرَىَى أُمَّ الدرداء مُتَبَذِّلَةً فقال: ما شأنكِ؟

قالت: أخوك أبو الدرداء ليس له حاجة في الدنيا!

فجاء أبو الدرداء فَصنع له طعاماً، فقال له: كُلْ، فأني صائمٌ!

قال: ما أنا بآكلٍ حتى تأكل، فأكل.

فلما كان اللّيل ذهب أبو الدرداء يقوم، فقال لَهُ: نَمْ، فَنامَ.

ثم ذهب يقومُ، فقال لَهُ: نَمْ! فلما كان آخر الليل، قال سلمانُ: قم الآن، فصلَّيا جميعاً.

فقال لَهُ سلمان: ان لربّك عليك حقاً وان لنفسك عليك حقاً، ولأهلك عليك حقاً، فأعطِ كلَّ ذي حقٍ حَقّهُ.

فأتى النَّبيَّ ﷺ فذكر ذلك لَهُ، فقال النَّبيُّ: صَدَقَ سَلْمانُ). رواه البخاري.

واتە: (پێغەمبەر ﷺ سەلمان‌و ئەبودەردائی کردبوونە برا، جا سەلمان سەردانی ئەبودەردائی کردو هاوسەرەکەی (أُمّ الدرداء) بە شێوەیەك بینی، کە دەستی بە خۆیدا نەهێنابوو، ئەویش پێی گوت: ئەوە بۆچی وێی؟ -واتە بۆچی خۆتت بۆ مێردەکەت نەرازاندۆتەوە؟- ئەویش گوتی: ئەبودەردائی برات گوێ ناداتە دنیا (واتە لەبەر خواپەرستیی نایپەرژێتە سەر ژن‌و ماڵ)!

ئنجا ئەبودەرداء هاتەوەو خواردنی بۆ سەلمان ساز کردو پێی گوت: بخۆ، چونکە من بەڕۆژووم!

ئەویش گوتی: هەتا نەخۆی، ناخۆم، ئیدی ئەویش لەگەڵی خوارد.
کاتێکیش شەو داهات ئەبودەرداء هەڵسا نوێژ بکات، سەلمانیش پێی گوت: جارێ بنوو، ئەویش خەوتەوە.
پاشان دووبارە هەڵسێیەوە بچێ شەو نوێژ بکات، ،بەلام دیسان پێی گوت: بخەوە.
ئنجا کاتێك کۆتایی شەوگار نزیك بۆوە سەلمان پێی گوت: ئێستا هەڵسە، ئەوەبوو پێکەوە شەو نوێژیان کرد.

ئنجا سەلمان پێی گوت: بێگومان پەروەردگارت مافی لەسەرتە، بێگومان نەفسیشت مافی لەسەرتە، هاوسەریشت مافی لەسەرتە، جا هەر خاوەن مافە مافی خۆی بدەیە.

پاشان (ئەبو ددەرداء) چووە لێی پێغەمبەر ﷺو ئەوەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش فەرمووی: سەلمان ڕاستی کردوە.)

کۆتایی ئەم باسەش بەم ئایەتە بەپێزەی خوای کاربەجێ (عزّ وجلّ) دێنین، کە وەسفی بەندە چاك‌و پەسندەکانی خۆی پێ دەکات: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ﴿٦٧﴾ الفرقان ﴾.

واتە: ئەوانەی کاتێك، کە دەبەخشن، زێدەڕۆیی ناکەن‌و ڕژدییش ناکەن‌و، لەو نێوانەدا میانجییانەن.

دیارە میانجیی بوون‌و هێڵی نێوەڕاست گرتنیش لەهەموو شتێکداو، لەهەموو بوارێکدا، خەسڵەتێکی ڕیشەیی مرۆڤی مسوڵمانە.

## ٥- قورئان و سوننەت لە هەموو بوارەکانی ژیاندا گرنگییان بە جوانیی داوە:

وەك لە پێناسەی هونەردا گوتمان:

گرنگییدان بەجوانیی شتەکانو، سەرنج لێدانو چێژ لێوەرگرتنیو بەرجەستە کردنیو تەعبیر لێکردنی، پێکهێنەری بنەڕەتی هونەرە.

جا ،ئەگەر لەوبارەوە سەرنجی کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ بدەین، دەبینین، کە زۆر بەڕوونیی و گرنگییو بایەخدان بەجوانییان تێدا درەوشایەوە، بۆ نموونە باسەرنجی ئەم ئایەتانە بدەین:

١- ﴿ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِزِينَةٍ ٱلۡكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ الصافات﴾.

واتە: بەڕاستی ئێمە ئاسمانی نێزیکمان بەجوانیی ئەستێرەکان ڕازاندۆتەوە.

٢- ﴿وَلَقَدۡ جَعَلۡنَا فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّـٰهَا لِلنَّـٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ الحجر﴾.

واتە: بێگومان لە ئاسمانیدا قەلاو بورجماندانانو بۆ سەرنجدەران ڕازاندوومانەتەوە.

دیارە مەبەستیش لەقەلاو بورجەکانی ئاسمانی، ئەستێرەو کەهکەشانەکانن.

٣- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىۡءٍ فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ خَضِرًا نُّخۡرِجُ مِنۡهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخۡلِ مِن طَلۡعِهَا قِنۡوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّـٰتٍ مِّنۡ أَعۡنَابٍ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشۡتَبِهًا وَغَيۡرَ مُتَشَـٰبِهٍۗ ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَيَنۡعِهِۦٓۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكُمۡ لَأَيَـٰتٍ لِّقَوۡمٍ يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٩﴾ الأنعام﴾.

واتە: - خوا- ئەو کەسەیە، کە لەئاسمانێوە ئاوی ناردۆتە خواریو، چەقەرەی ڕووەکی هەموو شتێکمان پێ دەرهێناوە، لەو چەقەرەیەش، ڕووەکێکی

سەوزمان دەرهێناوە، کە دانەوێڵەی پێکەوە ڕیز بووی پێ دەردێنین، لەکیفی هێشووی دارخورما، چەند هێشوویێکی شۆڕ بووەوە هەن و، چەندان باغی ترێو زەیتوونو هەنار، کە هەیە پێك دەچن و هەشیانە پێك ناچن، دەجا سەرنجی بەرو میوەکەی بدەن لەو کاتەدا، کە دەری دەکات و لەکاتی پێگەیشتنیدا! بێگومان لە ئائەوەتاندا نیشانە هەن بۆ کەسانێك بڕوا بێنن.

٤- ﴿ وَالْأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ (٥) وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ (٦).... وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ (٨) النحل ﴾.

واتە: - خوا- ئاژەڵی بۆ دروست کردوون، کە پۆشاکی گەرمو سوودی زۆری تێدایە بۆتانو لێیشی دەخۆن. دیمەنێکی جوانیشی تێدایە بۆتان، لەکاتی بەرەو ماڵ گێڕانەوەی ئێوارانو بەرەو لەوەڕگا بردنی بەیانیاندا..... ئەسپو ئێسترو کەرەکانی بۆتان ڕام کردوە ، تاکو سواریان بن و ببێتە مایەی جوانییش، وە شتی وا دروست دەکات - لەمەودوا- کە ئێستا نایزانن و سەرتان لێی دەرناچێ.

(کە دیارە مەبەست پێی سەیارەو فڕۆکەو شەمەندەفەرو... هتدە).

٥- ﴿ وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (١٤) النحل ﴾.

واتە: - خوا- ئەو کەسەیە،کە دەریێی بۆتان ڕام کردوە ، تاکو گۆشتی تەڕو تازەی لێبخۆن و خشڵێکی لێ بێننە دەرێو بیپۆشن،هەروا کەشتییەکانی تێدا دەبینی، کە لەکاتی ڕۆیشتنندا شەقی دەکەن، - دەریێی دروست کردووە- ،تاکو لە بەخششی خوا داوا بکەنو بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن.

پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە، فەرمایشتی زۆرو جۆراو جۆری هەن، بۆ نموونە باسەرنجی ئەم چەند فەرموودەیە بدەین:

١- (عن ابن مسعود أن رسول الله ﷺ قال: لايدخل الجنّة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر، فقال رجل: ان الرجل يحبُّ ان يكون ثوبُهُ حسناً وَنَعْلُهُ حسناً؟ قال: ان الله جميلٌ يحبُّ الجمال، الكبرُ بَطَرُ الحَقّ و غَمْطُ الناس) رواه مسلم.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەسێك قورسایی گەردێك خۆ بەزلگریی لەدڵدا هەبێ، ناچێتە بەهەشت، پیاوێك گوتی: بێگومان پیاو حەزدەکات پۆشاکی چاك بێو پێڵاوی باش بێت؟ فەرمووی: خوا جوانەو جوانیی خۆشدەوێ، خۆبەزلگریی بریتیە لە ڕەدکردنەوەی هەقو بەکەم سەیرکردنی خەڵك.

٢- (ما أَذِنَ الله لشيىء ما أَذِنَ لنبـيٍّ حسن الصَّوت يَتَغنَّى بالقرآن يجهر به) متفق عليه عن أبي هريرة.

واتە: خوا هیچ شتێکی بەئەندازەی ئەوە حەز لێ نەبووە بیبیستێ، وەك ئەوە،کە پێغەمبەرێکی دەنگخۆش بەدەنگی خۆشو بڵند قورئان بخوێنێ.

٣- (حَسِّنوا القرآن بأصواتكم، فان الصوت الحسن يزيدُ القرآن حُسناً) أخرجه الدارمي والحاكم والبيهقي وهو حسن.

واتە: بەدەنگی خۆشتان قورئان جوان بکەن، چونکە دەنگی خۆش، جوانیی قورئان زیاد دەکات.

٤- (قال رسول الله ﷺ لأبي موسى الأشعري: لو رأيتني وأنا أَسْتَمِعُ لقراءتك البارحة، لقد أُوتيت مِزماراً من مزامير آل داود!

فقال أبو موسى: لو علمت ذلك لحبَّرتُهُ لك تَحْبيراً) متفق عليه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبوو مووسێی ئەشعەریی فەرموو: ›ئەگەر دەتبینیم دوێنێ شەو گوێم بۆ قورئان خوێندنەکەت گرتبوو، بێگومان تۆ

ئاوازێك لە ئاوازەكانی بنەماڵەی داوودت پێ بەخشراوە! ئەبو مووساش گوتی: «ئەگەر ئەوەم دەزانی، دەنگی خۆمم بۆ خۆشتر دەكردی.

٥- (إنَّ من البيان سِحْراً وإِنَّ من الشِّعر حِكَماً) رواه أحمد وأبو داود عن ابن عباس.

واتە: بێگومان قسەكردنی وا هەیە وەك جادوویەو، شیعری واش هەیە حیكمەتە.

٦- (كان رسول الله ﷺ يتفاءَلُ ولا يتطيَّر ويُعْجِبُهُ الأسم الحَسَن) رواه أحمد عن ابن عباس.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ گەشبینی دەكرد ، بەڵام ڕەشبینی نەدەكرد، ناوی جوانیشیی حەزلێ بوو.

٧- (ان الله يحب أن يَرى أثَرَ نِعمته على عبده) رواه الترمذي.

واتە: بێگومان خوا پێی خۆشە شوێنەواری چاكەی خۆی بەسەر بەندەكەیەوە ببینێ.

واتە: هەركات دەوڵەمەندی كردو نازو نیعمەتی پێدا، لێی بەهرەمەندببێ و پێیەوە دیاربێ.

٨- (عن انس بن مالك: ماشَمَمْتُ عَنْبراً قَطُّ ولا مِسْكاً ولا شَيْئاً أطْيَبَ مِنْ ريح رسول الله ﷺ) رواه أحمد ومسلم.

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك دەڵێ: هەرگیز عەنبەرێك و میسكێك و هیچ شتێكم بۆن نەكردوە، لەبۆنی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشتر بووبێ.

٩- (عن عائيشة قالت: أَمَرَ رسول الله ﷺ بِبناء المساجِدِ في الدُّور وأَنْ تُطَيَّبَ وتُنَظَّفَ) رواه أبو داود وأحمد وابن ماجه وابن خزيمة.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كردووە بە دروستكردنی مزگەوتان لە گەڕەكەكاندا، كە بۆنخۆش بكرێن و پاك ڕابگیرێن.

١٠- (عشر من الفطرة: قَصُّ الشاربِ وإعْفاءُ اللِّحية والسِّواك واستِنْشاق الماءِ و قَصُّ الأظفار وغَسْلُ البراجم ونَتْفُ الإبْط وحَلْق العانة وانتقاص الماء) قال زكريا قال مصعب: ونَسيتُ العاشرة الاّ أن تكون المَضْمَضة. رواه مسلم.

واته: ده شت فیطرەت دەیانخوازێ: سمێڵ کورتکردنەوەو ڕیش هێشتنەوەو سیواك کردنو ئاو لەلوت وەردانو نینۆککردنو گرێچووشۆردنو بن هەنگڵ کردنو تووکە بەر تاشینو تارەت بەئاو گرتن، زەکەرییا گوتوویەتی موصعەب گوتوویەتی: دەیەمینیانم لەبیرچۆتەوە، مەگەر ئاو لە گەروو وەردانو غەرغەرە پێکردنی بێ.

لەم دەقانەی قورئانو سوننەتیشەوە، زۆر بەڕوونی، گرنگییو ئەمیەتدانی ئیسلام بەجوانییو چاکیی لە هەموو شتێکداو لەسەرجەم بوارو لایەنەکانی ژیانو گوزەراندا دەردەکەوێ، هەڵبەتە بەرنامەو ئایینێکیش لەلایەن خواوە نێررابێ و، بەکاملو تەواو پێناسە کرابێ، جگە لەمەی لێ چاوەڕوان ناکرێ.

لێرەشدا کۆتایی بەم بەشی یەکەمە دێنینو دەچینە سەر بەشی دووەم.

خوێنــەری بەڕێــز!

دوای ئەوەی لە بەشی یەکەمی ئــەم زنجیرە باســەدا، تیشــکمان خســتە ســەر چەمكو واتای وشەی (هونەر)و تێڕوانینی شەریعەت بۆ هونــەر بەگشــتیی، خــوا یاربێ لەم بەشی دووەمــەدا، چەند بنەماو بنچینەیەکی شەرعیی دەخەینە ڕوو، کە پێویستە لەسەر بناغەیان هەڵسوکەوت لەگەڵ بابــەتی هونــەرو هــەر بابــەتێکی دیکەی هاوشێوەشیدا بکەین، بۆ ئەوەی گیرۆدەی هەڵەو خلیسکان نەبین، بەتایبەت هەردوو حاڵەتی هەڵەو کوشندەی: تێپەڕاندنو بەزایەدان (الإفراط والتفـریط)، ئەو بنچــینانەش ئەمانــەی خــوارەوەن، کــە وێــڕای خســــتنەڕوویان، ســەرو کورتــە پێناسەشیان دەکەین:

## ١- بناغــە لە شــتاندا ڕەوایی یــە (الأصــل في الأشياء الإباحــة):

مەبەست لەم بنچینەیە ئەوەیە، کە هەموو ئەو شتانەی لەزەویو ئاسماندا هەن، بۆ مرۆڤ ڕەوایە بەکاریان بێنێو بــەهرەیان لــێ وەربگــرێ، مەگــەر شــتێك بــە دەقێکی قورئانو سوننەتی ڕوونو ڕاشکاو قەدەغە کرابێو، لەو بنچینە گشــتییە هەڵاوێرابێ، جادیارە ئەم ئەسڵە شەرعییەش، کە زانایان لەسەری یەکدەنگن لــە کۆمەڵێك ئایەتی قورئانیان وەرگرتوە، بۆ نموونە:

١- ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ...﴿٢٩﴾ البقرة ﴾.

واتــە: -خــوا- ئــەو کەســەیە،کە هەرچــی لــە زەویدایــە بــەتێکڕا بۆتــانی دروستکردوە...

٢- ﴿ أَلَمۡ تَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗۗ ...﴿٢٠﴾ لقمان ﴾.

واتە: ئایا نەتانزانیوە، کە خوا هەرچی لە ئاسمانەکانو لە زەویدایە بۆی مەیسەر کردوون، نیعمەتە ئاشکراو پەنهانەکانی خۆی بەسەرتاندا ڕشتوە!

٣- ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ الملك ﴾.

واتە: -خوا- ئەو کەسەیە،کە زەوی بۆ دەستەمۆ کردوون، دەجا بەقەدپاڵەکانی دا بڕۆنو لە بژێوەکەی - واتە هی خوا- بخۆنو بۆلێی ویش گەڕانەوەتان مسۆگەرە.

## ٢- بنـاغە لە خـواپـەرستییەکـانـدا ڕێ لێـگیرانـەو بنـاغـە لەهەڵسوکەوتەکاندا دەستکراوەیی یە

## (الأصل في العبادات الحظر والأصل في المعاملات العَفْو)

یاساکانی شەریعەتی ئیسلام بەگشتیی دوو بەشن:

أ- خواپەرستییەکان (العبادات).

ب- هەڵسوکەوتەکان (المعاملات).

مەبەستیش لە خواپەرستییەکان (العبادات) هەموو ئەو شتانەن، کە پەیوەندییان بەنێوانی بەندەو خوای پەروەردگارەوە هەیە،مەبەستیش لە هەڵسوکەوتەکان (المعاملات- العادات) هەموو ئەو مامەڵانەیە، کە مرۆڤەکان ڕەفتاریان پێدەکەنو، لە پەیوەندییەکانی نێوخۆیاندا ڕەچاویان دەکەن.

جا زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە بناغە لە خواپەرستییەکاندا، ڕێ لێگیران (حَظْر)ە، مەگەر ئەوەی شەریعەت ڕێی پێدابێ، بناغە لە هەڵسوکەوتەکاندا، ڕێ پێدران (عَفْو)ە، مەگەر شتێك شەریعەت ڕێی لێگرتبێو قەدەغەی کردبێ.

زانایان لەوبارەوە ئەم بنچینە شەرعییەیانداناوە: (الأصل في العبادات الحَظْر الاّ ما وَرَد عن الشارع تشريعُهُ، والأصل في العادات الإباحة الاّ ماورد عن الشارع تحريمُهُ)[1]، واتە: بناغە لە خواپەرستییەکاندا قەدەغەکرانە، ،جگە لەوەی شەرعدانەر داینــاوە، بناغە لە هەڵسوکەوتەکاندا ڕێ پێدرانە، ،جگە لەوەی شەرعدانەر قەدەغەی کردوە.

(ابن تيمية) لەوبارەوە وەك عادەتی خۆی، ڕوونتر قسەی کردوەو گوتوویەتی[2]:

﴿تصرّفات العباد من الأقوال والأفعال نوعان: عبادات يَصْلح بها دينهم، وعادات يحتاجون اليها في دنياهم، فباستقراءِ أصول الشريعة نعلم أن العبادات التي أوجبها الله تعالى أو أحبَّها لايثبت الأمر بها الاّ بالشرع، وأما العادات فهي ما اعتاده الناس في دنياهم مِمّا يحتاجون اليه والأصل فيه عدم الحَظْر، فلا يُحْظَر الاّ ما حَظَره الله سبحانه وتعالى....

ان الأصل في العبادات التوقيف، فلا يُشْرعُ منها الاّ ما شرعه الله، والاّ دَخَلْنا في معنى قوله تعالى: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ... (٢١) الشورى﴾، والعادات الأصل فيها العَفْوُ فلا يُحْظَرُ منها الاّ ما حرَّمه الله، والاّ دخلنا في معنى قوله: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا ...؟! (٥٩) يونس﴾.﴾.

واتە: جموجۆڵی بەندان لە قسەو کردەوەکان دوو جۆرن:

چەند خواپەرستییەك، کە دینداریيانی پێ چاك دەبێ و، چەند هەڵسوکەوتێك، کە بۆ دنیاداریی‌یان پێویستیانە.

---

١) بڕوانە: (أصول الفقه المهمة) عبدالرحمن ناصر السّعدي، ١٠٥، ١٠٦.

٢) بڕوانە: (القواعد النورانية الفقهية)ص١١٢.

جا بەچاو پێداگێڕانی گشتیی بنچینەکانی شەریعەت دەزانین، کە ئەو خوا پەرستییانەی، کە خوا پێویستی کردوون، یان پەسندی کردوون لەڕێی شەرعەوە نەبێ دانانرێن، ،بەلاّم عادەتو هەڵسوکەوتەکان ئەوە شتێکن، کە خەڵکی بە حوکمی پێویستی ژیانی دنیایان پێیانەوە ڕاهاتوونو بناغە تێیاندا قەدەغە نەکرانە، بۆیە لەو بوارەدا ،جگە لەوەی خوا سبحانه وتعالی قەدەغەی کردوە ڕێی لێناگیرێ....

بەڵێ بناغە لە خواپەرستییەکاندا وەستێنرانەو، ،جگە لەوەی خوا دایناوە نابێ بکرێ، ،ئەگەرنا دەکەوینە بەر حوکمی فەرموودەی خوا: (یان ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن، کە بەرنامەیەکیان بۆ داناون، کە خوا مۆڵەتی نەداوە؟!) ،بەلاّم عادەتو هەڵسوکەوتەکان بناغە تێیاندا دەستکراوەییەو، ،جگە لەوەی خوا قەدەغەی کردوە قەدەغە نیە، ،ئەگەرنا دەکەوینە بەر حوکمی فەرموودەی خوا: (بڵێ: ئەو بژێوە دەبینن، کە خوا بۆی ناردوونە خوارێ، کەچی ئێوە - بەکەیفی خۆتان- حەرامو حەلاّلتان تێدا داناوە!).

شایانی باسیشە، کە بۆ سەلماندنی ڕاستیی ئەوە،کە: ئەسڵ لەعادەتو هەڵسو کەوتەکاندا ڕەوایی‌و ڕێ پێدرانە، وێڕای ئەنجامگیرییەك، کە لە چاوپێداگێڕان (إسقراء)ی گشتیی شەریعەت دەکرێ، بەڵگەی دیکەش زۆرن، بۆ نموونە:

١- ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ... ﴿١٣﴾ الجاثية ﴾.

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکانو لەزەویدایە، تێکڕێی لەلایەن خۆیەوە بۆتان مەیسەر کردوە.

٢- ﴿ ...وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ ... ﴿١١٩﴾ الأنعام ﴾.

واتە: بێگومان -خوا- هەرچی لێتانی قەدەغەکردوە، بە ڕوونیی بۆی باسکردوون....

٣- (ما أحلّ الله في كتابه فهو حلال وما حرَّم فهو حرامٌ وما سكت عنه فهو عَفْو، فاقبلوا من الله عافيته فأن الله لم يكن لينسى شيئاً..) رواه الحاكم عن أبي الدرداء وصحَّحه ووافقه الذهبي ورواه البزاز والطبراني وإسناده حسن ورجاله موثوقون كما قال الهَيثمي.

واتە: ئەوەی خوا لە کتێبی خۆیدا حەڵاڵی کردبێ حەڵاڵە، ئەوەی قەدەغەی کردبێ قەدەغەیە، ئەوەی لێی بێدەنگ بووبێ ئەوە ڕەوایە، دەجا ڕەوایی خوا وەربگرن، چونکە خوا ناگونجێ هیچ شتێکی لەبیر بچێ...

## ٣- هەرچی پاك و چاك (طیبات)ە هەمووی حەڵاڵە:

ئەمیش، کە ڕاستەوخۆ لە چەندان ئایەتی قورئان وەرگیراوە، یەکی دیکەیە لە بنچینە گەورەو گرنگەکانی شەریعەتو هەموو ئەو شتانەی، کە دەکەونە جوغزی (طیِّبات)ەوە حەڵاڵو ڕەوانو، هیچ کەس بەهیچ بیانوو و پاساوێکەوە بۆی نیە لە خەڵکییان قەدەغە بکات.

وشەی (طیِّب)یش یانی: چێژ لێوەرگیراو (مُسْتَلَذّ)، هەرچەندە بە مانای پاك (طاهر)یشدا، (الشوكاني) لەو بارەوە گوتوویەتی[1]:

((وقد صرَّح ابن عبدالسلام في (دلائل الأحكام) أن المراد بالطيِّبات في الآية (المستلذّات))). واتە: (ابن عبدالسلام) لە کتێبی (دلائل الأحكام)دا ڕایگەیاندوە، کە مەبەست لە (طیِّبات) لە ئایەتەکەدا، شتە چێژ لێوەرگیراوەکانن.

ئنجا (الجرجاني)یش ئاوا پێناسەی وشەی (لَذَّة)ی کردوە[2]:

(إدراك الملائم من حيث أنه ملائم، كطعم الحلاوة عند حاسة الذوق والنور عند البصر).

---

١) (نيل الأوطار)، ج ٨، ص٣٢.

٢) بڕوانە: (التعريفات) ص٢٤٥ .

واتە: بریتیە لە گونجانی شتێك لەخودی خۆیدا لەگەڵ سروشتدا، وەك تامی شیرینایەتی بۆ هەستەوەری چێژتن‌و ڕۆشنایی بۆ هەستەوەری دیتن.

كەواتە: هەموو ئەو شتانەی، كە مرۆڤ چێژو كەڵكیان لێوەردەگرێ، حەڵاڵ‌و ڕەوان لە: بیستراوەكان‌و بینراوەكان‌و تامكراوەكان‌و بۆنكراوەكان‌و پۆشراوەكان‌و....هتد (المسموعات والمنظورات والمذوقات والمشمومات والملبوسات...).

ئنجا ،ئەگەر كەسێكیش باسی شەڕاب‌و قومارو زیناو گۆشتی بەرازو....هتد بكات، پێی دەگوترێ:

یەكەم: هەركام لەو شتانە بەدەقێكی شەرعیی ڕوون‌و بێ چەندو چوون، حوكمەكەیان دیاریكراوە، كە قەدەغەن.

دووەم: لەڕاستیدا هیچ كام لەوانە ناچنە خانەی (طیِّبات)ەوە، چونكە پیس‌و زیانبەخشن، بەڵكو هەموویان لەخانەی (خبائث) دان‌و، حوكمی حەڕامكردن (تحریم) دەیانگرێتەوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿...وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ...﴿١٥٧﴾ الأعراف﴾.

ئەمەش چەند ئایەتێكی خوای پەروەردگار، وەك بەڵگەی ڕاست‌و دروستیی ئەم بنچینە شەرعییە:

١- ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡۖ قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ...﴿٤﴾ المائدة﴾.

واتە: لێت دەپرسن: چی‌یان بۆ حەڵاڵكراوە؟ بڵێ: شتە چاك‌و پاك‌و خۆشەكانتان بۆ حەڵاڵ كراوە....

٢- ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ ...؟! (٣٢) الأعراف﴾.

واتە: بڵێ: کێ ئەو جوانیی‌یەی خوا بۆ بەندەکانی ڕەخساندوویەتیو، بژێوە خۆشو چاکەکانی قەدەغە کردوە؟!.

٣- ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ (٨٧) المائدة﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەوشتە خۆشو چاکانەی خوا بۆی حەڵاڵ کردوون، قەدەغەیان مەکەن، سنوور شکێنی مەکەن، بێگومان خوا سنوور بەزێنانی خۆشناوێ.

٤- ﴿ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ ...(١٥٧) الأعراف﴾.

واتە: ئەوانەی شوێن ئەو ڕەوانە کراوە پێغەمبەرە نەخوێندەوارەکەوتوون، کە لەتەوراتو ئینجیلی لێی خۆیاندا - نیشانەکانی- بەنووسراویی دەبینن، فەرمانیان بەهەرچی چاکەیە پێدەکاتو هەموو خراپەیەکیان لێ قەدەغە دەکات، هەرچی خۆشو چاکە، بۆیان حەڵاڵ دەکاتو، هەرچی پیسو زیانبەخشە، لێیان قەدەغە دەکات...

## ٤- بناغە لە هەڵس و کەوتەکاندا بەدوای حیکمەت و هۆکاردا گەڕانە، ،بەڵام بناغە لە خوا پەرستییەکاندا پابەندیی و گەردن،کەچییە:

ئەمیش یەکی دیکەیە لەو بنچینە شەرعییانەی،کە ڕەچاوکردنیان زۆر پێویستە بۆ بەهەڵەدا نەچوون لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا.

شایانی باسیشە، کە (الشاطبي) لە (الموافقات)ە[1]کەیدا ئەم بنچینەیەی لەژێر ناونیشانی: (الأصل في العبادات التّعبد، والأصل في المعاملات والعادات الإلتفات الى المعاني والمقاصد)دا هێناوەو بەڵگەی زۆریشی لەسەر هێناوەو کورتەی قسەکانیشی ئەوەیە،کە: ،ئەگەر سەرنجی تێکڕێی دەقەکانی شەریعەت بدەین، دەگەینە ئەو ئەنجامە، کە بناغە لە خواپەرستییەکاندا ملکەچکردن بۆ خواو بەگەورە گرتنیو ڕووتێکردنیو خۆ بۆ یەکلاکردنەوەیەتی، بناغە لە هەڵسوکەوتەکاندا هێنانەدی بەرژەوەندییەکان (تحقيق المصالح)ە، کە لە دوورخستنەوەی زیانەکانو هێنانەدی قازانجەکان (دفع المضار وجلب المنافع)دا بەرجەستە دەبێ.

بەڵام پێویستە بزانرێ، کە نابێ هیچ کەس ئەوە لەم بنچینەیە بفامێتەوە، کە خواپەرستیی‌یەکان لە حیکمەتو بەرهەمی زانراو خاڵیین! بەڵکو یاساکانی شەریعەت هەموویان پڕن لەحیکمەتو سوودو بەرهەمی دنیاییو دواڕۆژیی،بەڵام ئەوەندە هەیە خوا پەرستییەکان، مەگەر بەگشتیی، ،ئەگەرنا، مەرج نیە حیکمەتو هۆکاری وردەکارییەکانیان بزانرێ، بۆ نموونە: ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژەکانو، کاتەکانیانو، خوا پەرستییەکان (مناسك)ی حەجو عومرە، بەدیل

---

١) بڕوانە: ج٢ ص٣٠٠ تا ٣٠٧.

بوونی تەیەمموم بە گڵ بۆ دەستنوێژو خۆشۆردن‌و، گێڕانەوەی ڕۆژوو لەلایەن ئافرەتی زەیستان‌و حەیزدارەوەو نەگێڕانەوەی نوێژو....هتد.

دیارە بەزانینی ئەو ڕاستییەش، کە بناغە لە هەڵس‌وکەوتەکاندا بەدوای حیکمەتدا گەڕانە، لەحیکمەتی زۆر یاساو بڕیاری بواری سیاسەتی شەرعیی تێدەگەین، بۆ نموونە: ڕێگریی پێغەمبەر ﷺ لە بڕینی دەستی دز لەکاتی جەنگدا، وەك (أبو داود) گێڕاویەتەوە، چونکە زۆر نزیکە پاڵبداتە لێی دوژمن.

ڕاگرتنی عومەری کوڕی خەتتاب -خوا لێی ڕازی بێ- بۆ پشکی دڵڕاگیراوان (سهم مؤلَّفة القلوب) و پاساو هێنانەوەی بە ڕستەی (إنّ الله أعزَّ الاسلامَ وأغنى عنكم)[١]، واتە: خوا ئیسلامیی بەهێزو زاڵ کردوەو لەئێوەی بێ‌نیاز کردووین.

کەواتە: پاساوی پێدانیان نەماوە و، ڕاگرتنی عومەر -خوا لێی ڕازی بێ- بۆ سزای دەستبڕینی دز لە ساڵی برسیەتی (عام المجاعة)دا..[٢]، چونکە مادام نەتوانی خەڵك تێر بکەی، نابێ لەسەرئەوەی، کە لەبرسان کردوویانە سزاشیان بدەی!

بەڵێ، مادام ئامانجی شەریعەت هێنانەدی بەرژەوەندییەکانی خەڵکی بێت‌و، بناغەش لەیاساکانی بواری هەڵس‌وکەوتەکاندا بەدوای حیکمەتدا گەڕان بێ، کەواتە هەرکاتێك بەهۆی جێبەجێکردنی یاسییەکی شەرعیی بواری هەڵس‌وکەوتەکانەوە، لەجیاتی خێرو بەرژەوەندیی، خراپەو زیان بەرۆکی خەڵکی دەگرت، پێویستە جێبەجێکردنی ئەو یاسا شەرعییە لەوکات‌و شوێن‌و هەل‌و مەرجەدا، چاوی پێدا بگێڕدرێتەوە.

١) بڕوانە: (السياسة الشرعية في ضوء نصوص الشريعة ومقاصدها)، د. يوسف القرضاوي، ص١٧٦.
٢) سەرچاوەی پێشوو، ص٢٠٢-٢٠٧.

## ٥- بەحەرام دانان (التحريم) پەکی لەسەر دەقێکی شەرعیی ڕاست و ڕاشکاو کەوتوە:

بەڵێ، بەبێ هەبوونی دەقێکی شەرعیی ڕاستو ڕوون لە قورئانو سوونەتدا، دروست نیە حوکمی قەدەغەیی بەسەر شتێکدا بدرێ، ئەمەش چەند ئایەتو فەرموودەیەك لەوبارەوە:

١- ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ النحل ﴾.

واتە: هەر لەخۆتانەوە بەقسەی درۆی زمانتان مەڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە، سەرەنجام درۆ بەناوی خواوە هەڵبەستن! چونکە بەڕاستی ئەوانەی درۆ بەناوی خواوە هەڵدەبەستن، سەرفراز نابن.

٢- ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ ۖ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ يونس ﴾.

واتە: بڵێ: ئەو بژێوە دەبینن، کە خوا بۆی ناردوونە خوارێ، کە چی ئێوە هەر لەخۆوە حەرامو حەڵاڵتان تێدا داناوە! بڵێ: جائایا خوا مۆڵەتی ئەوەی پێداون، یاخود درۆ بەناوی خواوە هەڵدەبەستن؟!

٣- ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ ...؟! ﴿٣٢﴾ الأعراف ﴾.

واتە: بڵێ: کێ ئەو جوانییەی خوا بۆ بەندەکانی ڕەخساندوویەتیو، بژێوە خۆشو چاکەکانی قەدەغە کردوە؟!

٤- (ان الله فرض فرائض فلا تُضَيِّعوها، وحَدَّ حدوداً فلا تعتدوها، وحرَّم أشياء فلا تنتهكوها، وسكت عن أشياء رحمة بكم غير نسيانٍ فلا تبحثوا عنها) أخرجه الدارقطني والطبراني في الكبير والخطيب في (الفقيه والمتفقه) والبيهقي في السنن وأبو نعيم في الحلية عن أبي ثعلبة الخشني وحسنه النووي في (الأربعين).

واتە: بێگومان خوا چەند شتێکی پێویست کردون، دەجا ئێوەش مەیانچوێنن، چەند سنوورێکیشی کێشاون، مەیانبەزێنن،چەند شتێکی قەدەغەکردوون، مەیان شکێنن، لە هەندێك شتیش لەڕووی بەزەیی پێدا هاتنەوەتانەوە، نەك لەڕووی لەبیر چوونەوە بێدەنگ بووە، ئێوەش هەڵیان مەکۆڵن!

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە، کە قەدەغەکراوەکان،کەمو سنووردارن، خوای کاربەجێ ئەوانی دیاریی‌و سەرژمێر کردوە، ،تاکو غەیری ئەوانەی دیاری کراون‌و باسکراون، هەموو شتەکانی دیکە بەڕەوایی بمێننەوە، وەك خوا (عزّ وجل) فەرموویەتی:

﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾ الأنعام﴾.

واتە: ئەوە بۆچی‌و چی ڕێی لێگرتوون لەوە بخۆن، کە ناوی خوای لەسەر هێنراوە، خۆ - خوا- هەرچی لێتانی قەدەغە کردوە بۆی ڕوون کردوونەوە؟! بێگومان زۆریشن ئەوانەی بەئارەزووی خۆیان‌و بەبێ زانیاریی، خەڵکی گومڕا دەکەن، ،بەڵام مسۆگەر پەروەردگارت خۆی زاناترە بە سنوورشکێنان!

کەواتە:

بێ،جگە لەو شتانەی کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ بەڕوون‌و ڕاشکاویی قەدەغەیان کردوون، هەموو شتێك بەحەڵاڵ‌و ڕەوا دادەنرێ‌و، هیچکەس

بۆی نیە هەر لەخۆوەو، بەبێ بەڵگەی شەرعیی شتێك لە خەڵكی بەناوی خواو ئایینەکەیەوە قەدەغە بکات ، بەڵکو ئەوە عادەتو پیشەی کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بووە،کە خوای کاربەجێ لەسەر ئەو ڕەفتارەیان، سەرکۆنەو سەرزەنشتی زۆر توندی کردوون، وەك لەئایەتەکاندا دەبینرێ.

## ٦- ئەو شتانەی،کە خەڵکی لەکاتی دابەزینی شەریعەتدا بەگشتیی گیرۆدەیان بوون، ناگونجێ حوکمەکەیان ڕوون و ئاشکرا نەبێ (**ما تعم به البَلْوى في عهد التنزيل لا يصح تصوُر خفاء حكم الشرع فيه**):

مەبەست لەم بنچینە شەرعییەش ئەوەیە، کە هەر شتێك، یان هەڵسوکەوتێك لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ کە شەریعەتدانراوە، لەنێو خەڵکیدا بەگشتیی هەبووبێ، بۆ نموونە: گۆرانیی گوتنو دەفو تەپڵو شمشاڵ لێدانو شاییکردنو یاری کردنو قسەی خۆش گێڕانەوە، ئەوە هیچ ماقووڵ نیە پێویستییان بە حوکمو بڕیارێکی تایبەت بووبێ - وەك قەدەغە کردن- کەچی شەریعەت بڕیاری لەبارەوە بۆ نەدابن.

کەواتە: هەرکام لەو جۆرە شتانە، شەریعەت بڕیارو حوکمێکی تایبەتی لەبارەیەوە نەبوو، مانای وایە لەسەر حاڵەتی ئەسڵیی خۆی، کە ڕەوا (مُباح) بوونە، ماوەتەوە، چونکە وەك پێشتر گوتمان ڕەوایی (إباحة) حوکمی ئەسڵیی شتانە، هەتا دەقێکی شەرعیی لەوحاڵەتە ئەسڵییەوە دەیانگوازێتەوە، بۆ یەکێك لە چوار حوکمەکانی دیکە،د

کە بریتین لە:

پێویست بوون، پەسند بوون، قەدەغە بوون، ناپەسند بوون (الوجوب، النّدب، الحُرمة، الكراهة).

شایانی باسیشە، کە شەرعزانان ئەم بنچینە شەرعییەیان کردۆتە بەڵگەی ئیسپاتی، یان زاڵکردن (ترجیح)ی چەند مەسەلەیەکی شەرعیی، بۆ نموونە[1]:

١- چاوپۆشی کردن لە پیسییەکی،کەم.

٢- زەکات پێویست نەبوون لە وڵاخە بەرزە (خَیْل)دا.

٣- دانەنانی گوتنی: ئەوە پێم دێی‌و ئەوە وەرتگرت (الإيجاب والقبول)، وەك پێی‌ەیەکی دروستبوونی کڕین‌و فرۆشتن.

٤- پاکیی تۆو ئاشقاو (المنيّ والمذيّ).

٥- دەستنوێژ نەشکان بەدەست وێکەوتنی ئافرەت.

٦- ڕۆژوو نەشکان بە قووتدانی بەڵغەم.

٧- ڕەوایی مەسح لەسەر خوففی دڕاو.

بەڵکو حەنەفییەکان یەکێك لە بنچینە شەرعییەکانیان ئەمەیە:

(رَدُّ خبر الواحد وانْ صحَّ ظاهِراً اذا روى في مسألةٍ تَعُمُّ فيها البَلْوى حُكْماً لا يَرويه غيره، لأن عموم البَلْوى مُوجِبٌ لشيوع العلم بحكم الشرع لِمَسِيسِ الحاجة).

واتە: ڕەتکردنەوەی هەواڵی تاك، ،ئەگەر بەڕواڵەتیش ڕاستبێ، مادام لەبارەی مەسەلەیەکەوە، کە خەڵکی بەگشتیی گیرۆدەینی حوکمێك بگێڕێتەوە، کە ،جگە لەوی،کەسی دیکە نەیگێڕابێتەوە، لەسۆنگەی ئەوەوە، کە گیرۆدەبوونی گشتیی مایەی زانیاری هەبوونە بەحوکمی شەرعیی بەهۆی پێویستی پێبوونەوە.

---

١) بڕوانە: (الموسيقى والغناء في ميزان الاسلام)، عبدالله بن يوسف الجُدَيع، ص ٣٨-٣٩.

## ٧- ڕێی گـوناهـگرتن (سَدّ الذریعة) نابێ بکرێتە پاساوی شتی ڕەوا لە خـەڵك قەدەغـەکردن و هەرشـتێك لە ڕۆژگاری دابەزینی شەریعەتدا ڕەوا بـووبـێ، هـەر ڕەوایـە:

مەبەست لەم بنچینە شەرعییەش ئەوەیە، کە هیچ کەس بۆی نیـە بـەبیانووی ڕێی خراپەو گوناه لەخەڵك گرتنەوەو دڵسۆزییو پەرۆش نواندنەوە بۆیان، شتێکیان لـێ قەدەغە بکات، کە لە ڕۆژگـاری پێغەمبـەری خـوادا ﷺ بـاوو ڕەوا بـووە، چونکە ڕەفتاری ناشەرعیی بەهۆی نیەتی چاکەوە، نابێتە شەرعییو هەر هەڵەیەو، بێگومان قەدەغەکردنی شتی حەڵاڵو ڕەواش پێچەوانەی دەقی ئایەتی خوایە، کە فەرموویـــــــەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ المائدة ﴾.

هیچ گومانیشی تێدانیە، کە هەرکاتێك ڕێی شەرعییو ڕەوا لە خەڵکی گـیرا، بۆ تێرکردنی غەریزەو ئارەزووەکانیان، مەگەر بەدەگمەن، ئەگەرنا ڕێی ناشەرعیی دەگرنەبەرو، واقیعی ئێستای مسوڵمانانیش بەگشتیی، چاکترین بەڵگـەو شـایەدە لەوبارەوە، بەتایبەت لەبواری هەڵسوکەوت لەگەڵ ئافرەتدا، کەبەداخـەوە لەسـەر بناغەی بنچینەی (سدّ الذرائع) لەنێو زۆربەی کۆمەڵگاکانی مسوڵماناندا، ئافرەتان لە زۆربەی مافە شەرعییەکانیان بێبەش کراون، وەك: فێربوونی زانست، کارکردن، چالاکییە کۆمەڵایـەتیو سـاسییەکان.... تەنانـەت لـە هەنـدێك شـوێنان، کـار بەجێیەك گەیشتوە،کە ئافرەتان ڕێی سەییارە لێخـوڕینو، بگـرە بەشـدارییکردنی هەڵبژاردنەکان (إنتخابات)یشیان، تەنانەت وەك دەنگدەر (ناخب)یش پـێ نـادەن! بەڵکو هەندێك لە شەرعزانانی لە دینو ژیـن بێئاگـا، دەنگـی ئافرەتیشـیان بـە عەورەتداناوەو ڕێی قسەکردنیشیان لێگرتوون!!

ئێستاش با بۆ زیاتر دەرخستنی هەڵەیی ئەم جۆرە بیرکردنەوە، دوو نموونە لـە هەڵوێستی هاوەڵانی پێغەمبەری -خوا لێیان ڕازی بێ- بێنینەوە:

یەکەم: (عن سالم بن عبدالله بن عمر انَّ عبدالله بن عمر قال: سَمِعتُ رسول الله ﷺ يقول:"لاتمنعوا نِساءَكم المساجدَ اذا استأذنَّكم اليها" قال: فقال بلال بن عبدالله: والله لَنَمْنَعُهُنَّ، قال: فأقبل عليه عبدالله فَسَبَّهُ سبّاً سَيِّئاً، ماسَمِعْتُهُ سَبَّه مِثْلَهُ قطّ، وقال: أُخْبِرُك عن رسول الله ﷺ وتقول: والله لَنَمْنَعُهُنَّ) رواه مسلم (وفي رواية أخرى من طريق مجاهد عن ابن عمر: قال بلال بن عبدالله: لانَدَعُهُنَّ يَخْرُجْنَ فَيَتَّخِذْنَهُ دَغَلاً).

واتە: سالمی کوڕی عەبدوللای کوڕی عومەر گێڕاویەتەوە، کە عەبدوللای کوڕی عومەر گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: "هەرکات ژنەکانتانداوێی مۆڵەتیان لێتان کرد بۆ چوونە مزگەوتان، ڕێیان لێمەگرن" دەڵێ: بیلالی کوڕی عەبدوڵڵاش گوتی: بەخوا ڕێیان لێدەگرین! دەڵێ عەبدوڵڵاش ڕووی تێکردو جنێوێکی خراپی پێدا، کە هەرگیز نەمبیستبوو جنێوی وێی پێ بڵێ، گوتی: من لەپێغەمبەری خواوە ﷺ هەواڵت پێ دەدەمو تۆش دەڵێی: بەخوا ڕێگرییان لێ دەکەین!

لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە، کە بیلالی کوڕی عەبدوڵڵا گوتویەتی: ڕێیان نادەین بچنە دەرێ (بۆ مزگەوت)و بیکەنە پاساوی خراپەکاریی.

دووەم: (عن عائيشة أنَّها قالت: لو رَئَى رسولُ الله ﷺ ما أَحْدَثَ النِّساءُ بَعْدَهُ لَمَنَعُهَنَّ المساجدَ كما مُنِعَتْ نساءُ بني إسرائيل) رواه مالك والبخاري ومسلم وأبو داود.

واتە: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- گوتوویەتی: «ئەگەر پێغەمبەری ﷺ ئەوەی دیبایە، کە ئافرەتان دوای وی پەیدایان کردوە (لە هەڵس‌وکەوتی خراپ) ئەوە وەك چۆن ئافرەتانی بەنی ئیسرائیل لە مزگەوتان قەدەغەکران، ئەویش ئافرەتانی لە چوونە مزگەوتان قەدەغە دەکرد.

جا هەرچەندە ئەمە ڕاو بۆچوونی دایکی بڕواداران (عائیشە) بووە، «بەڵام هیچ کام لە هاوەڵان -خوا لێیان ڕازی بێ- ڕەفتاریان پێ نەکردوە، ئافرەتانیان لە

مزگەوت قەدەغـە نەکـردوە، بەبیانوو و پاسـاوی دوور خسـتنەوەیان لـە هەڵـەو گوناهو خراپە!

کەواتە:دروستو ڕەوا نیە، کە بەهیچ پاساوێك شتی حەڵاڵو ڕەوا لە خەڵکی قەدەغە بکرێو، هەرشتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕەوێی دانابێ، پێویستە وەك خۆی بهێڵرێتەوەو بەبیانووی (سدّ الذريعة) لە خەڵکی قەدەغە نەکرێ،بەلاّم هەوڵبدرێ چوارچێوەو چۆنیەتییەکی شەرعیی بۆ دابنرێ.

## ٨- فەرمـودەی بێـهێز (الحديث الضعيف) حوکـمی شـەرعیی لەسـەر بنیـات نانرێ:

ئەمیش یەکی دیکەیە لەو بنچینە شەرعییانەی، کە زاناو پێشەوایانی ئیسلام لەسەریان ڕێککەوتوونو، ڕەچاوکردنیشی زۆر سەر ئێشەی لابەلا لەکۆڵ مسوڵمانان دەکاتەوە،کە بـەهۆی بـەناو فـەرموودەی هەڵبەسـتراو (موضـوع)و فـەرموودەی بێهێزەوە بۆیان دروست بوون.

(ابن تيمية) لەبارەی ئەم بنچینەیەوە گوتوویەتی[1]:

(لَمْ يَقُلْ أحدٌ من الأئمة أنّه يجوز أن يُجْعَلَ الشيءُ واجِباً أو مُستحبّاً بحديث ضعيف ومن قال هذا فقد خالف الأجماع).

واتـە: هـیچ کـام لـە پێشـەوایان نەیانگوتوە،کـە دروسـتە لەسـەر بناغـەی فەرموودەیەکی بێهێز شتێك بەپێویست، یان پەسند دابنرێ، هەرکەسێك ئەوە بڵێ، پێچەوانەی کۆڕا (إجماع)ی کردوە.

ئنجا دیارە کە شتی ڕەوا (مباح) بەقەدەغە (حرام)، یـان ناپەسـند (مکـروە) دانان لەسەر بناغەی فەرموودەی بێهێز، لەوە خراپتریشە.

١) بڕوانە: (قاعدة جليلة في التوسّل والوسيلة)، ص.١٦٢

پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە،کە نابێ ،جگە لەشتی ڕاستو هەق بەناوی ویەوە بگوترێ، فەرموویەتی: (يا أيّها الناس! إياكم وكثرة الحديث عَنّي، من قال عليَّ فلا يقولَنَّ الاّ حقاً أو صِدْقاً، فمن قال عليَّ ما لم أقُلْ فَلْيَتَبَوَّأ مقعده من النّار) رواه أحمد وابن ماجه وغيرهما عن أبي قتادة وهو صحيح.

واتە: ئەی خەڵکینە! خۆتان دوور بگرن لە زۆر قسەکردن بەناوی منەوە، هەرکەسێکیش قسەی بەناوی منەوە کرد، با ،جگە لە هەقو ڕاستی چیدی نەڵێ، چونکە هەرکەسێك قسەیەك بەناوی منەوە بکات، کە نەمگوتبێ، با شوێنی خۆی لە ئاگر - ی دۆزەخ -دا ساز بکات.

ئنجا بێگومان هەرکەسێکیش لەسەر بناغەی قسەیەکی پاڵدراو (مَنْسوب) بۆلێی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێك بە قەدەغە دابنێ، خۆی دووچاری دوو گوناهی زل کردوە، کە بریتین لە:

یەك: درۆ هەڵبەستن بەناوی پێغەمبەرەوە ﷺ.

دوو: قەدەغەکردنی شتێك، کە خواو پێغەمبەرەکەی قەدەغەیان نەکردوە، کەدیارە ئەمەش پیشەی کافرانە، وەك خوا (عزّ وجل) لەبارەیانەوە فەرموویەتی:

﴿...وَحَرَّمُوا مَا رَزَقَهُمُ اللَّهُ افْتِرَاءً عَلَى اللَّهِ...﴾ الأنعام ١٤٠.

## ٩- ئەو دەقانەی هەواڵدان بە شتێکی ئایندەیان تێدایە، خۆیان بەتەنیا نابنە بەڵگەی حوکمێکی شەرعیی (لا تدلّ النصوص المُخْبِرَة عن أمْرٍ مُسْتَقْبَليٍّ بمُفْرَدِها على حكمٍ شرعي):

ئەمیش بنچینەیەکی دیکەی شەرعیی گرنگەو، لێ بێئاگابوونی دەبێتە مایەی بەهەڵەداچوون لە تێگەیشتنی ئەو دەقە شەرعییانەدا، کە باسی ڕووداوو کارەساتەکانی ئایندە دەکەن.

ئنجا بۆیەش ئەو جۆرە دەقانە، ناگونجێ سەربەخۆو بەتەنیا بکرێنە بەڵگەی حوکمێکی شەرعیی، چونکە:

١- دەگونجێ ئەو دەقە هەواڵدان بێ بەگۆڕانکارییەك، کە لەو ڕۆژگارەدا دێتەدی.

٢- دەگونجێ هەواڵدان بێ بە پەیدابوونی نیشانەیەك،کە بەڵگەی ڕاستیی پێغەمبەری خوایە ﷺ لەو ڕۆژگارەدا.

٣- دەگونجێ هەواڵدان بێ بە پەیدابوونی دڵخۆشکەر (بشارة)ێك، وەك زیاتر بڵاوبوونەوەی ئیسلام.

٤- دەگونجێ ئەو هەواڵدانە، کە ترساندنو ورياکردنەوەیەك بێ، وەك: نەمانی زانیاریی نەقڵییو، زۆربوونی نەفامییو تەشەنەکردنی کوشتو کوشتار....

بۆ نموونە:

هەواڵدانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەوە،کە لە کۆتایی تەمەنی دنیادا، کوشتارو زینا زۆر دەبێ، هەرچەندە لێی دەفامرێتەوە،کە کوشتارو زینا خراپن، ،بەڵام ئێمە تەنیا بەهۆی ئەو دەقەوە،کە ئەو هەواڵەی تێدایە حوکمی کوشتارو زینا نازانین، بەڵکو بەهۆی دەقەکانی دیکەوە،کە بە صیغەی تایبەت بە ڕاگەیاندنی حوکمە شەرعییەکانەوە هاتوون، ئەو حوکمەمان بۆ دەردەکەوێ.

ئێستاش با بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست، دوو وێنە بێنینەوە:

یـەك: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (والذي نفسـي بيـده ليوشـكنَّ أن ينْـزِلَ فيكم ابن مريم حَكَماً مُقْسِطاً فَيَكْسِـرُ الصَّـليب ويقتـل الخنزيـر ويضَـعُ الجزيـة ويفيض المالُ حتى لا يقبله أَحَدٌ) متفق عليه عن إبي هريرة.

واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی بەدەستە، نێزیکە کوڕی مەریەم لەنێوانتاندا بێتە خوارێ حوکمڕانێکی دادگەر دەبێ، خـاچ دەشـکێنێو بـەراز دەکـوژێو سەرانە لادەبات، ماڵو سامان هێندە زۆر دەبێ،کە،کەس نابێ وەری بگرێ.

جا دیارە ،ئەگەر ئەو بنچینەیەی گوتمان ڕەچاوی نەکەین، دەبێ بەحوکمی ئەم فەرموودەیە بڵێیـن:

مادام عیسا -علیه السلام- لەکاتی هاتنە خوارەوەیدا لە ئاسمان ئەو کارانە دەکات، دیارە ئەویش حوکمڕانێکی دادگەرەو شتی ڕەوا نەبێ نایکات، کەواتە: پێویستە ئێمەش دەست بکەین بەو کارانەی وی!

بەڵام لەڕاستیدا وانیە، ئەوەی فەرموودەکە دەیگەیەنێ، هـەر ئەوەیـە، کـە عیسا - علیه السلام- لەکاتی هاتنەخوارەوەیدا ئـەو کارانـە دەکـاتو لـەو ڕۆژگارەشدا بۆی ڕەوان، ،بەڵام ئەوە ناگەیـەنێ، کـە بـۆ ئێمـەش لـەڕۆژگاری خۆماندا دروستو ڕەوابن، هیـچ زانایەکیش واینەگوتوە، ئەویش بەهۆی ئـەو بنچینە شەرعییەوە،کە گوتـمان.

دوو: (عـن عَديّ بن حاتم قال: بَيْنا أنا عنـد النبّي ﷺ إذْ أتـاهُ رجـلُ فَشَـكا اليـه الفاقة، ثم أتاهُ آخر فَشكا اليه قَطْعَ السَّبيل، فقال: يا عَديّ! هل رأيت الحـيرة؟ قلت: لَمْ أَرَها وقد أُنبئْتُ عنها، قال: "فـإن طالـت بـك حيـاة لَتَـرَيَنَّ الظعينـة تَرْتَحِلُ من الحِيرَةِ حتَّى تطوف بالكعبة، لا تخاف أحداً الاّ الله"، قلت فيما بيني وبين نفسـي: فأين دُعّـارُ طَيِّءِ الذين قد سعَّروا البلاد!... قـال عَـديّ: فرأيت الظّعينة ترتحلُ من الحيرة حتى تطوف بالكعبة، لا تخافُ الاّ الله) رواه البخاري.

واتە:

عەدی کوڕی حاتەمی طائی دەڵێ: لەکاتێکدا،کە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووم، پیاوێکی هاتەلاو سکاڵێی نەداریی لەلاکرد، دوایی، یەکی دیکە هاتە لێی‌و سکاڵێی ڕێگریی لەلا کرد، فەرمووی: ئەی عەدی! ئایا (حیرە)ت دیوە؟ گوتم: نەمدیوە ،بەڵام لەبارەیەوە هەواڵم پێدراوە، فەرمووی: "،ئەگەر تەمەنت درێژە بکێشێ، ئافرەتی ڕێبوار دەبینی، کە لە حیرەوە دێ ،هەتا طەوافی،کەعبە دەکات، ،جگە لە خوا لە هیچ کەس شتێکی دیکە ناترسێ"، منیش لەدڵی خۆمدا گوتم: ئەدی جەردەو ڕێگرەکانی طەیىء لەکوێن، کە وڵاتیان ئاگرداوە!... عەدی دەڵێ: کەچی دوایی ئافرەتم بینی، لەحیرەوە سوار دەبوو، هەتا دەهاتە مەککەو طەوافی،کەعبەی دەکرد ،جگە لە خوا، لەهیچ کەس ترسی نەبوو.

دیارە هەندێك لە زانایان ئەم فەرمایشتەیان کردۆتە بەڵگەی ئەوە،کە ئافرەت ،ئەگەر ڕێ هێمن (أمین) بوو، دروستە بەتەنیاش سەفەری دوور بکات، ،بەڵام لەبەر ئەوەنا، کە فەرموودەکە باسی سەفەری ئافرەتی تەنیا دەکات، بەڵکو لەبەر ئەوە،کە بەگوێرەی تێگەیشتنی ئامانجەکانی شەریعەت (فقە مقاصد الشریعة) هۆکار (عِلَّة)ی قەدەغەبوونی سەفەری دوور بۆ ئافرەتی تەنیا، هەبوونی ئازارو ناڕەحەتییە لەو ڕێیەداو، هەرکات ئەو مەترسییە نەما، حوکمەکە دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی ئاسایی خۆی،کە ڕەوایی (إباحة)یە!

کەواتە: فەرمایشتەکە حوکمێکی لێ وەرنەگیرا، کە تەنیا لەودا باسکرابێ.

## ١٠- بیروبۆچوونی هاوەڵان -خوا لێیان ڕازی بێ- بەگشتیی لەهی خەڵکی دیکە لەپێشترە، بەڵام هیچ بیروڕایەك لەبەر پایەو شکۆی خاوەنەکەی نابێتە بەڵگەی شەرعیی:

مەبەستیش لەم بنچینەیە ئەوەیە،کە مادام خوای کاربەجێ ڕایگەیاندوە،کە لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازییە، وەك فەرموویەتی:

﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ...﴿١٠٠﴾ التوبة﴾.

کەواتە: بەگشتیی تێگەیشتنو پابەندیی ئەوان، لەهی ئەوانەی دوای خۆیان چاکترە، ،بەڵام لەو مەسەلانەدا، کە تێیاندا،کەوتوونە ڕا جیاییەوە، یاخود لەهەندێکیانەوە شتێك گێڕاروەتەوەو، ڕایەکی پێچەوانەو دژیشی هەر لێوە نەقڵ کراوە، ئەوە هەرچەندە واپەسندە ، ئەگەر بکرێ و بگونجێ لە بازنەو جوغزی قسەی وان دەرنەچین، بەڵام بێگومان پێویست نیە، چونکە،جگە لە قورئانو سوننەت، هیچ شتێکی دیکە بۆ مسوڵمانان بەئاییندانانرێو، پابەندکەر (مُلْزِمْ)یش نیە بۆیانو لەسەریان پێویست نیە لێی لانەدەن.

## ١١- قسەو بیروڕای زانایان بە بەڵگە ناهێنرێتەوە، بەڵکو بەڵگەی لەسەر دەهێنرێتەوە (أقوال العلماء وآراؤهم يُستدلُ لها ولايُستدلُ بها):

ئەمیش یەکی دیکەیە لەو بنچینە شەرعییانەی،کە زانایان لەسەریان ڕێك کەوتوونو، مەبەستیش لەم بنچینەیە ئەوەیە،کە هیچکەس بۆی نیە بۆچوونو

ئیجتیهادی هیچ زاناو پێشەوایەك لەبارەی مەسەلەیەكەوە، وەك بەڵگەیەكی شەرعیی تەماشا بكات، چونكە ئایین (كە لێرەدا مەبەست ئیسلامە) لەقورئانو سوننەتدا كورت هەڵاتوەو غەیری ئەوان، قسەو بۆچوونی هەركەسێك بێ، تەنیا بە تێگەیشتن دەربارەی ئایین (فهم عن الدين) دادەنرێ، نەك خودی ئایین و بۆ ئیسپاتی ڕاستبوونیشی پەكی لەسەر ئەوەكەوتوە،كە بەڵگەی بۆ بهێنرێتەوە لە قورئانو سوننەت!

ئنجا بۆ هەڵسوكەوت كردن لەگەڵ بەرهەمو كەلەپووری زاناو پێشەوایاندا، وێڕای ئەو ڕاستییەی گوترا، پێویستە دوو مەسەلەی دیكەش ڕەچاو بكرێن:

یەك: هەر قسەیەك پاڵدرایە لێی هەر زانایەك، دەبێ دڵنیابین، كە بەڕاستی ئەو قسەیەی گوتوەو لێشی پەشیمان نەبۆتەوە، وەك چۆن (شافعي) -خوا لێی خۆش بێ- پاش چوونی بۆ میسر هەندێك لە بۆچوونەكانی خۆی گۆڕی!

دوو: پێویستە دڵنیابین لەبارەی ئەو صیغەو تەعبیرەوە،كە قسەكەی پێ گوتوە، چونكە زۆر جاران بەهاندەری دەمارگیریی (تعصّب) بۆ ڕاو ئیجتیهادێك، قسەی زانایەك گۆڕاوەو دەستكاریی كراوە، وەك لە باسەكانی داهاتوودا ئاماژە بە چەند نموونەیەك دەكەین لەبارەوە.

## ١٢- ئامرازەكان حوكمی ئامانجەكانیان هەیە (للوسائل حكم المقاصد):

مەبەست لەم بنچینەیەش ئەوەیە،كە:

أ- هەر ئامانجێكی پێویست، پەكی لەسەر ئامراز (وسیلة)ێك كەوتو بەبێ وی نەهاتەدی، ئەوە ئەو ئامرازەش،ئەگەر لەخودی خۆیشیدا ڕەوا (مباح)بێ، پێویست دەبێ، چونكە بنچینەیەكی دیكەی شەرعیی دەڵێ: (مالا يَتِّمُ الواجب إلاّ بِهِ فَهُوَ واجِبُ).

واتە: هەرشتێك فەرزێك پێویستی پێی بوو، ئەوە پێویستە.

ب- هەر ئامرازێك بكرێتە هۆكاری پەیداكردنی شتێكی قەدەغە، ئەوە هەرچەندە

لە خودی خۆیشیدا (ڕەوا) بێ، لەو حاڵەتەدا حەرام دەبێ‌و بنچینەیەکی شەرعیش هەیە دەڵێ: (الوسیلة الی المحرّم مُحرَّمةٌ).

واتە: ئامرازێك بکرێتە هۆکاری پەیداکردنی شتی قەدەغە، قەدەغەیە.

خوێنەری بەڕێز!

ئێستاش دوای ئەوەی لەم بەشی دووەمەو لە بەشی پێشووشدا، تا ڕاددەیەك تیشکمان خستە سەر هونەر بەگشتییو، ئەو بنچینە شەرعییانەمان خستنەڕوو، کەبۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هونەرو بابەتە هاوشێوەکانی‌دا پێویستمانن،تاکو لەهەڵەو پەڵەی تێپەڕاندن‌و بەزایەدان (إفرط وتفریط) پارێزراو بین، خوا پشتیوان بێ دەچینە سەر بەشەکانی دیکەی ئەم زنجیرە باسەو، خستنە ڕووی هەڵوێستی شەریعەت لەبارەی چەند بابەتێکی هونەرییەوە،کە،کەم‌و زۆر پەیوەستن بەژیان‌و گوزەرانی تاکیی‌و خێزانیی‌و کۆمەڵایەتیمانەوەو، لەنێو مسوڵمانانیشدا جێگێی باس‌و خواس‌و مشت‌ومڕی گەرم‌و گوڕن‌و، هەڵوێستی بەزایەدەر (مُفرِّط)انەی‌و سەلبیانەی هەندێك لە مسوڵمانانیش، لە بەرانبەر هونەرداو لە کاردانەوەی هونەرو هونەرمەندانی نالەبارو بێ‌بەندوباردا، کەرەسەیەکی پڕوپاگەندەی ناحەزانەی بەپێزی خستۆتە بەردەست ناحەزانی ئیسلام‌و ئیسلامییەکانەوە، بۆ شێواندن ناوبانگ‌و سومعەیان‌و لەبەرچاوی خەڵك و بێزراندنیان‌و بڵاوکردنەوەی چەندان پڕوپاگەندەی ژەهراویی وەك:

* ئیسلام‌و ئیسلامییەکان دژی جوانیی‌و خۆشی‌و شادیین!
* ئیسلامییەکان دژی هونەرو هونەرمەندانن!
* لە سێیەی ئیسلام‌و ئیسلامییەکاندا ڕێ لە گەشت‌وگەڕان‌و سەیران دەگیرێ!
* ئەگەر ئیسلام حوکم بکات، کۆمەڵگا دەبێتە تازیەو ماتەم!

بەڵام پێشینان گوتەنی: "مەیدانی درۆیە کورتە".

ئێستاش تۆو بەشی سێیەم

خوێنەری بەڕێــز!

ئەم بەشی سێیەمە، کە زۆرترین پانتایی ئەم زنجیرە باسە دادەگرێ، لە هەشت باسان پێك دێ، کە بەڕیز پێیاندا دەچینە خوارێ:

## باسی یەکـەم: ڕوونکـردنەوەی چەمك و واتای چەند وشـەیەك:

**لـهْو، لـغْـو، غنـاء، مَعْـازِف، مزامیر، موسیقی.**

دیارە ئەم وشانە هەموویان عەرەبییـنو لە دەقە شەرعییەکاندا بەکارهاتوون، بۆیە پێویستە بۆ زانینی چەمكو واتایـان، بگەڕێینـەوە بـۆ شـارەزایانی زمـانی عەرەبـی:

### ١- لَهُـو :

أ- (راغب الأصفهاني) لەوبارەوە گوتوویەتی:

( اللهو: مايَشْـغلُ الانسان عمّا يَعنيه ويُهِمُّهُ، يُقـال: لَهَوتُ بكـذا ولَهَيْـتُ عـن كـذا: اشـتغلتُ عنـه بِلَهْـوٍ، قـال تعـالى: ﴿ إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ... (٣٦) محمـد ﴾، ﴿ وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ... (٦٤) العنكبوت ﴾، ويُعبَّر عن كل ما به استمتاعٌ باللّهو، قال تعالى: ﴿ لَوْ أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا ... (١٧) الأنبياء ﴾، ومن قال: أراد باللهو: المرأة والولـد، فتخصيصٌ لبعض ماهو من زينة الحياة الدنيا التي جعل لهواً ولعباً، ويقالُ: ألْهاهُ كذا، أي: شَغَلَهُ عمّا هو أهمُّ اليه، قال تعالى: ﴿ أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ (١) التكاثر ﴾[1].

---

١) (مفردات ألفاظ القرآن)، ص ٧٤٨.

واته: ( له‌هوو ) هه‌رشتێكه، كه مرۆڤ سه‌رقاڵو بێئاگا بكات له‌وه‌ی،كه جێی مه‌به‌ستیه‌تیو به‌لایه‌وه گرنگه، ده‌گوترێ: (لهوت بكذا ولهيت عن كذا) واته: به‌هۆی خافلانێكه‌وه پێیه‌وه سه‌رگه‌رم بووم، خوای به‌رز فه‌رموویه‌تی: بێگومان ژیانی دنیا به‌س یارییو سه‌رگه‌رمییه، وه فه‌رموویه‌تی: ئه‌م ژیانه دنیایی یه، جگه له خافلانو یاریی، شتێكی دیكه نیه.

به هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی،كه مایه‌ی ڕابواردنو سه‌رگه‌رمیین ده‌گوترێ: (له‌هوو)، خوای به‌رز فه‌رموویه‌تی: ئه‌گه‌ر ویستبامان له‌هوییێك بۆخۆمان په‌یدا بكه‌ین... وه ئه‌وانه‌ی گوتوویانه: مه‌به‌ستی له ( له‌هوو) ژنو منداڵه، ئه‌وه هه‌ڵساوه به تایبه‌تكردنی چه‌مكو واتای گشتیی جوانیی ژیانی دنیا، كه به (له‌هوو و یاریی) دانراوه، ده‌گوترێ: (ألهاه عن كذا) واته: سه‌رقاڵی كردو له‌شتێك بێئاگایكرد،كه به‌لایه‌وه گرنگتر بوو، خوای به‌رز فه‌رموویه‌تی: خۆ هه‌ڵكێشان به‌زۆریی ماڵو سامان (یان خزمان) ئێوه‌ی بێئاگا كرد.

ب- (إبن فارس)یش گوتوویه‌تی:

(كلُّ شيءٍ شَغَلَكَ عن شيءٍ فقد ألْهاك)[1]، واته: هه‌رشتێك بووبه هۆی بێئاگابوونت له شتێكی دیكه، ئه‌وه بۆت بۆته له‌هوو.

ج- (الجوهري)یش گوتوویه‌تی[2]:

(اللَّهو: اللَّعِبُ)، واته: له‌هوو یارییو گه‌مه‌یه.

د- (الخليل بن أحمد)یش گوتوویه‌تی[3]:

(اللَّهو: ما شَغَلَك من هوىً وطَرَبٍ) واته: له‌هوو هه‌رشتێكه، كه سه‌رگه‌رمت بكات له ئاره‌زوو و گۆرانییو ئاواز.

---

١) (معجم مقاييس اللغة)، ج٥، ص.٢١٣
٢) (القاموس المحيط)، ج٦، ص.٢٤٨٧
٣) (البارع) لأبي علي القالي، ص.١١٣

دیاره لەكۆی ئەم پێناسانەوە دەربارەی (لَهْو) بۆمان دەردەكەوێ، كە بریتیە لە هەرجۆرە خافڵانو سەرگەرمییەك،كە لەشتی گرنگو جیددیی بێئاگات بكاتو دوورت بخاتەوە، جا جاری وایە وشەی (لَهْـو) بۆ خودی خـافڵانو سـەرگەرمییەكە بەكاردێو، جاری واش هەیە بۆ ئەو شتەی،كە دەبێتە مایەی خافڵانەكـە، جـا چ ئامێرێك بێ وەك دەفو تەپڵو شمشاڵ، چ جۆرە یارییو كات بەسەر بردنێك بێت.

ئنجا بەسەرنجدانی ئەم چەند فەرمایشتەش، زیاتر چەمكو واتای (لَهْو)مان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

١- (عن عائيشة رضي الله عنها أنَّها زَفَّتْ امرأةً الى رجلٍ من الأنصار، فقال نبـيٌّ الله ﷺ: يا عائيشة ماكان معكم لـهو؟ فإن الانصار يُعْجِبُهُم اللَّهْـوُ) رواه البخاري والحاكم والبيهقي.

واتە: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- ژنێكی بۆ پیاوێكی ئەنصاریی بـەبووك برد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە ئەوە لەهووتان پێنەبوو؟ خۆ ئەنصارییەكان،كەیفیان بەلەهوو دێ.

مەبەسـتیش لـە (لَهْـو) لێـرەدا، گـۆرانییو دەف لێدانـە، وەك لەسـیاقی فەرموودەكەدا دیارەو، زانایانیش لەسـەری یەكـدەنگنو ئـەو فەرموودەیـەی دواییش بەڵگەیە لەسەری.

٢- (فصل مابين الحلال والحرام، الدُّفُ والصَّوت في النِّكاح) أخرجه أحمد وابن ماجه والطبراني والحاكم وغيرهم وهو حسن.

واتە: لەیەك جیاكەرەوەی حەڵاڵو حەڕام لە نیكاحدا، دەف لێـدانو دەنگـی گۆرانیی یە.

٣- (كل شيء يلهو به ابن آدم فهو باطلٌ الاّ ثلاثـاً، رَمْيـهُ عـن قَوْسِـهِ وتأديبـهُ فَرَسَـهُ وملاعبتهُ أهْلَهُ، فأنهن من الحق) رواه أحمد والترمذي وابن ماجه والدارمي وهو حسن.

واتە: هەرچی ئادەمیزاد پێیەوە دەخافڵێ پووچە، ،جگە لە سێ شتان: تیرهاوێشتنی بە تیرو کەوانەکەیو، مەشق کردنی بەئەسپەکەیو، یاریی‌و گەمەکرنی لەگەڵ هاوسەرەکەی، ئەمانە لە هەقن.

٤- (سَتُفْتَحُ عليكم أرضون ويكفيكم الله فلا يَعْجِزْ أحدكُمْ أنْ يَلْهو بِأَسْهُمِهِ) رواه مسلم عن عقبة بن عامر.

واتە: لەمەودوا وڵاتانتان دەکرێتە دەستکەوت‌و خواش هاوکارتان دەبێ، جا بایەکێکتان تەنبەڵی نەکات لە خۆخافڵاندن بەتیرەکانیدا.

ئێستاش لەبەر ڕۆشنایی پێناسەی شارەزایانی زمان بۆ (لَهْو)و ئەو فەرمایشتانەدا، کە ڕابردن، دەتوانین بەڕاشکاویی بڵێین:

خافڵاندن‌و سەرگەرمیی (لَهْو) پێنج حوکمە شەرعییەکانی بەسەردا دەچەسپن،کە بریتین لە: پێویست بوون‌و پەسندبوون‌و قەدەغەبوون‌و نا پەسندبوون‌و ڕەوابوون، چونکە: بۆ نموونە:

تیرەندازەیی‌و مەشق کردن لەسەر نیشانە پێکان (الرِّماية)، لەکاتێکدا،کە جەنگ‌و جیهاد لەسەر مسوڵمانان پێویست دەبێ، دەبێتە فەرز، بەپێی بنچینەی: (ما لا يتم الواجبُ الاّ به فهو واجبُ) هەرشتێك فەرزێك پەکی لەسەر کەوت، فەرزە.

هەروەها گۆرانیی گوتن‌و دەف لێدان لەکاتی زەماوەندو بووك گواستنەوەدا، شتێکی پەسندو چاکە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلەیەك جیاکەرەوەی حەڵاڵ‌و حەرامی داناوە لە بواری نیکاحدا و، مسوڵمانانیشی بۆ هانداوە وەك لە فەرموودەکاندا دیارە،ئەمەش فەرموودەیەکی دیکەیە لەوبارەوە:

(عن عائيشة قالت: كان في حِجْري جارية من الانصار فَزَوَّجْتُها فدخل عليَّ رسول الله ﷺ يوم عُرْسِها فلم يَسْمَعْ غِناءً ولا لَهْوا، فقال: ياعائيشة هل غَنَّيتم عليها، أوَلا تُغنّون عليها؟ ان هذا الحيَّ من الأنصار يُحِبّون الغناءَ) رواه ابن حِبّان و رواته ثقات ورواه ابن ماجه بلفظ قريب منه عن ابن عباس.

واتە: عائیشە دەڵێ: کچێکی ئەنصاریی لەژێر سەرپەرشتی مندا بوو، بەمێردمدا، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕۆژی گواستنەوەی هاتەلام‌و هیچ گۆرانیی‌و دەفی نەبیست، فەرمووی: ئەی عائیشە! ئەری گۆرانییتان بەسەردا گوت، ئەدی گۆرانیی بەسەردا نالێن؟ پاشان فەرمووی: ئەم خەڵکەی ئەنصارییەکان حەزیان لە گۆرانیی‌یە.

بەڵام بێگومان هەرکات ئەو خافڵانە ببێتە مایەی شکاندنی قەدەغەیەك، یان چواندنی فەرزێك، ئەوە ئەوکاتە بەحەرامدادەنرێ.

ئەگەر ئەو خافڵانە سەر بکێشێ بۆ چواندنی سوننەتێك، یان کردنی شتێکی ناپەسند، ئەوە ئەوکاتە بەناپەسند (مکروه) دادەنرێ.

هەر لێرەشەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە بەرەهایی بەخراپ زانینی (لَهْو) ڕاو بۆچوونێکی هەڵەیەو، هیچ پەیوەندی بەشەرعەوە نیەو، هەڵقوڵاوی میزاج‌و (طَبْع)ە!

لێرەشەوە دەزانین،کە وەڵامی ڕاست‌و دروستی ئەو پرسیارە، کە دەڵێ: ئایا لەهوو، لەتا تەرازووی چاکەکانتدایە، یان تاتەرازووی خراپەکانت؟! ئەوەیە،کە بگوترێ: بەگوێرەی جۆرو چۆنیەتییەکەی‌و ئەو نیازو مەبەستەی لەپشتیەوەیەو، ئەو شوێنەوارو بەرهەمەی لێی پەیدا دەبێ، شوێنی خۆی دەگرێ!

## ٢- لغو:

(راغب الأصفهاني) لە پێناسەی (لغو) گوتوویەتی[1]:

﴿اللّغو من الكلام مالا يُعتَدُّ به وهو الذي يُوْرَدُ لا عن رَوِيَّةٍ، فَيَجْري مَجْرى اللّغا وهو من صوت العصافير ونحوها من الطيور... وقد يُسَمَّى كل كلام قبيحٍ لغواً، قال تعالى: ﴿لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ النبأ﴾، وقال: ﴿وَإِذَا

١) (مفردات ألفاظ القرآن)، ص ٧٤٢.

سَمِعُواْ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُواْ عَنْهُ ... ﴿٥٥﴾ القصص ﴾، ويستعمل اللّغو فيما لا يُعتَدُّ به، ومنه: اللّغو في الأيمان، أي مالا عَقْدَ عليه... قال تعالى: ﴿ لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ ... ﴿٢٢٥﴾ البقرة ﴾.».

واتە: قسەی لەغوو ئەوەیە،کە ئەمیەتی پێنەدرێ و، ئەوەیە،کە بەبێ تێفکیرن‌و بیر لێکردنەوە بەسەر زاردا دێ، بۆیە دەچێتە ڕیزی (لَغا)وە،کە بریتیە لە جریوەی پاساریی‌و باڵندەکانی وەك وی... جاری واش هەیە هەموو قسەیەکی خراپ بە لەغوو ناودەبرێ، خوای بەرز فەرموویەتی: (لەوێدا - واتە بەهەشت - نە لەغوو، نە درۆی تێدا نابیستن)، وە فەرموویەتی: ( هەر کاتێك گوێ بیستی لەغوو بوون پشتی تێدەکەن)، وشەی لەغوو بۆ هەرشتێك بەکاردێ، کە بایەخی پێنەدرێ، وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ( لەسەر لەغووی نێو سوێندەکانتان خوا سزاتان نادات).

کەواتە:

وشەی (لغو) بەگشتیی دوو واتای هەن، یاخود دەتوانین بڵێین: لەغوو دوو جۆرە:

أ- قسەی سادەو سەرزارەکیی،کە سوودو کەڵکی دنیایی‌و دوارۆژیی تێدانیە.

ب- قسەی خراپ‌و ناشیرین، کە بەقەدەغە، یان لانیکەم ناپەسند دادەنرێ.

نموونەی جۆری یەکەم سوێندی سەرزارەکیی‌یە، کە مرۆڤ دڵی لەسەر ناچەسپێ، وەك خوا (عزّ وجل) فەرموویەتی: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ... ﴿٨٩﴾ المائدة ﴾.

نموونەی جۆری دووەمیش قسەو قاڵ‌و گاڵە گاڵی کافرانە، کە خوا مەدحی ئەو بڕوادارانە دەکات، کە خۆیانی لێ دوور دەگرن، وەك فەرموویەتی: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ المؤمنون ﴾، وە فەرموویەتی: ﴿

﴿ وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُواْ عَنْهُ وَقَالُواْ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾ القصص﴾، وە فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسْمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْاْ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فصلت﴾.

چونکە وشەی (لغو) لە هەموو ئەم شوێنانەو هاو وێنەکانیاندا، بەمانای قسەی خراپ‌و ناشیرین‌و بێ‌جێیە وەك: کوفرو شیرك‌و جنێوو درۆو دەلەسەو....هتد، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە دوو شتە:

یەك: دیارە گۆزە چی تێدابێ، هەر ئەوەشی لێدەڕژێ، ئەهلی کوفرو شیرکیش ،جگە لە کوفرو قسەی خراپ‌و درۆو ناهەق بەدەگمەن، شتی دیکەیان پێیە.

دوو: خوا مەدحی ئەو بڕوادارانەی کردوە،کە ڕوو لە لەغووی کافران وەردەگێڕن‌و بەشدارییان ناکەن تێیدا، جادیارە خوای کاربەجێش تەنیا بەشدارییکردنی شتی خراپی کافرانی لە مسوڵمانان قەدەغە کردوە، ،ئەگەرنا هاوکاریی‌و بەشداریی شتی باشیان پەسندو بگرە پێویستیشە، وەك فەرموویەتی: ﴿ ....وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ...﴿٢﴾ المائدة﴾.

کەواتە: لەغووی مسوڵمانان لەخودی خۆیدا گوناه نیە، تەنانەت، ئەگەر سوێند بەخوا خواردنیش بێت، ،بەڵام هەرکات ئەو (لغو)ە، کە لەخودی خۆیدا ڕەوایە، بوو بە مایەی گوناهێك، وەك گوێ نەگرتن بۆ دواندەر (خطیب) لەکاتی وتاردانی ڕۆژی جومعەدا، کە بێگومان لەسەر نوێژکەران فەرزە گوێ لە وتاری وتاربێژ بگرن، ئەوە لەو حاڵەتەدا لەسۆنگەی ئەوەوە،کە بۆتە مایەی چواندنی فەرزێك بەگوناه دادەنرێ، هەروەها،ئەگەر سوننەت‌و خێرێکی پێ فەوتا، بە ناپەسند دادەنرێ، ،ئەگەرنا، مادام نەبێتە مایەی گوناهباریی‌و خێرو چاکە لەدەستچوون، ئەوە لەسەر ئەسڵی خۆی،کە ڕەوایی‌یە ماوەتەوە.

## ٣- غـنـــــاء:

أ- (المعجم الوسيط) بەم جۆرە پێناسەی وشەی (غِناء)ی کردوە[١]:

(الغناء: التطريب والترنُّم بالكلام المَوْزونِ وغيره، يكون مصحوباً بالموسيقى وغير مصحوب.

المغنّي: محترف الغناء، يقال: غَنَّي الحَمامُ: صَوَّت، وغَنَّى فلانٌ بِفُلانٍ: مَدَحَه وهجاهُ، وغنَّى بالمرأة: تّغَزَّلَ بِها، والأُغنية، الجمع: أغانٍ، وأغانيّ...)

واتە: (غِناء) بریتیە لەئاواز خوێندنو دەنگ لاراندنەوە بەقسەیەکی کێشدار، یان هی دیکە، لەگەڵ مۆسیقاداو بەبێ مۆسیقاش.

(مُغَنِّي): گۆرانیی بێژ، گۆرانیی گوتنی کردوە بەپیشە. دەگوترێ: کۆترەکە گۆرانیی گوت، واتە: دەنگی لێهات (گمە گمی هات)، وشەی (غَنّـی) هەم بۆ مەدح و، هەم بۆ هەجوو و هەم بۆ موغازەلەی ئافرەتیش بەکاردێ، وشەی (أغنية)، کە بەمانای گۆرانیی دێ بە (أغان) و بە (أغانيّ)یش کۆ دەکرێتەوە.

ب- (الخَطّابي)یش لەوبارەوە گوتوویەتی[٢]:

(كلّ من رفع صوتهُ بشيء وَوالى به مَـرَّةً بعد أُخرى فصوتُهُ عند العرب غِناءٌ، وأكثرهُ فيما شاقَ منْ صوتٍ أوشَجا من نغمةٍ ولَحْنٍ، ولذلك قيل: غَنَّتِ الحمامةُ وتغنَّى الطائرُ، قال: المجنون: ألا قاتل الله الحمامَةَ غَدْوَةً على الغُصْـنِ ماذا هَيَّجتْ حين غَنَّتِ).

واتە: هەرکەسێك دەنگی بەشتێك بەرز بکاتەوەو بیلارێنێتەوە جار لەدوای جار، ئەوە دەنگەکەی لەلای عەرەبان گۆرانیی (غناء) پێدەگوترێ، بەزۆریش بۆ ئەو دەنگو ئاوازانەیە،کە خۆشو دڵبزوێنن، بۆیەش گوتراوە: کۆترەکە گۆرانیی گوت و باڵندەکە گۆرانیی گوت، مەجنوونیش گوتوویەتی:

---

١) بڕوانە: ص ٦٦٤-٦٦٥ .

٢) بڕوانە: (غريب الحديث)، ج١ ص٦٥٦.

ئەرێ خوا ئەو کۆترە بکوژێ، کە بەیانی‌یەکەی لەسەر چڵێ گۆرانیی گوت چ هەستو نەستێکی ورووژاند!

ج- (إبن سیده)ش لەباسی جۆرەکانی گۆرانییدا گوتوویەتی[١]:

(وهو أنواعٌ بِحَسَبِ أثَرِهِ في السّامع:

فَمِنْهُ ما يُبْكي ويُرَقق...

ومنه ما يُطْرِبُ...

ومنه ما يُشَوِّقُ وترتاحُ له النفسُ...

ومنه ما يَسُرُّ ويُفْرِحُ ويحثُ على الكَرَمِ...

ومنه ما يُشجِّعُ...)

واتە: گۆرانیی بەگوێرەی ئەو شوێنەوارەی،کە لەبیسەردا پەیدێی دەکات چەند جۆرێکە:

هەیەتی مرۆڤ دەگریەنێو دڵی نەرم دەکات...

هەیەتی،کە،کەیفو شادیی پەیدا دەکات...

هەیەتی،کە مرۆڤ هاندەداتو نەفس پێی ئاسوودە دەبێ...

هەیەتی،کە مایەی دڵخۆشییو شادیی‌یەو مرۆڤ هاندەدات بۆ بەخشین...

هەیەتی،کەمایەی ئازارو بوێرکردنی مرۆڤە...

ئنجا شایانی باسیشە، کە ژمارەیەك لە زانایان بەهۆی ئاماژەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕایان وایە،کە چەمكو واتای (غِناء) هەموو ئەو دەنگو ئاوازانەش دەگرێتەوە،کە لە ئامێرەکانی گوتن (آلات الغناء) پەیدا دەبن، هەرکام لە (النووي)[٢]و (ابن حجر العسقلاني)[١]و (الشوكاني)[٢]و (عبدالله بن يوسف الجديع)[٣] ئەم ڕایەیان هێناوە.

---

١) بڕوانە: (المخصص)، ج٤، ص٩ .

٢) (شرح صحيح مسلم)، ج٦، ص١٨٣.

کەواتە : (غِناء)،کەلە زمانی کوردیدا (گوتن)، یان (گۆرانیی) پـێدەڵێین، بریتیـە لـە دەنـگ بەرزکردنـەوەو لاراندنـەوەی بەشـیعرو غـەیری شـیعریش بەجۆرێك،کە ببێتە مایەی جووڵاندنی هەستو سۆزی جۆراو جۆر لە مرۆڤـدا، وەك: کەیفو شادیی، دڵتەنگیی، بەزەییو پەرۆش، حەماسەتو ئازایەتی...

هەروەها چەمكو واتای (غِناء)، سەرجەم دەنگو ئاوازە خۆشو بەجۆشەکانی دیکەش دەگرێتەوە، چ هی پەڕندە بن، چ هی ئامێرە مۆسیقاییەکان.

شایانی باسیشە کە لە کتێبە شەرعییەکاندا وشەی (سَماعْ)یش، کە بـەمانای (غِناء)ە، زۆر هاتوە[٤].

## ٤- معازف:

أ- (المعجم الوسيط) لەبارەی ڕیشەو بنکی وشەی (مَعازف)ەوە گوتوویەتی[٥]:

(عَزَفَتْ نَفْسُهُ عن الشيء عُزوفاً: انصرفَتْ عنه وزهِدَتْ فيه، يقال: هو عَزوفٌ عن اللّهو: لايشتهيه، وَعَزَفَ فُلانٌ عَزْفاً وَعزيفاً: لَعِبَ بِالمِعْزَفِ وغَنَّى، يقال: عَزَفَ على العود وعَزَفَ الشيءُ: صَوَّت... يقالُ: عَزَفَتِ الرِّيحُ... والمِعْزَفُ: آلَةُ الطَّرَبِ كالعود والطِّنبور، جمعه: مَعازف، والمِعْزَفة: المِعْزَفُ، والمَعْزوفَةُ: قطعة موسيقية) .

ب- (الجوهري)یش گوتوویەتی[٦]:

(والمعازف: الملاهي، والعازِفُ: اللاّعِبُ بها والمُغَنِّي).

---

١) (فتح الباري)، ج٢، ص٤٤٢.
٢) (نيل الأوطار)، ج٨، ص٢٦١.
٣) (الموسيقى والغناء في ميزان الإسلام)، ص٢٤.
٤) بڕوانە: (المعجم الوسيط)، وشەی (السَّماع)، ص٤٤٩.
٥) ص ٥٩٨-٥٩٩.
٦) (مختار الصحاح)، ج٤، ص١٤٠٣.

(ابن فارس)یش گوتوویەتی[١]:
(واشْتُقَّ من هذا: العَزْفُ في اللَّعِب والملاهي).

کەواتە:

(مَعازِف)،کۆکۆی (مِعْزَفَة ومِعْزَفْ)ە، ڕیشەکەی (عَزَفَ)یە،کە دوو واتای هەن:

أ- (صوّت) دەنگی لێهێنا، کە دیارە مەبەست لەدەنگ لێهێنراوەکە ئامێرە دەنگییەکانە.

ب- (إنصرف عنه) وازی لێهێنا، وەك دەگوترێ: (عَزَفَ عن الدنيا) وازی لەدنیا هێنا.

وە (مِعْزَفْ)و (مِعْزَفَة)، کە کۆیەکەیان (مَعازِف)ە، بەهەر ئامێرێك دەگوترێن، کە دەنگی لێ‌بێ‌و لەکاتی گوتن (غِنـاء)دا بەکاربێ، وەك: دەفو تەپڵ‌و شمشاڵ‌و بلوێرو پیانۆو.... هتد، بۆیە دەڵێن: (مَعازِف) یانی: ئامێرەکانی مۆسیقاو گۆرانیی بەگشتیی.

دیارە وێڕای دەلالەتی زمان، کە باسمان کرد لەسەر ئەوە، کە وشەی (مَعازِف) سەرجەم ئامێرەکانی گۆرانیی‌و بەزم (آلات الغناء والطَّرَب) دەگرێتەوە، لەنێویشیاندا (دەف)، ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەریش ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەوە،کە تێیدا فەرموویەتی (سَمِعْتُ عَزْفاً بِغَرابيل ومزامير)، واتە: گوێبیستی لێدانی دەفو زوڕنا بووم، ئەو فەرموودەیەش، کە دوایی بەتەواویی دەیهێنین هەرکام لە: (ابن اسحاق وابن حبان والحاكم والبيهقي والبخاري في التأريخ والفاكهي في "أخبار مكة" و أبو نعيم في "دلائل االنبوة")دا هێناویانە.

کەواتە:

(دەف) بە (مِعْزَفَة) دادەنرێ‌و، دەف لێدان (عَزْف)ی بۆ بەکاردێ.

---

١) (معجم مقاييس اللغة)، ج٤، ص٣٠٦.

## ٥- مـــزامـــيـــر:

(المعجم الوسيط) لەبارەی واتاو ڕیشەی (مزامير)ەوە گوتوویەتی[1]:

(زَمَرَ يَزْمِرُ زَمْراً وزَمِيراً وزَمَراناً: صوَّت بالمزمار، أو غَنَّى في القَصَبِ، يُقال: زَمَرَ بالمِزْمار وفيه... وزَمِرَ الشيءُ: قلَّ، يقال: زَمِرَ صُوفُهُ أو شَعْرُهُ أو ريشُهُ، وزَمِرَ فُلانٌ: قَلَّتْ مروَّتُهُ.... وزَمِرَ: حَسُنَ، يُقال: زَمِرَ فُلانٌ فهو زَمِرٌ وزَمِيرٌ... وزَمَّرَ بالمِزْمارِ: نَفَخَ فيه مُطْرِباً... والزّامِرُ: النّافِخُ بالمِزْمارِ أو القَصَبِ... والزمّار: الزّامِرُ والزّمّارةُ: مؤنث الزمّار والزّمّارة: آلة الزَّمْر.

والمزمار: آلةٌ من الخشب أو مَعْدِنِ تَنْتَهي قَصَبَتُها بِبوقٍ صغير، جمعه مزامير، ومزامير داود: ماكان يَترَنَّمُ به من الأناشيد والأدعية).

كەواتە:

(مزامير) كۆی (مزمار)ە، كە بەكوردی (زوڕنا)یەو بە(شمشاڵ)یش دەگوترێ‌و ڕیشەكەیشی (ز م ر)یە،كە سێ واتایان دەگەیەنێ:

زَمَرَ: صَوَّتَ، دەنگی لێهێنا، یان دەنگی لێهات .

زَمِرَ: قَلَّ، كەم بوو.

زَمِرَ: حَسُنَ، چاك بوو، جوان بوو.

ئنجا (زامِر، زمّار، زَمّارة)ش هەرسێكیان بەمانای زوڕنا لێدەرن‌و (زَمّارة) بەمانای (شمشاڵ)و زوڕناشدا.

ئێستاش بۆ ئەوەی چەمك‌و واتای (مزامیر، مِزْمار)مان باشتر بۆ ڕۆشن بێتەوە، با سەرنجی چەند فەرمایشتێكی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەین:

أ- پێشتر ئەو فەرموودەیەمان هێنا، كە پێغەمبەر ﷺ بە (أبو موسى الاشعري) فەرمووە: (لقد أُوتيتَ مِزماراً من مزامير آل داود) متفق عليه.

---

١) ص٣٩٩، ٤٠٠.

کە دیارە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لێرەدا لە وشەی (مزمار) دەنگ‌و ئاوازی خۆشە.

ب- (عن عائيشة قالت: دخل عليَّ رسول الله ﷺ وعندي جاريتان تُغَنِّيانِ بِغِناءِ بُعاث، فاضطجع على الفراش وحَّول وَجْهَهُ ودخل أبوبكر فانتهرني وقال: مِزْمارة "وفي لفظ: مِزْمار" الشيطان عند النبّي ﷺ فأقبل عليه رسول الله فقال: دَعْهُما، فلما غَفَلَ غَمَزْتهُما فَخَرَجتا) متفق عليه.

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لێم وەژوور کەوت‌و منیش دوو کچم لەلابوون گۆرانیی ڕۆژی (بُعاث)یان دەگوت، ئەویش لەسەر جێگا ڕاکشاو ڕووی وەرگێڕا، ئەبوبەکریش لەوکاتەدا هاتە ژوورو تێی خوڕیم‌و گوتی: چۆن دەبێ لەلای پێغەمبەر ﷺ (مزمارة) "وە لە بێژەیەکی دیکەدا هاتوە (مزمار)"ی شەیطان هەبێ؟! پێغەمبەری خواش ڕووی تێکردو فەرمووی: وازیان لێبێنە! پاشان کاتێك پێغەمبەر ئاگیی لەوە بڕا، ئاماژەم بۆ کردن‌و چوونە دەرێ.

ئاشکراشە، کە مەبەستی (أبوبكر) -خوا لێی ڕازی بێ- لە (مزمار الشيطان) دەنگی گۆرانیی دوو ئافرەتە گۆرانیی بێژەکە بووە، کەواتە: وشەی (مزمار) بۆ هەر دەنگێکی خۆش بەکاردێ، چ هی ئامێرێکی وەك دەف‌و زوڕنا بێ، چ هی مرۆڤ.

ج- (عن نافع مولى ابن عمر أنَّ ابن عمر رضي الله عنهما سَمِعَ صَوْتَ زمّارة راعٍ فَوَضَعَ أصْبُعَيْه في أُذُنَيْه....) رواه احمد وأبو داود وابن حبان والطبراني وغيرهم.

واتە: نافیع دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر -خوا لێیان ڕازی بێ- گوێی لە شمشاڵی شوانێك بوو، هەردوو پەنجەی خستە گوێیەکانییەوە...

کەواتە: وشەی (زَمّارة) واتای شمشاڵی شوانیش دەگەیەنێ.

پوختەی مەبەستی وەرگیراو لەم فەرمایشتانەش ئەوەیە،کە:

وشەی (مزمار)، کە کۆیەکەی (مزامیر)ە، هەم بۆ دەنگی خۆش بەگشتیی بەکاردێ، جا چ هی مرۆڤ بێ، چ هی ئامێر، چ بۆ زیکرو قورئان خوێندن بێ، چ بۆ گۆرانییو بەزم، چ بۆ کاری خێرو پەسند بەکاربێن، چ بۆ هی خراپو ناپەسند، هەم ناویشە بۆ هەر ئامێرێك،کە دەنگی خۆشی لێبێ، وەك: دەفو شمشاڵو زوڕنا.

## ٦- موسیقی:

(المعجم الوسیط) بەم شێوەیە پێناسەی مۆسیقا دەکات[1]:

(الموسیقی: "تذكَّر وتؤنث" لفظ یوناني یُطْلَقُ علی فنون العَزْفِ علی آلات الطَّرَبِ، وعلم الموسیقی: علم یُبْحَثُ فیه عن اصول النَّغْمِ من حیث تأتَلِفُ أو تَتَنافَرُ، وأحوال الأزمنة المتخلّلة بینها لِیُعْلم کیف یؤلَّفَ اللَّحْنُ... والموسیقار من حِرْفَته الموسیقی).

واتە: وشەی (موسیقی)،کەلەزمانی عەرەبی دا بە (مُذکَّر)و (مؤنَّث)یشدا، وشەیەکی یۆنانییەو بۆ هونەری بەکارهێنانی ئامێرەکانی بەزمو گوتن بەکاردێ، زانیاری مۆسیقا زانیارییەکە تێیدا لە بنچینەکانی ئاواز دەکۆڵرێتەوە، لەڕووی پێکەوە گونجانو نەگونجانی ئاوازو دەنگەکانەوە، ئەو بۆشایییانەی،کە دەبێ بکەونە نێوان ئاوازەکانەوە، تاکو بزانرێ هەواو دەنگەکە چۆن ڕێك بخرێ... مۆسیقاریش بابایەکە، کە پیشەکەی مۆسیقایە. شایانی باسیشە، وشەی (موسیقی)،کەلەبنەڕەتدا یۆنانییە، لەهەردووك وشەی (موسا)و (قی) پێکهاتوە، کە یەکەمیان بەمانای خورپە هێنەر (المُلْهِمة) دێو، (قی)ش وشەیەکە،کە مانای وشەی یەکەم دەگشتێنێو فراوان دەکات،تاکو هەموو جۆرەکانی هونەر بگرێتەوە[2].

---

١) ص٨٩١.

٢- بڕوانە: (الشریعة الاسلامیة والفنون)، ص ١٨١.

کەواتە: وشەی مۆسیقا ناوێکی گشتی‌یە،کە هونەری بـەکارهێنانی سـەرجەم ئامێرەکانی گوتن (آلات الغنـاء) دەگرێتـەوە،زانیاری مۆسـیقاش ئـەو زانیـاری یەیە،کەلەو بابەتە دەکۆڵێتەوە.

واتە: وەك چۆن وشەکانی (معازف و مزامیر و ملاهي)، هەم گۆرانیی‌و دەنگی خۆشی مرۆڤـ و، هەم سەرجەم ئامێرە دەنگییەکان دەگرنەوە، وشـەی مۆسـیقاش بەهەمان شێوەو بگرە چاکتریش.

## باسـی دووەم: ئامێـرە مۆسـیقایـیەکان و جۆرەکانیـان ؛

خوێنەری سەنگین!

لەم ڕۆژگارەدا، ئامێرە مۆسیقاییەکان ژمارەیان یەکجار زۆرەو، بەهۆی بـەرەو پێشچوونی تەکنەلۆژیاشەوە، بەردەوام لەزۆر بوونـدان، بۆیـە زۆر زەحمەتـە نـاوی هەموویان بهێنرێ، بەتایبەتیش، کە ناوو چۆنیەتییەکانیان لەنێو زۆربـەی گـەل‌و کۆمەڵگایەکاندا جیاوازن.

بەڵام ئامێرە مۆسیقییەکان بەگشتیی سێ جۆرن:

### یەکـــەم : پێداکێشـراوەکان (ذوات الضَّـرْب):

کە مەبەست پێیان هەموو ئەو ئامێرانەن، کە بەهۆی پێداکێشرانەوە دەنگیـان لـێ‌دێ، جا چ پەنجەو دەستیان لێبدرێ، چ دار، چ هەرشتێکی دیکە.

دیارە ئەم جۆرە ئامێرانەش زۆر شێوەیان هەن، وەك:

١- دەف چ بێ زەنگوڵە، چ زەنگوڵدار.

٢- تەپـــڵ .

٣- دمبـــك .

٤- دەهـــۆڵ .

## دووەم : ژێدارەکـــان (ذوات الاوتــار) :

ئەمانیش هەموو ئەو ئامێرانەن،کە چەند ژێ‌و تەلێکیان پێوە بەستراون‌و بەهۆی لەراندنەوەی ئەو (ژێ)و (تەل)انەوە، چ بەهۆی پەنجەکانی دەستەوە، چ بەهۆی هەر ئامرازێکی دیکەوە دەنگیاندێ.

ئەمانیش ناو و شێوەی یەکجار زۆریان هەن، بۆ نموونە:

١- عـــوود .

٢- کەمانـچە .

٣- ســــاز .

٤- سەنتوور .

٥- گیتـــار .

٦- تـــــار .

٧- قانـــوون .

## سێیەم: فوودارەکان (ذوات النّفخ):

ئەمانیش هەموو ئەو ئامێرانەن،کە بەهۆی فوو پێداکردنەوە دەنگیاندێ‌و، ناوو شێوەی زۆریشیان هەن، بۆ نموونە:

١- شـمشاڵ .

٢- زوڕنـــا .

٣- بلوێـــر .

٤- تووزەلـە .

٥- فلـــووت .

دیارە ئێستا لەم ڕۆژگارەدا هەندێك ئامێری كارەبایی وا دروست كراون، بەهۆی تەزووی كارەبایی یەوەو بە دوگمە كار دەكەنو، ڕۆڵی چەندان ئامێر لەیەك كاتـدا دەگێڕن، بۆ نـموونە:

أ- ئۆرگ .

ب- پیانۆ .

ئنجا وەك پێشتریش گوتـمان:

هەركام لە وشـەی (معـازف)و (مـزامیر)، سـەرجەم ئـامێرە مۆسـیقاییەكان دەگرنەوە، چونكە هەم وشەی (عَزَفَ)و، هەم وشەی (زَمَرَ) بەمانای (صَوَّتَ) دەنگی لێهێنا، دێن، كەواتە: هەرشتێك دەنگی خۆشی لێ بهێنرێ، چ پێداكێشراو بێ، چ ژێدار، چ فوودار، ئەوە بە (معازف)و (مزامیر) دادەنرێ.

ئەم ڕاستییەشـمان بۆیە بەجەخت لەسەركردنەوە ڕاگەیاندو دووپـات كـردەوە، تاكو بزانرێ، كە هەر حوكمێك بۆ وشەی (معازف)و (مزامیر) ساغ بێتەوە، ئـەوە بەبێ هـەڵاواردن، سـەرجەم ئـامێرە دەنگیـی‌و مۆسـیقاییەكان دەگرێتـەوە، لـە باسەكانی داهاتووشدا زۆر پێویستیمان بەم ڕاستییە دەبێ!

## باسی سێیەم: زانایان لەبارەی گۆرانیی و مۆسیقاوە ڕاجیاییان هەیەو یەکدەنگیی (إجماع) هەبوون لەسەر قەدەغەکرانیان، قسەیەکی بێ بناغەیە:

مەسەلەی گۆرانییو مۆسیقا، یەکێکە لەو مەسەلانەی،کە لەنێو شەرعزاناندا زۆرترین کێشەو مشتو مڕیان لەسەر کراوەو، ئێستاش بەردەوامە.

کەچی زۆرێك لەلایەنگرانی ڕێی بەقەدەغە زانینی گۆرانییو مۆسیقا، لە ئەنجامی لاسا کردنەوەو دەمارگیرییەوە، لافی ئەوە لێدەدەن،کەزانایانی ئیسلام لەسەر قەدەغەبوونی ( گۆرانییو مۆسیقا)، یان بەلانی کەمەوە لەسەر (مۆسیقا) یەکدەنگن!

جا ئێمە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو قسەیەو سەلماندنی ئەو ڕاستییە،کە مەسەلەی گۆرانییو مۆسیقا مەسەلەیەکی خیلافییە، لەنێو بەڵگە گەلێکی زۆردا، بەم سێیە وازدێنین:

### بەڵگەی یەکەم :

(بدرالدین بن جماعة) لەبارەی حوکمی گۆرانییەوە پرسیاری لێکراوە، ئەویش گوتوویەتی[١]:

(هذه مسألة خلافية تباينت فيها الطرق تبايناً لايوجد في غيرها... ومُلَخَّص القول: أن الناس على أربعة أقسامٍ: فرقة استحسنت أي استحبت، وفرقة أباحت، وفرقة كَرِهَتْ، وفرقة حرَّمتْ، وكلّ واحدة من هذه الفرق على قسمين: فمنهم من أطلق القول ومنهم من قَيَّدَهُ بشرطٍ).

---

١) بڕوانە: (إتحاف السادة المتقين: شرح إحياء علوم الدين)، للزبيدي، ج٧، ص٧.

واتـە: ئەمـە مەسـەلەیەکی خیلافییە،کـە بـەجۆرێك ڕاو بۆچـوونەکان تێیـدا جیاوازن،کە لە هیچ مەسەلەیەکی دیکەدا وانەبووە...

کورتەی مەبەستیش لەوبارەوە ئەوەیە،کە خەڵکی بوونەتە چوار بەشەوە:

کۆمەڵێکیان پێیان چاك بووە، واتە پەسـندیان کـردوە، کۆمـەڵێکیان بـەڕەوا (مُباح)یان داناوە، وە کۆمەڵێکیان بەناپەسند (مکروە)یان زانیوە، کۆمەڵێکیشیان بەقەدەغەیانداناوە، جاهەرکام لەم چوار کۆمـەڵەش دووبەشن:

بەشێکیان بەڕەهایی قسەیان کردوەو، بەشێکیان مەرجداریان کردوە.

کەواتە: لەبارەی گۆرانیی‌یەوە هەشت ڕا هەن:

١- بەپەسند دانانی بەڕەهایی.

٢- بەپەسند دانانی بەمـەرجەوە.

٣- بەڕەوا دانانی بەڕەهایی‌و بێ مەرج.

٤- بەڕەوا دانانی بەمەرجەوە.

٥- بەناپەسند دانانی بەڕەهایی.

٦- بەناپەسند دانانی بەمەرجەوە.

٧- بەقەدەغە دانانی بەڕەهایی.

٨- بەقەدەغە دانانی بەمەرجەوە.

بەڵکو (ابن حجر الهیثمي) یازدە (١١) ڕێی لەوبارەوە هێناون، لە کتێبی (کَفُّ الرِّعاع عن محرَّمـات اللَّهـو والسَّماع)دا بڕوانـە پـەراوێزی (الزواجـر عـن اقـتراف الکبائر)، ج٢، ص٢٧٧-٢٧٨.

**بەڵگــەی دووەم :**

(الشوكاني) کتێبێکی تایبەتی لەوبارەوە هەیە بە ناوونیشانی: (إبطـالُ دعـوى الإجماع على تحريم مطلق السَّماع)، واتــە: هەڵوەشـاندنەوەی دەعـوای هــەبوونی یەکدەنگیی لەسەر قەدەغەبوونی گۆرانیی‌و مۆسیقا بە ڕەهایی، کە تێیدا هاتوە:

(اذا تقرَّر هذا تَبيَّنَ للمنصف العارف بكفية الأستدلال، العـالم بصـفة المنـاظرة والجدال، أن "السَّماع" بآلةٍ وبغيرها من مواطن الخلاف بين أئمة العلم ومن المسائل التي لاينبغي التشديد في النكير على فاعلها، وهذا الغَرَض هو الذي حملنـا علـى جمع هذه الرسالة، لأن في الناس من يزعم لقلة عرفانه بعلوم الأستدلال وتعطل جوابه عن الدراية بالأقوال، أن تحريم الغناء بالآلة وغيرها من القطعيات المجمع عليها!

وقد علمت أن هذه فرية ما فيها مرية وجهالة بلا حالة، وقصر باع بغير نزاع، لما لايَخْفى على عارف ان رمي من ذكرنـا (مـن المبـيحين للغنـاء) مـن الصـحابة والتابعين وتابعيهم وجماعة من أئمة المسلمين بارتكاب محرَّم قطعاً: من أشنع الشنع وأبدع وأوحش الجهالات وأفحش الضلالات، فَقَصْدُنا الذبُّ عن أعراضهم الشـريفة والدفع عن هذا الجانب للمقولة السخيفة)[١].

واتە: (پاش ئەوەی گوترا، ڕوون بۆوە بۆ هەرکەسـێکی بەویـژدانی شـارەزا بـە چۆنیەتی بەڵگە هێنانەوەو زانا بەچۆنیەتی وتوێژو شەڕەقسە، کە گۆرانیی گوتن چ بە ئامێرەوەو چ بەبێ ئامێر، لە بابەتە خیلافییەکانی نێوان پێشەوایانی زانسـتەو لەو مەسەلانەیە،کە دروست نیە سەختگیریی لەگەڵ بکەرەکەیدا بکرێ، هەر ئـەو مەبەسـتەش بـوو، کـە پـاڵی پێوەنـاین ئـەم نامیلکەیـە کۆبکەینـەوە، چـونکە هەندێك،کەس بەهۆی،کەم شارەزاییی‌یانــەوە بەزانیارییــەکانی بەڵگــە هێنانــەوەو بێئاگایی لە قسەو بیروڕایەکان، پێیان وایە،کە حەرامیی گۆرانیی گوتن بە ئامێرو بەبێ ئامێریش لەو مەسەلانەیە،کە یەکدەنگیی‌یان لەسەرە!، بەڵام زانیت کە ئەمە درۆیەکە هیچ گومانی تێدا نیەو، نەفامیی‌یەکی بێ تام‌و دەستکورتییەکی ڕوون‌و

---

١) ص.١٨٠

ئاشـکرایە، چـونکە لـەلای هـیچ شـارەزایەك پـەنهان نیە،کـە تۆمـەتبارکردنی ئەوانەی،کـە باسمـان کـردن (لـە بـەرەوا دانـەرانی گـۆرانیی) لـە هـاوەڵانو شوێنکەوتوانیانو شوێنکەوتوانی شوێنکەوتوان، بەوە،کە قەدەغەیەکی بێچـەندو چوونیان شکاندوە، ناقۆڵاترین شتو خراپترینـدا هێنـراوو نـامۆترین نـەفامیىو دزێوترین گومڕاییی‌یە، جامەبەستمان بەرگریی کردن لەسومعەو شۆرەتی بەرزیانو بەرپەرچدانەوەی ئەو قسە پووچە بوو).

(ابن حجر الهيثمـي)یش هەرچەندە ڕای بەرانبەر بەگۆرانییو مۆسـیقا زۆریـش توندە، ،بەلاّم لەوبارەوە گوتوویەتی:

(وَقَع لمن لا تحقيق لهُ أنْ أنْكَرَ سَماع الغناءِ من غير تفصيل، وليس كما زَعَـمَ، ولهذا قال أبو طالب المكي: من انكر أنكر على سبعين صِدِّيقاً! (قال ابن حجر) واراد بالسبعين الكثرة وإلاّ فالصدِّيقون -وهم العلماء المبيحون لهُ بِشرطه- لاينْحَصِرون.

وقال الأمام السهروردي هنا: المنكِر إمّا جاهِلٌ بِالسنن والآثار أو جامدُ الطَّبْع لا ذَوْقَ لَهُ)[1].

واتە: کەسانێك،کە خاوەنی لێکۆڵینەوە نین، گوتن (غِنـاء)یـان بەگشـتیی بـە خراپ داناوە، ،بەلاّم وەك گومانی بـردوە وانیـە، هەربۆیـەش (أبوطالـب المكّـي) گوتوویەتی: هەرکەسێك گوتن بەخراپ دابنێ ئەوە مانای وایە ڕەخنەی لە حـەفتا (صیددیق) گرتـوە، (ابـن حجـر) دەڵـێ: مەبەسـتی لـە حـەفتا زۆرییە،ئەگـەرنا صیددیقەکان - کە زانایانێکن،کە بەمەرجەوە بەرەوایاندانـاوە- سەرژمێر ناکرێن.

پێشەوا (سُهروردي) لێرەدا گوتوویەتی: نکوڵییکەر لـە ڕەوایـی گـوتن، یـان بێئاگایە لە سوننەتو شوێنەوارەکان، یان ئەوەتا وشكو بێ سەلیقەیە!

---

١) بڕوانە: (كَفُّ الرِّعاع عن مُحرَّمات اللّهو والسَّماع) على هامش (الزواجر)ج٢ ص٢٧٤.

## بەڵگەی سێیەم :

خاوەنی کتێبی: (الغناء والمعازف في الإعلام المعاصر) پاش ئەوەی باسی ئەوە دەکات، کە خاوەنی کتێبی: (التراتيب الأدارية المسمى: نظام الحكومة النبوية) ناوی بیست (٢٠) کتێبی زانایانی هێناوە، کە نکوولّییان کردوە لە قەدەغەبوونی گۆرانیی‌و مۆسیقا بەگشتیی، دەڵێ: منیش پاش لێکۆڵینەوە، ناوی ئەو زانایانەو کتێبەکانیانم گەیاندە چلو شەش (٤٦)،کەئەمانەن‌و بەپێی مێژووی وەفاتیان ڕیزم کردوون[1]:

١- الزبير بن بكار الأسدي /٢٥٦ك، کتێبی (الموفقيات).

٢- الفاكهي، محمد بن اسحاق بن العباس/٢٧٢ك، کتێبی (تأريخ مكة).

٣- الإمام ابن قتيبة الدينوري، عبدالله بن مسلم/٢٧٦ك، کتێبی (الرخصة في السَّماع).

٤- زكريا بن يحيى بن عبدالرحمن السّاجي/ ٣٠٧ك، کتێبی (الخلاف).

٥- أبوبكر بن المنذر، محمد بن ابراهيم النيسابوري الشافعي/ ٣١٨ ك، کتێبی: (الإشراف على مذهب الآشراف).

٦- أبو طالب المكي/ ٣٨٦ ك، کتێبی: (قوت القلوب).

٧- الطوسي، عبدالله بن علي السراج، أبو نصير/٣٧٨ ك، کتێبی: (اللُّمع).

٨- محمد الأدفوي الشافعي، أبوبكر/٣٨٨ ك، کتێبی:(الإقناع في أحكام السماع).

٩- عطية بن سعيد بن عبدالله الأندلسي، أبو محمد القفصي/ ٤٠٧ ك، کتێبی: (تجويز السماع).

١٠- الامام أبو منصور البغدادي/ ٤٢٩ ك، کتێبی: (السماع).

---

١) (الغناء والمعازف في الإعلام المعاصر) ص٢٧١ تا ٢٧٥.

١١- الماوردي، أبو الحسن القاضي/ ٤٥٠ ك، كتێبی: (الحاوي الكبير في الفروع).

١٢- الحافظ ابن حزم الأندلسي الظاهري/ ٤٥٦ ك، كتێبی: (رسالة في أحكام السماع والغناء).

١٣- الامام القشيري، أبو القاسم/ ٤٦٥ك، كتێبی: (أحكام السَّماع).

١٤- الامام الغزالي، أبو حامد/ ٥٠٥ ك، كتێبی: (آداب الوجْد والسماع)له (إحياء علوم الدين)دا.

١٥- الامام الحافظ ابن القيْسراني، محمد بن طاهر المقدسي/ ٥٠٧ ك، كتێبی: (السَّماع).

١٦- أبو الوفاء ابن عقيل، شيخ الحنابلة/ ٥١٣ ك، كتێبی: (الفصول).

١٧- الغزالي (أبو الفتوح) أخو صاحب الأحياء، ٥٢٠ ك، كتێبی: (بوارق الإلماع في تكفير منْ يُحرِّمُ مطلق السماع).

١٨- القاضي ابوبكر ابن العربي الماكي/ ٥٤٣ ك، كتێبی: (أحكام القرآن).

١٩- ابن السَّمعاني/ ٥٦٢ ك، كتێبی: (ذيل تأريخ بغداد).

٢٠- ابن حمدون، محمد بن الحسن البغدادي، أبو المعالي/ ٥٦٢ ك، كتێبی: (التذكرة الحمدونية).

٢١- السهروردي، عمر بن محمد/ ٦٣٢ ك، كتێبی: (عوارف المعارف).

٢٢- محمد بن عمر الحضرمي، جمال الدين/ ٦٣٠ ك، كتێبی: (المتعة في السماع).

٢٣- عبدالواحد بن علي التميمي المراكشي/ ٦٤٧ ك، كتێبی: (المُعْجِب في اخبار المغْرِب).

٢٤- محمد بن عمر بن محمد السَّبْتي، المعروف بالدرّاج/ ٧٢١ ك، کتێبی: (الكفاية والغناء في أحكام الغناء).

٢٥- الامام شمس الدين الذهبي/ ٧٤٨ ك، کتێبی: (الرخصة في الغناء والطَّرب بشرطهِ).

٢٦- الامام كمال الدين الادفوي/ ٧٤٩ ك، کتێبی: (الآمتاع بأحكام السماع).

وە لە کتێبەکەی خۆیدا،کە (شوكاني) لەبارەیەوە گوتوویەتی: (لم يؤلَّفْ مثله في بابه)، بەڕەوا دانانی گۆرانییو مۆسیقا پاڵداوەتە لێی هەرکام لە:

٢٧- الشيخ أبو القاسم القشيري.

٢٨- الشيخ تابع الدين الفزاري.

٢٩- الشيخ عزالدين بن عبدالسلام، سلطان العلماء.

٣٠- الشيخ تقي الدين ابن دقيق العيد، وە دەڵێ ئەمیان کتێبێکی هەیە لەوبارەوە بەناوی: (إقتناص السوانح).

٣١- الامام الصفدي، خليل بن أَيْبَك، صلاح الدين/ ٧٦٤ ك، (رسالة في علم الموسيقى).

٣٢- بدرالدين حسن بن علاءالدين القونوي المصري/ ٧٧٦ ك، (بُدوِّ الشّعاع في أحكام السَّماع).

٣٣- ابن رجب الحنبلي/ ٧٩٥ ك، کتێبی: (نُزهة الأَسْماع في مسألة السَّماع).

٣٤- الكَجراتي، عبدالرحيم، أبوعيسى القاضي، کتێبی: (السَّماع).

٣٥- أبو المواهب التونسي/ ٨٥٠ ك، (فرح الأَسماع بِرُخَص السَّماع).

٣٦- بحرق الحضرمي، محمد بن محمد بن عمر، علاّمة اليمن/ ٩٣٠ ك، (متعة الاسماع بأحكام السّماع).

٣٧- ملاّ علي القادري/ ١٠١٤ ك، (الأعتناء بالغناء وفي أحكام السماع).

٣٨- عبدالقادر بن محمد بن محمد القادري، (إمْتاعُ الأسماع لجواز الأستماع).

٣٩- محمد بن الخفيري الدمشقي، (الأمتاع بحكم السَّماع).

٤٠- شهاب الدين الحديدي، (السَّماع).

٤١- عبدالغني النابلسي/ ١١٤٣ ك، (إيضاح الدلات في سَماع الآلات).

٤٢- محمد المرعشي المعروف بساچقلي زاده الحنفي/ ١١٤٥ك، (رسالة في حكم الغناءِ والموسيقى).

٤٣- العلامة عبدالرحمن بن مصطفى العَيْد روسي اليمني المصري/ ١١٩٢ك، (تشنيف الأسماع ببعض أسرار السَّماع).

٤٤- العلامة الشوكاني/ ١٢٥٠ك، (إبطال دعوى الأجماع في تحريم مُطلق السَّماع).

٤٥- جعفر بن ادريس الكتّاني/ ١٣٢٢ك، (مواهب الآدب المبرّأة من الجَرَب في السَّماع و الآلات والطّرَب).

٤٦- ابن خياط الذكاري (من أعيان القرن العشرين)، (إختصار مواهب الأدب في الأغاني و السَّماع).

بەڵێ هەموو ئەم زانایانە بە شێوەیەك لە شێوەكان، پشتگیریی‌یان لە ڕەوا (مباح)بوونی گۆرانیی‌و ئامێرەكانی كردوە.

## باسی چوارەم: هەرچەندە بناغەی هەڵس و کەوت لەگەڵ بابەتە خیلافییەکاندا تەبایی و کراوەیی یە، بەڵام هەندێك لە زانایان لەبارەی گۆرانیی و مۆسیقاوە بەهۆی دەمارگیریی و کاردانەوەوە گیرۆدەی زێدەڕۆیی و بەزایەدان بوونە:

هەمیشە دەمارگیریی (تعصب)و کاردانەوەی عاتیفییانە، سەردەکێشێ بۆ تێپەڕاندنو بەزایەدان (إفراط وتفریط)، جا شایانی باسە، کە لەبواری مامەڵەکردن لەگەڵ گۆرانییو مۆسیقاشدا، هەندێك لەزانایان گیرۆدەی دەردو حاڵەتی ناوبراو بوونەو، ئەمەش بۆتە مایەی چەواشەبوونو سەرلێشێوانو، لەیەکدی دوورکەوتنەوەی خەڵکی مسوڵمان بەهەردوو لادا، سەرەنجام کێشەو مشتو مڕێکی زۆر لەنێوان هەردوو لای بەقەدەغە دانەرانی گۆرانییو مۆسیقاو بەڕەوادانەرانیاندا بەرپا بووە.

با بۆ ڕوون بوونەوەی مەبەست، دوو نموونە بێنینەوە:

یەك: (إبن القیم) لە کتێبی (إغاثة اللّهفان من مصاید الشیطان[1])دا،کەتێیدا زۆر سەختگیرانە هێرش دەکاتە سەر گۆرانییو مۆسیقا،جا بۆسەر خستنی ڕایەکی خۆی، قسەیەکی (ابن الصلاح الشهرزوري) لە (فتاوی)کەیدا بەبەڵگە دێنێتەوە، کە یەکێك لەبارەی گۆرانییەك لێی پرسیوە،کە دەفو شمشاڵی لەگەڵ دایە، ئەویش گوتوویەتی: (...والأجماع علی تحریم ذلك).

واتە: یەکدەنگیی هەیە لەسەر قەدەغەبوونی ئەوە.

جا کەسێك،کە تەنیا کتێبەکەی (إبن قیم الجوزیة) بخوێنێتەوە، وادەزانێ، کە (ابن الصَّلاح) هەرچی جۆری گۆرانییە، بە قەدەغەی دەزانێ!

---

١) ج١، ص ٢٢٨.

بەلاّم ، ئەگەر تەماشای دەقی فەتوایەكی (ابن الصلاح) بكەین، جیاوازی زۆر دەبینین لەنێوان قسەكەی (ابن الصلاح)و ئەو قسەیەدا،كە (إبن القیم) پاڵی دەداتە لای! چونكە ئەو پرسیارەی ئاڕاستەی (ابن الصلاح) كراوەو، ئەویش ئەو وەلاّمەی داوەتەوە،كە (إبن القیم) لێیەوە نەقڵ كردوە، بەم شێوەیە:

(غِناءُ أَمْرَدٍ دلق بحضور نساءٍ أجنبّيات تُخالطُ الرِّجال مع رقصٍ وتَصفيقٍ وتصويب الرؤس نحو النساءِ والأمْرد) (فتاوى ابن الصلاح الشهرزوري)ج٢ ص٥٠٠ برقم: ٤٨٨.

واتە: (گۆرانیی گوتنی گەنجێكی بێ مووی لووسكە، بە ئامادەبوونی ئافرەتانی بێگانەی تێكەڵ بە پیاوان لەگەڵ شاییو چەپڵەو سەرلەقاندن بەرەو ئافرەتەكانو گەنجە بێ مووەكە).

ئاشكراشە، كە ئەم پرسیارە وەلاّمەكەی لەلای هەموو زانایان هەرئەوەیە،كە (ابن الصلاح) گوتوویەتی، ،بەلاّم بێگومان ئەوەی (إبن قیم) هێناویەتی لەشێوەی پرسیاركردنەكە، لەگەڵ ئەوەی ئاراستەی (ابن الصلاح) كراوە، جیاوازییان زۆر زۆرەو، هیچ گومانیشی تێدانیە،كە زانای پێیەبەرز (إبن قیم) بە پاڵنەری دەمارگیرییو سواری ئەسپی عاتیفەو سۆزبوون -لەم مەسەلەیەدا- تووشی ئەو هەڵوێستە هەڵەیەی بووەو، ئەو مەسەلەیەی بەوجۆرە شێواندوەو دەستكاریی كردوە[1].

دوو: (الغزالي أبو الفتوح، أحمد بن محمد بن محمد، مجدالدين)،كەبرای (أبو حامد الغزالي)یە لە كاردانەوەی ئەو سەختگیرییو وشكییو بەزایەدان (تفريط)ەی،كەسانی وەك (إبن القيم)دا، ئەویش خۆی دووچاری تێپەڕاندن (إفراط) كردوەو، كتێبێكی لە بەرپەرچدانەوەی ئەو جۆرە كەسانەدا نووسیوە بە ناوونیشانی: (بوارق الألماع في تكفير من يُحرِّم مطلق السَّماع)، واتە: هەموو

١) بڕوانە: (الغناء والمعازف في الأعلام المعاصر) ص٢٤٤.

ئەوانەی،کە بەگشتیی گۆرانیی‌و مۆسیقا بە حەرام دەزانن بە کافری داناون، کە بێگومان ئەم هەڵوێستەش سەرچاوەکەی گرژیی (تشنّج) و دەمارگیریی‌یەو، کاردانەوەی هەڵوێستی لایەنی بەرانبەرە، وادیارە ئەم یاسا فیزیاییە (بۆ هەموو کارێك کاردانەوەیەك هەیە،کە لە ئەندازەدا بارتەقایەتی‌و لە ئاراستەدا پێچەوانەیەتی)، لە ژیانی بەشەریشدا هەر ڕاستە.

بەڵام بێگومان ئەو دەمارگیریی‌و گرژیی‌یە لە بواری هەڵس‌وکەوت لەگەڵ مەسەلە خیلافییەکاندا، شتێکی هەڵەو بێ جێیەو پێشەواو زانایانی ڕۆچوو و متمانە پێکراوی ئیسلام، لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون،کە ئەو بابەت‌و مەسەلانەی ڕاجیایی‌و مشت‌ومڕیان تێدایەو، دەقەکانی قورئان‌و سوننەت بە شێوەیەکی وا لەبارەیانەوە نەدواون،کە بواری قسە تێکردنیان نەبێ، دروست نیە هیچ کەس بەو هۆیەوە، ڕەخنە لەوی دیکە بگرێ‌و نکووڵیی لێ بکات، بەڵکو دەبێ سینگ فراوانانەو تەبایانە، پێکەوە هەڵس‌وکەوت بکەن‌و هیچ کامیان لایەنی بەرانبەر، بەهۆی ڕاجیایی‌یەکەوە تۆمەتبار نەکات.

ئێستاش با لەوبارەوە قسەو بیروڕای هەندێك لە زانایان ببیستن:

١- أبو حامـد الغـزالي :

لە باسی: (فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپە) لە کتێبی (إحياء علوم الدين)دا لەبارەی یەکێك لەپێی‌یەکانی (الحِسْبة)وە،کە بەمانای (فەرمان بەچاکەو نەهی لە خراپە) دێ، گوتوویەتی[1]: (أن يكون المنكر المُحْتَسَبُ فيه منكراً معلوماً بغير اجتهاد، فكلّ ماهو محلّ الأجتهاد فلا حسبة فيه، فليس للحنفيِّ أن

---

١) ج٢، ص٣٢٤.

يُنْكِرَ على الشافعيِّ أكله الضَّبْعَ ومتروك التسمية، ولا للشافعي أن يُنْكِرَ على الحنفيِّ نِكاحَهُ بغير وليٍّ وشربهُ النَّبيذ الذي ليْسَ بمُسْكِرٍ وجلوسَها في دارٍ أخذها بِشُفْعَةِ الجوار ونحو ذلك....)

واتە: دەبێ ئەو خراپەیەی،کە فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپەی تێدا ئەنجام دەدرێ، خراپەیەکی ئاشکراو زانراوبێ بەبێ ئیجتیهاد، چونکە هەرشتێك جێگای کۆشش کردن بێ، فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپەی تێدا نیە، بۆ نموونە:

بابای حەنەفی مەزهەب، بۆی نیە ڕەخنە لە شافیعی مەزەبێك بگرێ، بەهۆی خواردنی (کەمتیار)و سەربڕاوێك،کە (بسم الله)ی لەسەر نەکراوە، هەروەها بۆ بابایەکی شافیعی مەزەب نیە،کە ڕەخنە لە حەنەفیی‌یەك بگرێ بەهۆی ژن مارەکردنی بەبێ سەرپەرشتیارو، خواردنەوەی خۆشاوێك،کە سەرخۆشکەر نیەو، نیشتەجێ‌بوونی لە خانوویەکداکە بەهۆی (شفعة الجوار)ەوە چنگی،کەوتوە.

(شفعة الجوار)یش بریتیە لەوە،کە دراوسێ بەحوکمی دراوسێیەتییەوە، مافی زیاترە لە خەڵکی دیکە بۆ کڕینی خانووی دراوسێیەکەی، هەرکات ویستی بیفرۆشێ[1].

٢- النـووي:

ئەمیش لەوبارەوە گوتوویەتی:

(أمّا المختلف فيه فلا إنكار فيه، لأنَّ على أحدِ المذهبين: كلُّ مجتهدٍ مُصيب، وهذا هو المختار عند كثير من المحققين أو أكثرهم، وعلى المذهب الآخر: المصيبُ واحدٌ والمُخْطيءُ غير متَعَيِّنٍ لنا والأثم مرفوع عنه)[2].

واتە: بەڵام ئەوەی،کە ڕاجیایی تێدایە، ئەوە ڕەخنەی تێدا نیە، چونکە بەپێی یەکێك لە دوو ڕایەکان هەموو کۆششکەرێك پێکاویەتی، ئەمەش هەڵبژێرراوی

---

١) المعجم الوسيط، ص ٤٨٧.

٢) شرح صحيح مسلم، ج٢ ص٣٢.

زۆرێك، یان زۆربەی لێکۆڵەرەوانــە، بــەپێی ڕایەکــەی دیکــە، هــەق پێکــــەر یــەکێکە،بەلاّم بەهەڵەداچوو بۆ ئێمە دیار نیەو گوناهباریش نیە.

٣- ابـن رجــب الحنبلـي :

ئەمیش هەرلەوبارەوە گوتوویەتی: (والمنكر الذي يجب إنكارهُ: ماكان مُجْمعَاً عليه فأما المختلف فيه، فمن أصحابنا من قال: لايجب إنكارهُ علـى مَـنْ فعلـهُ مجتهـداً فيـه أو مقلـداً لمجتهـد تقليـداً سـائغاً، واسـتثنى القاضـي في (الأحكـام السلطانية) ما ضَعُفَ فيه الخلاف وكان ذريعة الى محظـور متفـق عليـه كنكـاح المُتْعة فأنه ذريعة الى الزنى).

واتە: ئەو خراپەیەی،کە ڕەخنەلێگرتنیو نەهێشـتنی پێویسـتە ئەوەیە،کـە یەکدەنگیی لەسەربێ، ،بەلاّم ئەوەی ڕاجیایی تێدابێ، هەنـدێك لـە هاوەلاّنمـان گوتوویانە: کەسێك،کە بـە کۆشـشـکردنەوە کردبێتـی، یـان بـە شـوێنکەوتنی کۆششـکەرێك،کە شوێنکەوتنی ڕەوابێ، ئەوە ڕێگریی لێکردنی پێویسـت نیـە، ،بەلاّم قازی لە کتێبی (الأحكام السلطانية)دا ئەوەی هەڵاواردوە،کـە ڕاجیـایی یەکی بێهێزی تێدایەو هۆکاری ئەنجامدانی گوناهێکی واشە، کە زانایان لەسەری ڕێککەوتوون، وەك نیکاحی موتعە، کە بیانوو و هۆکاری زینایە.

٤- ابـن تيميـــة :

ئەمیش لەوەلاّمی،کەسێکدا،کە پرسیاری لێکردوە لەبارەی حوکمڕانێکەوە،کە لەبواری کڕینو فرۆشتن، یان شەریکایەتیدا مەزهەبێك، یان ڕایەکی دیاریکراوی هەیە، ئایا بۆی هەیە،کە خەڵکی بەو مەزهەبو ڕایەی خۆیەوە پابەند بکاتو، لە مامەڵە کردن بەگوێرەی مەزهەبەکانیان قەدەغەیان بکات؟! گوتوویەتی[1]:

(ليْسَ له منع الناسِ من مثل ذلك ولا من نظائرهِ مِمّا يَسوغُ فيه الأجتهادُ وليس معه بالمنع نص من كتاب ولا سنة ولا إجماعٍ... إن هذه المسائل الأجتهادية لاتنكرُ باليد ولَيْسَ لأحدٍ أن يُلْزِمِ الناس باتباعه فيها، ولكن يتكلم

١) مجمع الفتاوى، ج٣ ص٧٩-٨٠.

فيها بالحُجَجِ العلمية، فمن تَبيَّن له صحة أحد القولين تَبِعَهُ، ومن قلَّدَ أهْل القول الآخر فلا إنكار عليه) .

واته: بۆی نیه خەڵك لە شتی ئاواو لە هاووێنەکانیشی قەدەغەبکات، مادام ئیجتیهادی تێدا دروست بێو، هیچ بەڵگەیەکی لە قورئانو سوننەتو ئیجماعی بۆ ئەو ڕێگرتنەی بەدەستەوە نەبێ... ئەو مەسەلە ئیجتیهادییانە ناگونجێ بەدەست پێشگیرییان لێ بکرێو هیچ کەسیش بۆی نیە، کە خەڵکی مولزەم بکات بە شوێنکەوتنی تێیاندا، بەڵکو دەبێ بەبەڵگەی زانستیی قسەیان لەبارەوە بکرێ، هەرکەسێکیش ڕاستی یەکێك لە دوو قسەکانی بۆ دەرکەوت شوێنی دەکەوێو، ئەوەش کە پەیڕەویی لە خاوەنی قسەکەی دیکە دەکات، نابێ ڕەخنەی لێ بگیرێ.

٥- الشَّوكاني :

ئەمیش لەبارەی ڕەوانەبوونی نکوولیی کردنەوە، لە بابەتە خیلافییەکاندا گوتوویەتی[1]:(اذا تقرَّر هذا تبيَّن للمنصف العارف بكيفية الأستدلال، العالم بصفة المناظرة والجدال أن السَّماعَ بآلةٍ وبغيرها من مواطن الخلاف بين أئمة العلم ومن المسائل التي لاينبغي التشديد في النكير على فاعِلِها...).

واته: ئێستا، کە ئەمە دەرکەوت بۆ بابای بەویژدانی شارەزا بە چۆنیەتی بەڵگە هێنانەوەو، زانا بەشێوازی وتو وێژو شەڕە قسە ڕوونبۆوە،کە گۆرانیی گوتن، چ بە ئامێرەوەو چ بەبێ ئامێر، لە مەسەلە خیلافییەکانی نێوان پێشەوایانی زانستەو لەوبابەتانەیە،کە ناگونجێ سەختگیریی لە نکوولیی لێکردنی بکەرەکەیدا بکرێ..

---

١) (إبطال دعوى الإجماع)، ص١٨.

## باسی پێنجـەم: زانایانی پێشـین لەبارەی گۆرانیی و مۆسـیقاوە هـەڵوێسـتیان نەرمتـر بووە لەوانەی پاشـین.

باشترین‌و ڕوونترین بەڵگەش لەوبارەوە ئەوەیە،کە ناوی ژمارەیەك لە هـاوەڵان‌و شوێنکەوتوان‌و قاضـی‌یـەکان‌و قورئـان خوێنـانی نـاودار، لـە چـەند بڕگەیەکـدا ڕیزیکەین،کە گوێیان لە گۆرانیی، یان گۆرانیی‌و ئامێرەکانیشی گرتوە:

### ١- هـاوەڵان ( الأصـحاب ) :

(الشوكاني) لە نامیلکەی (إبطال دعوى الإجماع)و کتێبـی (نَيْـلُ الأوطـار)دا، ناوی ئەم هاوەڵانەی هێناوە،کە گوێیان لە گۆرانیی، یـان گـۆرانیی‌و ئامێرەکـانی گرتوە[1]:

١- عمر بن الخطاب.

٢- عثمان بن عفان.

٣- سعد بن أبي وقاص.

٤- عبدالله بن جعفر بن أبي طالب.

٥- عمرو بن العاص.

٦- البراء بن مالك.

٧- أبو مسعود الأنصاري.

٨- أبو عبيدة بن الجراح.

٩- بلال بن رباح.

١٠- عبدالله بن الأرقم.

---

١) (نيل الأوطار)، ج٨، ص ١٠٦، دیارە (الشوكاني) لە (ابن النحوي) هێناویەتی، بەڵام لە سیاقی قسەکانیەوە دیارە، کە قەناعەتی پێیەتی.

١١- أسامة بن زيد.

١٢- حـمزة بن عـبدالمطلب.

١٣- عائيشة بنت أبي بكر الصديق.

١٤- الرُّبيِّع بنت المعوِّذ.

١٥- عـبدالله بن الزّبير.

١٦- المغيرة بن شعبة.

خوا لە هەموو لایەکیان ڕازی بێو ڕازیشیان بکات.

## ٢- شـوێنکەوتـوان ( التـابعيـن ) :

هەروەها (الشوكاني) ناوی ئەم زانایانەشی هێناوە لە چینی شـوێنکەوتوان،کە گوێیان لە گۆرانیی گرتوە، چ بەئامێرەوەو چ بەبێ ئامێر[1]:

١- سعيد بن المسيِّبْ.

٢- سالم بن عمر بن الخطاب.

٣- خارجة بن زيد.

٤- شُريح القاضي.

٥- سعيد بن جُبير.

٦- عـامر بن شراحيل الشعبـي.

٧- عـبدالله بن أبي عـتيق.

٨- عطاء بن أبي رباح.

٩- محمد بن شهاب الزّهري.

١٠- عـمر بن عـبدالعزيز.

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو و بەرگ و لاپەڕە.

١١- سعد بن إبراهيم النحوي.

### ٣- قازییەکان ( القضاة ) :

هەروەها ئەمەش ناوی ژمارەیەك لە قازییەکانە لە زانایانی پێشین، لەو بوارەدا[1]:

١- القاضي عبدالعزيز بن عبدالمطلب قاضي المدينة أو مكة.

٢- القاضي شريح بن يوسف الكندي، قاضي المدينة المنّورة.

٣- قاضي البصرة، عبدالله بن حسن العنبري.

٤- قاضي بغداد وشيخ الشافعي، المتحدِّث: الزُّهري إبراهيم بن سعد.

شایانی باسە خاوەنی (تأريخ بغداد) لەبارەیەوە گوتوویەتی[2]:

(وقد روى له البخاري ومسلم والجماعة وقد حَلَفَ ألاّ يُحدِّثَ ببغداد الاّ بعد الغناء والضرب بالعود)، واتە: بوخاریو موسلیمو ئەوانی دیکەش فەرموودەیان لێ گێڕاونەوە و، سوێندی خواردبوو، کە لە بەغدا فەرمایشتان نەگێڕێتەوە، مەگەر پاش گۆرانیی گوتنو عود لێدان.

٥- القاضي أبو مروان، محمد بن عثمان بن خالد، نزيل مكة المكرمة.

٦- القاضي أبوبكر الباقلاني، رئيس الأشاعرة.

### ٤- فەرمووده ناسان ( المحدِّثين ) :

هەروەها لە فەرمایشت ناسانیش، ژمارەیەکیان شۆرەتیان بەوە ڕۆیشتوە، کە گوێیان لە گۆرانییو ئامێرەکانی گرتوە[3]:

١- الأمام الزهري شيخ الشافعي، إبراهيم بن سعد، كە ساڵی (١٨٤)ی کۆچی

---

١) (الغناء والمعازف في الأعلام المعاصر)، ص٢٦٣ -٢٦٦.

٢) تأريخ بغداد، ج٦، ص.٨١

٣) (المعازف والغناء في الأعلام المعاصر)، ص٢٦٦-٢٦٧.

کۆچی دوایی کردوەو، پێشتریش لەگەڵ قازییەکاندا ناومان هێناوە.

٢- یوسف بن یعقوب الماجشون، کە لە ساڵی (١٨٥)ی کۆچی‌دا وەفاتی کردوەو (الذهبي) لەبارەیەوە گوتوویەتی[1]: (قال ابن معين كنا نأتي يوسف بن الماجشون يُحدِّثُنا وجواريه في بيت آخر يَضْرِبن بالمعزفة، روى له البخاري ومسلم والترمذي والنسائي وابن ماجه القزويني) واتە: (ابن مُعين) گوتوویەتی: ئێمە دەچووینە لای یوسفی کوڕی ماجشۆن فەرموودەی بۆ دەگێڕاینەوە، کەنیزەکەکانیشی لە ژوورێکی دیکەدا دەفیان لێدەدا، بوخاریو موسلیمو تیرموذییو نەسائیو ئیبنو ماجەی قەزوێنی فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە.

٣- يعقوب بن دينار أو ابن ميمون، کە ساڵی (٢٢٠) کۆچی دوایی کردوەو (الذهبي) لەبارەیەوە گوتوویەتی[2]:

(كان يُعلِّم الغناءَ ويتَّخذ القينات، ظاهرٌ أمرهُ... وله في الكتب الستة، وقلّما روى، ولم يُضَعَّفْ) واتە: گۆرانیی فێری خەڵك دەکردو، کە نیزەکی گۆرانیی بێژی ڕادەگرتو حاڵی ئاشکرابوو... وە لە شەش کتێبەکانی فەرموودەدا، فەرموودەی لێ گێڕراونەوەو بەدەگمەن فەرموودەی گێڕاونەوە و، بە بێهێز دانەنراوە.

## ٥- قورئان خوێنان ( القرّاء ):

لەنێو ئەمانیشدا دەتوانین لەوبارەوە ئاماژە بەدوو نموونەی زەق بکەین:

١- حسن بن أحمد بن محمد بن سليمان العبّاسي الحويزي، کە لە ساڵی (٥٧٣)دا کۆچی دوایی کردوەو (الزبيدي) لەوبارەیەوە گوتوویەتی[3]:

---

١) (سِيَرُ الأعلام النّبلاء)، ج٨، ص ٣٧١-٣٧٢.
٢) سەرچاوەی پێشوو، ج٥، ص٣٧٠.
٣) (تاج العروس)، ج١٥، ص١٢٦.

(نَشَأَ ببغداد وقرأ بها القرآن بالرِّوايات على أبي كرم الشهرزوري وسمِعَ منه ومن أبي القاسم السَّمرقندي، وكان يَعْرِف الموسيقى، وهو شاعرٌ محدِّثٌ مقريءٌ سكن واسط الى أن مات بها) واتە: لە بەغدا پێگەیشتوەو بەهەموو شێوە خوێندنەکان قورئانی لەلای ئەبوو کەرەمی شارەزووریی خوێندوە، فەرموودەی لەویش‌و لە ئەبوولقاسمی سەمەرقەندییش بیستوە، مۆسیقای دەزانی‌و شاعیرو فەرموودەناس‌و قورئان پێخوێن بوو، ،هەتا کۆچی دوایی کردوە لە (واسط) نیشتەجێ بووە.

٢- الشيخ محمد رفعت، کە لە ساڵی (١٣٦٩) کۆچی دوایی کردوەو (الزِّركلي) لەبارەیەوە گوتوویەتی[1]:

(أشهر القُرّاءِ في العصر الأخير وأعلم قرّاءِ مصر بمواضع (الوقف) من الآيات.... وكانت له معرفة بألحان الموسيقى) واتە: ناودارترین قورئان خوێنی ئەم چاخەی دواییە، زاناترین قورئان خوێنانی میصرە بە شوێنەکانی وەستان لە ئایەتەکاندا.... شارەزایی بەئاوازەکانی مۆسیقا هەبوو..

کەواتە:

وەك بینیمان زانایانی پێشین لە مەسەلەی گۆرانیی‌و مۆسیقادا کراوەتر بوون‌و، کەمتر سەختگیریی‌یان کردوە لەوانەی پاشین، ئنجا، ئەگەر یەکێك بپرسێ هۆکاری ئەو جیاوازییە چی‌یە لە هەڵوێستی زانایانی پێشین‌و پاشیندا؟!

دەتوانین بڵێین چوار خەسڵەت‌و هەڵوێست لە زانایانی پاشیندا بوونەتە هۆکاری ئەو جیاوازییە،کە ئەمانەن[2]:

١- ڕەچاوکردنی دووربینی (إحتياط) لەجیاتی ئاسانکاریی (التيسير).

٢- فریوخواردن بە فەرموودەی بێهێزو بەناو فەرموودەی هەڵبەستراو.

١) (الأعلام)، ج٧، ص.٩١

٢) (فقه الغناء والموسيقى في ضوء القرآن والسنة)، ص ١٥٣- ١٥٦.

٣- فشاری واقیعی هەڵەو لادەرانەی گۆرانییو مۆسیقا، چ لەلایەن بۆ بەندوبارانو، چ لەلایەن هەندێك لە شوێنکەوتوانی سەرگەردانی تەصەووفەوە.

٤- بەئاسانی بەکارهێنرانی وشەی قەدەغە (حرام) لەلایەن زانایانی پاشینەوە، بێئەوەی بەڵگەیەکی ڕوونو بێ چەندوچوون هەبێ.

جا با بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی زانایانی پێشین، لەبارەی دووربینی کردنیان لە بەکارهێنانی وشەی قەدەغەدا، سەرنجی دوو قسەی دوو لە پێشەوایانی بەرجەستەی مسوڵمانان بدەین:

یەکەم: (مالك) - ڕەحمەتی خوای لێ بێ- لەوبارەوە گوتوویەتی:

(ولم يكن من أمر الناس ولامَنْ مضى من سَلَفِنا الذين يُقْتَدى بهم ومُعَوَّلُ الأسلام عليهم أن يقولوا: هذا حلال وهذا حرام! ولكن يقول أنا أكرهُ كذا وأرى كذا...)[1].

واتە: عادەتی خەڵكی مسوڵمانو ئەوانەی پێشینمان،کە دەكرێنە سەرمەشقو ئەهلی ئیسلام پشتیان پێدەبەستن، ئەوەنەبوو کە بڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە! بەڵکو یەکیان دەیگوت: من ئەوەم پێ پەسندنیەو ڕام بەم جۆرەیە..

دووەم: (شافعي) - ڕەحمەتی خوای لێبێ- لەبارەوە گوتوویەتی:

(أدركتُ مشايخنا من أهل العلم يكرهون في الفتْيا أن يقولوا: هذا حلالٌ وهذا حرامٌ، الاّ ماكان في كتاب الله عزوجل بَيِّناً بلا تفسير)[2].

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو و بەرگو لاپەڕە.

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو و بەرگو لاپەڕە.

واتە: ئەو مامۆستایانەمان لە خاوەنانی زانست، کە بینیومانن، دەمدی پێیان ناخۆش بوو، کە لەکاتی فەتوادانداا بڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە! ، جگە لەوەی،کە لە کتێبی خوادا - عزّ وجلّ - بەبێ تەفسیر ڕوونو ئاشکرابێ.

کەواتە:

هەرکات بەجیددی چاو بەم چوار خەسڵەتو هەڵوێستەدا گێڕرایەوە، ئەوکاتە دەگەینەوە هەمان هەڵوێستی زانایانی پێشینمان، لەبارەی گۆرانییو مۆسیقاوە.

ئنجا گومانیشی تێدا نیە،کە:

یەك: ڕەچاوکردنی ئاسانکاریی، یەکێکە لە بنەما گەورەکانی شەریعەت، وەك خوا - عزّ وجلّ- فەرموویەتی: ﴿...يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ...(١٨٥) البقرة﴾، واتە: خوا ئاسانی بۆتان دەوێو نایەوێ لەسەرتان قورس بکات!

دوو: زانایانی ئیسلام لەسەر پشت نەبەستن بە فەرموودەی بێهێز لەبواری حەڵاڵو حەرامدا، یەکدەنگن، وەك لە بەشی دووەمدا خستمانە ڕوو.

سێ: وەك پێشتر لە بەشی دووەمدا خستمانەڕوو، دروست نیە لەکاردانەوەی هەڵەو لادانی هەندێك کەسدا، شتێکی ڕەوا (مباح) لە خەڵکی قەدەغە بکرێ، بەڵکو پێویستە هەڵەو لادانەکە چارەسەر بکرێ.

چوار: بەبێ دەقێکی ڕوونو ڕاشکاوی قورئانو سوننەت، دروست نیە هەر لەخۆوە لیستی حەڵاڵو حەرام بۆ خەڵکی دیاری بکەین، وەك هەر لە بەشی دووەمدا باسمان کردوە.

دیارە هەربۆیەش زاناو پێشەوایانمان گوتوویانە:

(وكلُّ خيرٍ في اتباع مَنْ سلف وكلُّ شرٍّ في ابتداع مَنْ خَلَفَ).

واتە: هەموو بەرژەوەندیی‌و چاکەیەك لە شوێنکەوتنی پێشینان‌و، هەموو خراپەو زیانێکیش لە داهێنانی پاشینانداییە.

## باسی شەشەم: هیچ زانایەك بەرەهایی و بێ مەرج و بەند، گۆرانیی و مۆسیقای بەڕەوا دانەناوە:

گەلێك جاران لەیەك حاڵی نەبوون دەبێتە مایەی گرفت‌و کێشەی گەورە، لێرەشدا لەیەك حاڵی نەبوونی هەردوولای بەقەدەغەدانەرو بەڕەوا دانەری گۆرانیی‌و مۆسیقا، گرفت‌و کێشەی زلی دروست کردوە، چونکە بەقەدەغەدانەرەکان دێنن بەڵگە بە گۆرانیی‌و مۆسیقای خراپ‌و زیانبەخش دێننەوە، لەحاڵێکدا، کە ئەوە خاڵی هاوبەشی نێوان هەردوولایەو، هیچ کەس ناڵێ هەموو جۆرە گۆرانیی‌و مۆسیقایەك ڕەوایە!

بەڵکو ئەو زانایانەی،کە دەڵێن: (بناغە لە گۆرانیی‌و مۆسیقادا حەڵاڵبوونە) (الأصل في الغناءِ والموسيقى الحِلِّية) چوار مەرجیان داناون بۆ بەڕەوا زانینی گۆرانیی‌و مۆسیقا، کە ئەمانەن:

١- دەبێ ئەو گۆرانیی‌و سروودو مۆسیقایە شتی ناشەرعیی تێدا نەبێ:

بەڵێ، یەکەمین مەرجی ڕەوایی گۆرانیی‌و سروودو مۆسیقا ئەوەیە،کە هیچ شتێکی تێدا نەبێ، کە ناشەرعیی بێت، چ لە ڕووی عەقیدەوە، چ لەڕووی ئەخلاقەوە، چ لە ڕووی یاساکانەوە.

کەواتە: هەرکاتێك گۆرانیی‌و مۆسیقایەك وشەو تەعبیرێکی تێدابوو، کە پێچەوانەی عەقیدەی ئیسلامیی بوو، بۆ نموونە: بانگەشە بۆ شیرك وەك: دینمان ئایینمان هەر نیشتیمان، یان پێچەوانەی ئەخلاق‌و ئەدەبی ئیسلامیی بوو، بۆ نموونە: بانگەشە بۆ بێبەندوباریی‌و بەرهەڵدایی، یان پێچەوانەی یەکێك لە

حوکم‌و یاساکانی ئیسلام بوو، بۆ نموونە: خەڵك هاندان بۆ زینا، یان مەیخۆریی... ئەوە بەحەرامدادەنرێ...

٢- نابێ ئەو گۆرانیی‌و مۆسیقایە شتێکی قەدەغەی ڕەگەڵ بخرێ:

جاری وایە خودی گۆرانیی‌و مۆسیقایەك ڕەوایە،بەلاّم شتێکی قەدەغەی لەگەڵ ئاوێتە دەکرێ، وەك مەیخۆریی، یان پێکەوە هەڵپەڕینی ژن‌و پیاو (ڕەشبەڵەك)، یان خۆڕازاندنەوەو ڕووتکردنەوەی ئافرەتان...

دیارە لەم حاڵەتەشدا بەهۆی تێکەڵبوونی ئەو قەدەغەکراوانەو، کرانی بە وەسیلە بۆ ئەو شتە قەدەغانە، ئەو گۆرانیی‌و مۆسیقایەش قەدەغە دەبێ، بەپێی بنچینەی: (للوسائل حکم المقاصد) و بنچینەی: (ما يُتَوصَّل به الى الحرام فهو حرام) وەك لە بەشی دووەمدا باسمان کرد.

٣- نابێ شێوەی گوتنی گۆرانیی‌و لێدانی مۆسیقایەکە هاندەربێ بۆ گوناهو ورووژێنەربێ بەرەو خراپە:

بەڵێ جاری واش هەیە خودی گۆرانیی‌و مۆسیقایەك ناشەرعیی نیە، ،بەلاّم شێوەی ئەنجامدانەکەی‌و هەڵس‌و کەوتی بابای گۆرانیی بێژو مۆسیقار، هاندان بۆ خراپەو ورووژاندنی تێدایە، کەدیارە لەم حاڵەتەشدا حوکمی ئەو گۆرانیی‌و مۆسیقا لەڕەواییەوە بەرەو ناپەسندیی (الکراهیة)و، بگرە جاری وایە قەدەغەبوون (الحُرْمَة)یش دەچێ!

٤- زێدەڕۆیی (إسراف) تێدا نەکردن:

بێگومان گۆرانیی‌و مۆسیقاش وەك هەر ڕەوا (مباح)ێکی دیکە، بەهۆی زێدەڕۆیی تێداکرانەوە قەدەغە دەبێ، وەك خواسی بەرزو مەزن فەرموویەتی:

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ وَلَا تُسْرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ٣١ ﴾ الأعراف.

هەروەها پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی:

(وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وتصدَّقوا والْبسوا في غيرِ إسرافٍ ولا مَخْيلة) رواه أحمد والنسائي وابن ماجه والحاكم عن عبدالله بن عمرو بن العاص وحسَّنه الألباني في صحيح الجامع الصغير وزيادته.

واتە: بخۆنو بخۆنەوەو خێر بکەنو بپۆشن، بەبێ زێدەڕۆییو فیزو کەشخە کردن.

(ابن المُقَفَّعْ)یش لەوبارەوە جوانی گوتوە: (ما رأيت إسرافاً الاّ وبجانبه حق مُضيَّعٌ).

واتە: هیچ زێدەڕۆیییەکم نەدیوە،کە مافێکی فەوتێنراوی لە پەنا نەبێ!

جا دیارە،ئەگەر زێدەڕۆیی کردن لە خواردنو خواردنەوەدا قەدەغەو خراپ بێت، بێگومان لە بواری خافلان (لهو)دا، بەتایبەتی گۆرانییو مۆسیقا، قەدەغەترو خراپتریشە، چونکە زیاتر،ئەگەری خراپەو پەلکێشکردنی بەرەو تاوانی تێدایە[1].

## باسی حەوتەم: بەڵگەکانی بەقەدەغە دانەرانی گۆرانیی ومۆسیقا بە گشتیی وبەرپەرچدانەوەیان[2]:

خوێنەری سەنگین!

هەرچەندە ئەوانەی گۆرانییو مۆسیقایان بەگشتیی بەقەدەغە داناوە، هەموویان یەك جۆرە هەڵوێستیان نیەو توندو توندترو نەرمیان لەنێودا هەیەو، وەك

---

١) بڕوانە: (فقه الغناءِ والموسيقى في ضوء القرآن والسنة) د. يوسف القرضاوي، ص ١٨٥-١٨٨. بە تۆزێك دەستکارییەوە

٢) شایانی باسە کە بۆ نووسینی ئەم باسە بەپلەی یەکەم سوودم لە کتێبی (الغناء والموسيقى في ميزان الأسلام)ی عبدالله بن يوسف الجديع، وەرگرتوەو قسەکردن لەسەر (سند)ی فەرمایشتەکانیش بەزۆری هەر هی ئەوە، بۆیەش لێرە بەگشتی ئاماژەم پێدا، تاکو پێویست بە ئاماژەکردنی بەردەوام بەسەرچاوە نەکات.

پێشتریش باسمان کرد، هەڵوێستەکەیان، تا ڕاددەیەکی زۆر، پەیوەندی بەکاردانەوەیانەوە هەیە بۆ گۆرانیی‌و مۆسیقا خراپ‌و زیانبەخش، کە هیچ زانایەك بەرەوای دانەناون! ،بەلاّم بەگشتیی لەوەدا هاوبەشن،کە گۆرانییی‌و مۆسیقا بەخراپ دەزانن، ،ئەگەر قەدەغەشیان نەکەن، بەلانی کەمەوە بە ناپەسندیان دەزانن.

جا من ئەوەندەی سەرنجی قسەی نەیارانی گۆرانیی‌و مۆسیقامداوە، حەوت جۆرە بەڵگەم کەوتنە بەرچاو، کە بۆ سەلماندنی ڕاستیی ڕایەکەیان‌و پشتڕاستکردنەوەی هەڵوێستەکەیان پەنایان پێبردوون.

جا ئێمە یەك بەیەك ئەو حەوت جۆرە بەڵگە دەخەینەڕوو، پاش خستنەڕووشیان، لە مەحەکیان دەدەین‌و هەڵیان دەسەنگێنین‌و، سەرەنجام دەیانپووچێنینەوەو هەڵیاندەوەشێنینەوە:

## جۆری یەکەمی بەڵگەکانیان: چەند ئایەتێکی قورئان :

باوترینی ئەو ئایەتانەش، کە بەناڕەوا دانەرانی گۆرانیی‌و مۆسیقا بەگشتیی بە بەڵگەیان دێننەوە، ئەم پێنجەن:

**یەکەم: ئایەتی یەکەم:** ﴿ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِ وَعِدۡهُمۡۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا... ﴿٦٤﴾ الإسراء ﴾.

واتە: - ئەی ئیبلیس!- هەرکەسێك،کە دەتوانی بەدەنگی خۆت لەوان لە خشتەی بەری، درێغی مەکە و سوارەو پێرۆی خۆتیان بەسەر وەربکە، لە سامان‌و منداڵاندا هاوبەشیان بەو گفتیشیان پێ بدە، هەرچەندە شەیطان ، جگە لە فریودانی، هیچ گفتێکی دیکەیان ناداتێ.

چۆنیەتی بەبەڵگە هێنانەوەشیان بۆ ئەم ئایەتە ئەوەیە،کە گوتوویانە:

بە بەڵگەی ئەوە،کە (مجاهد) لە تەفسیری: ﴿ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم

﴿ بِصَوْتِكَ ﴾دا گوتوویەتی[1]: (بالمزامير)، کەواتە: مەبەست لە دەنگی شەیطان، دەنگی گۆرانییو ئامێرەکانیەتیو، دیارە ئەمەش قەدەغەبوونیان دەگەیەنێ!

## هەڵسەنگاندن :

دەڵێین: بەڵگە هێنانەوە بەم ئایەتە لەسەر قەدەغە بوونی گۆرانییو مۆسیقا هەڵەیە، چونکە:

یەك: لەڕووی (سند)ەوە ڕاست نیە،کە (مجاهد) تەفسیری ئەو وشەیەی بەو شێوەیە کردبێ، ئنجا،ئەگەر گریمان ڕاستیش بێ، هەر بەبەڵگە ناشێ، چونکە:

١- وەك پێشتر لە بەشی دووەمدا گوتمان: بنچینەیەکی شەرعییە،کە: (قسەی زانایان بەڵگەی لەسەر دەهێنرێتەوەو بە بەڵگە ناهێنرێتەوە)، ئنجا بێگومان، تایبەتکردنی گشتیی (تخصيص العام)و بەندداركردنی ڕەها (تقييد المطلق)، تەنیا بە دەق (نصّ)ێکی قورئان، یان سوننەت دەکرێ، نەك قسەی (مجاهد)، بگرە هی هاوەڵانیش ئەوەی پێناکرێو، بگرە زۆرێك لە زانایان ڕایان وایە،کە تەنانەت سوننەتیش (عام)ی قورئانی پێ (تخصيص) ناکرێو، (مطلق)ەکەی پێ (تقييد) ناکرێ، منیش هەر ئەو ڕایەم پێ ڕاستو پەسندە وەك لە زنجیرە دەرسی: (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)دا ڕوونم کردۆتەوە[2].

٢- ئنجا (ابن جرير) هەر لە (مجاهد)ەوەو بە (سند)ێکی نێزیك لەوەی پێشوو هێناویەتی،کە وشەی: (بصوتك)ی بە (اللّعب واللهو)، یان (اللّهو والغناء) تەفسیر کردوە.

---

١) بڕوانە: (ذمّ الملاهي) أبن أبي الدنيا، رقم ٧٢.

١) لە تەفسیرو لێکدانەوەی ئایەتی ژمارە (١٨٠)ی سووڕەتی (البقرة)دا.

٣- هەروەها (ابن جریر) بەسەنەدێكی بێهێز لە (ابن عباس)ەوە هێناویەتی،كە گوتوویەتی: (صوته: كل داعٍ دعى الى معصية الله) واتە: دەنگی شەیتان هەر بانگەوازكارێكە،كە بەرەو سەرپێچی خوا بانگەشە دەكات.

٤- دیسان (ابن جریر) بە سەنەدێكی ڕاست لە (قتادة بن دِعامة الدَّوسي) تابیعییەوە هێناویەتی،كە گوتوویەتی: (بصوتك: أي بدعائك).

٥- (ابن جرير الطبري)یش پاش قسەو باسی زۆر لەبارەی تەفسیری ئەم ئایەتەوە گوتوویەتی: (وأولى الأقوال في ذلك بالصحة أن يقال: إن الله تبارك وتعالى قال لأبليس: واستَفْزِزْ من ذُرية آدم من استطعت أن تستَفِزَّهُ بصوتك، ولم يَخُصَّ من ذلك صَوْتاً دون صَوْت، فكل صوت كان دعاءً اليه والى عَمَلِهِ وطاعته وخلافاً للدعاء الى طاعة الله فهو داخلٌ في معنى صوتِهِ الذي قال الله تبارك وتعالى اسمُه له: ﴿ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ ﴾ [١].

واتە: نێزیكترین قسە لەڕاستییەوە لەوبارەوە ئەوەیە،كە بگوترێ: خوای بەرزو مەزن بە ئیبلیسی فەرمووە: هەركەسێك،كە دەتوانی لەوەچەی ئادەم بەدەنگت لەخشتەیان بەری، لەخشتەیان ببە، ئیدی خوا دەنگێكی تایبەتی دیاری نەكردوە، بۆیە هەردەنگێك بانگەشەبێ بۆلای ئەو و بۆلای كردەوەكەی و فەرمانبەریی كردنی و پێچەوانەی بانگەواز بۆ لای فەرمانبەریی خوا بێ، ئەوە لەجوغزی مانای ئەو دەنگەی دایە،كە خوای بەرزو مەزن پێی فەرمووە: (وە هەركەسێكت پێ لەخشتە دەچێ بەدەنگت لەخشتەی بەرە).

دوو: بێگومان دەنگ (صوت) لێرەدا لەبەر خودی خۆی زەمكراو (مذموم) نیە، بەڵكو لەبەر پاڵدرانیەتی بۆلای شەیطان، دەجا بەهەمان شێوە، گۆرانییو مۆسیقاش لەبەر خودی خۆیانو وەك دەنگی خۆش خراپو زەمكراو نین، بەڵكو لەكاتێكدا بەخراپ دادەنرێن،كە بۆ مەبەستێكی شەیطانیی بەكار بهێنرێن، بە بەڵگەی ئەوە،كە ناگونجێ بڵێین: لەبەر ئەوەی خوا عز وجل بەئیبلیسی

٢) (جامع البيان لتفسير القرآن) ج١٥، ص١١٨.

فەرمووە: هەرچی سوارەو پیادەت هەیە بەسەریان وەربکە (وأجلبْ عليهم بخيلك ورجلك)، کەواتە: هەموو سوارێك و پیێڕۆیەك خراپن!!

سێ: بە سەرنجدانی ڕواڵەتی ئایەتەکەو سیاقەکەیشی بەڕوونی دەزانرێ، کەمەبەست پێی ئەوەیە،کە: ئەی ئیبلیس! هەرچی هێزت هەیەو هەرچی چەکی هەتە بۆ گومڕاکردنی وەچەی ئادەم، بەکاری بێنەو هیچ دریغی مەکە.

دووەم: ئایەتی دووەم: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِى لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٦﴾ لقمان ﴾.

واتە: هەندێك کەس قسەی لەهوو دەکڕێ ،تاکو بەبێ زانیاریی، خەڵکی لە ڕێی خوا لابدات و گاڵتەی پێ بکات، ئا ئەوانە ئازارێکی ڕیسواکەریان هەیە.

بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی بە بەڵگەهێنانەوەی ئەم ئایەتەش لەسەر قەدەغەبوونی گۆرانیی و مۆسیقا، گوتوویانە: لە هەر کام لە (ابن مسعود وابن عمرو ابن عباس)ەوە هاتوە،کە مەبەست لە (لهو الحديث) لە ئایەتەکەدا گۆرانیی (غِناء)یە، بەڵکو (ابن مسعود) سوێندی لەسەر ئەوە خواردوەو گوتوویەتی: (هو والله الغناء) سوێند بەخوا گۆرانییە[1].

هەروەها (ابن جرير) لە (مجاهد)ەوە هێناویەتی،کە گوتوویەتی: (اللَّهو: الطَّبْلُ)[2]، واتە: لەهوو لێرەدا تەپڵە.

کەواتە: گۆرانیی و ئامێرەکانی خراپ و قەدەغەن، چونکە خوا هەڕەشەی لەوکەسانە کردوە،کە (لهو الحديث) دەکڕن،کە سزایەکی ڕیسواکەریان هەبێ!

---

١) (السنن الكبرى) للبيهقي، ج١٠، ص٢٢٣.

٢) تفسير الطبري، ج٢٨، ص١٠٥.

## هەڵسەنگاندن :

یەك: وەك پێشتر باسمان كرد، قسەو تەفسیری زانایان لە هاوەڵانو غەیری وانیش، ناگونجێ گشتییو ڕەها (عام و مطلق)ی قورئان، تایبەتو بەندار (تخصیص و تقیید) بكات، (لهو الحدیث)یش هەرجۆرە قسەیەك دەگرێتەوە،كە مرۆڤی پێ بخافڵێ، وەك پێشتر لەباسی یەكەمی ئەم بەشی سێیەمەدا چەمكو واتای وشەی (لهو)مان ڕوون كردەوە، كەواتە: (لهو) لەخودی خۆیدا ڕەوایەو، بەگوێرەی چۆنیەتیو ئامانجی بۆ بەكارهێنرانی حوكمەكەی دیاری دەكرێ.

دوو: ئایەتەكە پێویستە هەمووی پێكەوە فام بكرێو پچڕ پچڕ نەكرێ، دیارە هەر كەسێكیش (لهو الحدیث) -كە هەموو جۆرە لەهوویێك دەگرێتەوە، چ گۆرانییو چ فیلم، چ شانۆگەریی ،چ كتێبو نامیلكەو چیرۆكو ڕۆمان- بەكاربێنێ بۆ لەڕێی خوا لادانی خەڵكو گاڵتەپێكردنی ﴿...لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا ...﴾ (٦) لقمان، ئەوە بێگومان، نەك هەر كارێكی خراپو حەڕام، بەڵكو كوفریشی كردوە.

سێ: كەواتە: وادیارە مەبەستی (ابن مسعود) لە (لهو الحدیث) ئەو جۆرە گۆرانییو گاڵەگاڵو قسەو باسانە بووە،كە هاویەش بۆ خوا دانەرەكان دژایەتی ئیسلامو قورئانیان پێكردوون، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ (٢٦) فصلت، واتە: ئەوانەی بێبڕوان گوتیان: گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرنو گاڵە گاڵی تێدا بكەن، بەڵكو بەسەریدا زاڵبن!

## پوختـەی قسـان :

هەرکەسـێك (لهـو الحـديث) بکـڕێ لــە گـۆرانیی‌و مۆسـیقاو شـیعرو چـیرۆك‌و شانۆگەریی‌و فیلم، تاکو خەڵکی پێ لە ڕێی خوا لابدات‌و بیکاتە مایەی گاڵتەکردن بەئاییینی خوا، ئەوە حوکمەکەی دیارە،بەلاّم ، ئەگەر مەبەستی ئەوەنـەبێ، ئـەوە ئایەتەکە هیچ پەیوەندیی پێوە نیە.

**سێیەم: ئایـەتی سێیەم:** ﴿ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً... ﴿٣٥﴾ الأنفال ﴾.

واتە: نوێژەکەیان لەلای ماڵی خوا، جگە لەفیکەو چەپڵە چیدیکە نەبوو....

چۆنیەتی بە بەڵگە هێنانەوەی ئەم ئایەتەش لەسـەر قەدەغـەبوونی گـۆرانیی‌و مۆسیقا، لەلایەن بەقەدەغە دانەرانییەوە، ئاوایە:

دەڵێن: خوا لێرەدا بەهۆی فیکەو چەپڵە (المكـاء والتصـدية)وە، ڕەخنـەی لـە کافرەکان گرتوەو سەرزەنشتی کردوون، جا دیارە ، ئەگەر ڕەوا بوونایـە، لەسـەری سەرزەنشتی نەدەکـردن، ئنجا بێگومان گۆرانیی‌و ئامێرەکانی مۆسیقاش دەنگیان لە دەنگی فیکەو چەپڵە کاریگەرتریشە، بۆیە لەپێشـترن بۆ ڕەخنـەو سـەرزەنشت لە فیکەو چەپڵە!

## هەڵسـەنگـاندن :

ئێمەش دەڵێـین:

ئەم ڕستە قورئانییە، ناگونجێ بکرێتە بەڵگەی قەدەغەبوونی فیکەو چەپڵەش، چ جێی گۆرانیی‌و مۆسیقا، چونکـە:

ڕەخنە لێگران‌و سەرزەنشتکرانی کافرەکان بەهۆی خودی فیکەو چەپڵەوە نەبووە، بەڵکو لە سۆنگەی ئەوەوە بووە،کە کردوویانن بەنوێژو عیبادەت، وەك لە ڕواڵەتی

ئایەتەکەوە دیارە: ﴿ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ... ﴾، کەواتە: ئەوەی جێی ڕەخنەو مایەی سەرزەنشتە، فیکەو چەپڵە کردنە نوێژو خوا پەرستییە، نەك خودی فیکەو چەپڵە لێدان!

ئنجا هەندێك،کەسیش فەرموودەی: (التصفيق للنساء والتسبيح للرجال) متفق عليه عن أبي هريره، یان کردۆتە بەڵگەی تایبەتبوونی چەپڵە بەئافرەتانەوە، هەروەها گۆرانیی‌و مۆسیقاش، ،بەلاّم ئەوە ڕاست نیە، چونکە:

ئەگەر وابوایە، هاوەڵانی پیاو چەپڵەیان لێ نەدەدا بۆ ئاگادارکردنەوەی ئیمام، وەك لە فەرمایشتەکەدا هاتوە: (مالي رأيتكم أكثرتم من التصفيق؟ منْ رابَهُ شيءٌ في صلاتهِ فَلْيُسَبِّحْ) متفق عليه، واتە: ئەوە بۆچی دیتمن زۆرتان چەپڵەتان لێدەدا؟! هەرکەسێك گرفتێکی هەبوو لە نوێژەکەیدا، با (سبحان الله) بکات.

جا لەبەرئەوەی ئێمە لە بەشی حەوتەمدا باسی فیکەو چەپڵە دەکەین‌و، لەوێ زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەم مەسەلەیە، لێرە بەم ئەندازەیە لێی دەگەڕێین.

**چوارەم: ئایەتی چوارەم :** ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟ كِرَامًا ﴿٧٢﴾ الفرقان ﴾.

واتە: ئەوانەی،کە ئامادەی شتی درۆو گوناه نابن‌و، هەرکات بەلای (لغو)شدا ڕەتبوون بەڕێزەوە تێپەڕدەبن.

چۆنیەتی بە بەڵگە هێنانەوەی ئەم ئایەتەش لەسەر مەبەستی ناوبراو بەمجۆرەیە:

گوتوویانە: لە هەندێك لە پێشینەوە هاتوە،کە تەفسیری (الزّور)یان بە (الغناء) کردوە، (محمد بن الحنفية) گوتوویەتی: (الزّور) لێرەدا (الغناء واللّهو)یە، هەروەها ئەم تەفسیرە لە (الحسن البصري و مجاهد أبو الجحّاف)یش گێڕراوەتەوە، (الكلْبي)

لە تەفسیری: (لایشهدون الزور)دا گوتوویەتی: (لایحضرون مجالس الباطل) واتە: ئامادەی کۆڕەکانی باطیڵ نابن[١].

## هەڵسەنگاندن :

دەڵێین:

یەك: زانایانی فەرموودەناس گوتوویانە: سەنەدی سەرجەم ئەو قسانەی بەناوی ئەو زاناو پێشەوایانەوە هێنراون، بێهێز، یان،کەوتوو (ساقط)ە[٢]!

دوو: وشەی (الزّور) لەلایەن زانایانەوە تەفسیری دیکەشی بۆ کراون وەك: (الشرك، الكذب، المعاصي، أعياد المشركين، اللّعِب)، کەواتە:

مادام وشەی (الزّور) لە ئایەتەکەدا بەگشتیی هاتوەو، هەموو ماناکانی دەگرێتەوە، بۆمان نیە تایبەتی بکەین بەیەکێکیانەوە، ،ئەگەر ڕاستبێ هەموو ئەو مانایانەی هەبێ، کە من ڕام وانیە وەك تۆزێکی دیکە باسی دەکەین.

سێ: باوترینو دیارترین مانای وشەی (الزّور) بریتیە لە درۆ (کذب)، وەك لەم ئایەتانەدا دەردەکەوێ:

١- ﴿ ...فَٱجۡتَنِبُواْ ٱلرِّجۡسَ مِنَ ٱلۡأَوۡثَٰنِ وَٱجۡتَنِبُواْ قَوۡلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾ الحج ﴾.

٢- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٌ ٱفۡتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيۡهِ قَوۡمٌ ءَاخَرُونَۖ فَقَدۡ جَآءُو ظُلۡمٗا وَزُورٗا ﴿٤﴾ الفرقان ﴾.

١) (إغاثة اللّهفان...) ابن القيم، ج١، ص٢٦٠.
٢) (الغناء والموسيقى في ميزان الاسلام)، ص٧٧.

٣ - ﴿ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْ ۖ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدْنَهُمْ ۚ ...وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًا ۚ ...﴾ المجادلة ٢.

دیاره بە سەرنجدانی ڕواڵەتی ئایەتەکانو ئەو سیاقانەی تێیاندا هاتوون، بە ڕوونیی دیارە، کە مەبەست لە وشەی (زور) درۆو پێچەوانەی هەقو واقیعە.

(ابن جرير الطبري)یش لەپێناسەی وشەی (زور)دا گوتوویەتی: (تحسين الشيء ووصْفُهُ بخلاف صفتهِ حتى يُخَيَّلُ الى مَنْ يَسْمَعُهُ أو يراه أنه خلاف ما هو به)[١]

واتە: بریتیە لە ڕازاندنەوەو وەسفکردنی شتێك بە پێچەوانەی حەقیقەتەکەیەوە،تاکو ئەو کەسەی،کە دەیبیستێ، یان دەیبینێ پێی وایە، بەپێچەوانەی حەقیقەتی خۆیەوەیە.

(الفيروز آبادي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (والزّور: الكذب لكونه مائلاً عن الحق)[٢].

واتە: (الزّور) درۆیە، چونکە لەهەق لایداوە.

(أبوبكر بن العربي)یش لەوبارەوە گوتوویەتی:

(القول بأنه الكذب هو الصحيح... وأمّا القول بأنهُ الغناءُ فليس يَنْتَهي الى هذا الحدِّ)[٣].

واتە: ئەو قسەیە،کە دەڵێ (زور) بە مانای درۆیە، ئەوە ڕاستە... ، بەڵام ئەو قسەیەی،کە دەڵێ بریتیە لە گۆرانیی، وانیەو ناگاتە ئەو ڕاددەیە.

چوار: لە چەندان فەرمایشتی ڕاستدا چەسپاوە، کە پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی داوە گۆرانیی بگوترێو دەف لێبدرێو گوێیان لێ بگیرێ، بگرە جاری وابووە،کە

١) (تفسير الطبري)، ج١٩، ص٤٩.
٢) (بصائر ذوي التمييز)، ج٣، ص١٤٧.
٣) (أحكام القرآن)، ج٣، ص١٤٣٢.

فەرمانیشی پێكردوە وەك دوایی باسی دەكەین، ئنجا بێگومـان فەرمایشـتی خوا: (لایشهدون الزور)، بەر لە هەموو كەس، هاوەڵان (أصحاب) دەگرێتەوەو ئەوانیش دیارە، كە لە هەموو كەس پابەندتر بوونە بە قورئانەوە، جـا مـادام سەلمێنرا، كە ئەوان گوێیان لە گۆرانییو ئامێرەكانی گرتوە، كەواتە مەبەست لە (الزّور) لە ئایەتەكەدا گۆرانیی نیە.

## پێنجـەم: ئایـەتی پێنجـەم: ﴿وَأَنتُمۡ سَٰمِدُونَ ٦١﴾ النجم.

واتە: ئێوە خافڵاون، یان بێئاگان، یان گۆرانیی دەچـڕن.

چۆنیەتی بەڵگـەبوونی ئـەم ئایەتـەش لەسـەرئەوە،كە گـۆرانییو ئامێرەكـانی قەدەغـەن، ئەوەیە،كە (ابن عباس) گوتوویەتی بەزاری حیمـەیریی: (إِسْمدي لنـا: تَغنيّ لنا) واتە: گۆرانییمان بۆ بڵێ[1].

ئنجا مادام خوا -سـبحانە وتعـالى- وەسـفو پێناسـەی كـافرانی بـە وشـەی (سامدون) كردوەو، ئەمیش بەمانای گۆرانیی گوتنـدا، كەواتـە: گـۆرانیی گـوتن سیفەتی كافرانە!

## هەڵسـەنگانـدن :

لە وەڵامدا دەڵێیـن:

یـــەك: ،ئەگەر گریمان (سَمَدَ) بەمانای گۆرانیی گوتن (غنَّى)ش بێ، دەبێ مەبەست لەو گۆرانیییە، گۆرانیی كافران بێت، كە دژایـەتی قورئـانو ئیسـلامی پـێ دەكرێ، وەك لەسیاقی ئایەتەكاندا دیارە.

---

١) أخرجه ابن أبي الدنيا في (ذم الملاهي) والبيهقـي في السـنن وأبـو عبيـد في (فضـائل القـرآن) و عبدالرزاق في تفسيره، ج٢، ص٢٥٥، وابن جرير، ج٢٧، ص٨٢، وهو صحيح.

دوو: لەپێش ئەم ئایەتەدا ئەمە هـاتوە: ﴿ أَفَمِنْ هَٰذَا ٱلْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ النجم ﴾، واتە: ئایا سەرتان لەم فەرمایشـتە سووڕدەمێنێ و، پێدەکەنن‌و ناگرین و، ئێوە خافڵاون!

جا دیارە،ئەگەر ئایەتی ناوبراو بکرێتە بەڵگەی قەدەغەیی گۆرانیی، دەبـێ دوو ئایەتی پێشووشی بەڵگەی قەدەغەیی سەرسام بـوون‌و پێکـەنین بـن! دیـارە هـیچ کەسیش وای نەگوتوەو ناشگونجێ وابگوترێ!

کـــەواتە: هیچ کام لەو پێنچ ئایەتە، کە بە قەدەغەو خراپ دانەرانی گۆرانیی‌و مۆسیقا بە بەڵگەیان هێناونەوە، بۆ ئەو مەبەستە بە بەڵگـە ناشـێن‌و، سـەرەنجام دەتوانین بەڕوون‌و ڕاشکاویی بڵێین: هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نیە بگونجـێ بکرێتـە بەڵگەی قەدەغەبوونی گۆرانیی‌و مۆسیقا.

کەواتە، کە زانیمان حـاڵی جـۆری یەکـەمی بەڵگـەکانی بەقەدەغــە دانـەرانی گۆرانیی‌و مۆسیقا چۆنە! با بچینە سۆراغی جۆری دووەمی بەڵگەکانیان:

## جۆری دووەمی بەڵـگەکـانی بە قەدەغە دانەرانـی گـۆرانیی و مۆســـیقـا : چەند دەقێکــی ســوننـەت :

جۆری دووەمی بەڵگەکانی بە قەدەغەدانەرانی گۆرانیی‌و مۆسیقا، چەند دەقێکی سوننەتی پێغەمـبەری خوان ﷺ .

جا دیارە لەوبارەوە زۆر شت بە بەڵگە هێنراوەتەوە،بەڵام ئـەو دەقانەی،کـە بـە سوننەتدانراون‌و بۆ ئەو مەبەستە پشتیان پێبەستراوە، تەنیا دوازدە(١٢)یـان لـە مەحەکی زاناو شارەزایانی فەرمووودەناسیی دەرچوون، ئـەوانی دیکـە، یـان هـەر

هەڵبەستراو (موضوع) بوون، یان زۆر بێهێزو پێز بوون‌و، هی ئەوە نەبوون بە بەڵگە بهێنرێنەوە.

ئێستاش یەك بە یەك سەرنجی ئەو دوازدە فەرمایشتە دەدەین، داخۆ چۆن چۆنی بە بەڵگە هێنراونەوەو، پاش هەڵسەنگێنرانیش چۆن دەردەچن؟!

## ١) دەقی یەکـەم:

((عن عقبة بن عامر الجهني قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: كل شيء يلهو به ابن آدم فهو باطِلٌ الاّ ثَلاثاً: رَمْيُهُ عن قَوْسِهِ و تأديْبهُ فَرَسَهُ و ملاعبتُهُ أهلَهُ فأنّهن من الحق)) رواه أحمد والترمذي و ابن ماجه والدارمي وهو حديث حسن.

واتە: ... گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر شتێك ئادەمیزاد پێیەوە بخافڵێ، بەتاڵە، بێجگە لە سێ شتان: تیرەندازیی کردنی بە تیروکەوانەکەی و، مەشق کردن بە ئەسپەکەی و، یاری‌و گەمەکردنی لەگەڵ خاووخێزانی، ئەمانە بێگومان هەقن.

## ٢) دەقــی دووەم:

((كل شيء ليس من ذكر الله، فهو لَغوٌ و لَهْوٌ الاّ أربعة خصالٍ: مَشْيُ الرجُلِ بين الغَرَضَيْنِ، و تأديبهُ فَرَسَهُ و مُلاعبته أهْلَهُ و تَعَلُّم السِّباحة)) رواه النسائي و الطبراني والبّزار وهو صحيح.

واتە: هەر شتێك لە یادی خوا نەبێ، ئەوە بێ‌سوودو خافڵانـە ،جگـە لـە چـوار شتان: هاتن‌و چوونی پیاو لە نێوان دوو نیشاناندا، مەشق پێکردنی ئەسپەکەی، گەمەو یاریکردنی لەگەڵ خێزانی، فێربوونی مەلەوانیی.

چۆنیەتی بە بەڵگەهێنانەوەی ئەم دوو فەرمایشتەش، لەسەر قەدەغەبوونی گۆرانیی‌و مۆسیقا بەمجۆریە:

دەڵێن: هەردوو فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنن،کە (لَهُو) هەمووی خراپە ،جگە لەوەی،کە هەڵاوێرراوە، جا دیارە گۆرانیی‌و مۆسیقا (غناء و معازف)یش (لَهو)ن‌و لە ڕیزی ئەو شتانەش نین،کە هەڵاوێرراون، کەواتە زەمکراوو خراپن، هەروەها وشەی (باطل)یش حەڕامیی دەگەیەنێ.

## هەڵسەنگاندن:

ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین:

یەك: پێشتر لە پێناسەی (لَهو)دا خستمانە ڕوو، کە لە خودی خۆیدا ڕەوا (مُباح)یەو بەهۆی ئەو ئامانجەوە،کە بۆی بەکاردێ حوکمەکەی دیاری دەکرێ، ،ئەگەر ویستراو (مَطْلوب)بێ، ئەویش ویستراوەو،ئەگەر ڕەتکراوە (مرفوض)یش بێ، ئەویش ڕەتکراوەیە.

دوو: ئەو سێ شتانەی،کە لە فەرموودەکەی (عقبة)دا هاتوون، کە تیرەندازیی‌و سوارچاکیی‌و گەمەو یاریی لەگەڵ خێزاندا کردنن‌و، لە (لهو)ی (باطل) هەڵاوێرراون، کورت هەڵێنراو (محصور) نین، بە بەڵگەی ئەوە،کە لە فەرموودەکەی (جابر)دا شتێکی دیکەی چوارەمیش، کە فێربوونی مەلەوانیی (تَعَلُّم السِّباحة)یە زیاد کراوە، ئنجا ، ئەگەر سەرنجی ئەو چوار جۆرە (لهو)ە هەڵاوێرراوە بدەین، دەبینین خالّی هاویەشیان بریتیە لە پەسندو چاك بوونی ئەو ئامانجانەی بۆی بەکارهێنراون، کەواتە: هەرجۆرە (لهو)یێك بۆ ئامانج‌و مەبەستێکی ڕەواو چاك بەکاربێ، ڕەواو شەرعییە، مەگەر لەبەر خودی خۆی قەدەغەکرابێ ،وەك یارییکردن بە (زار) وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مَن لَعِبَ بالنَّردشيرِ فكأنَّما صَبَغَ يَدَهُ في لحم خنزير و دَمِهِ)) رواه مسلم، واتە: هەرکەسێك یاریی بە زار (نَرد) بکات، وەك ئەوە وایە دەستی خۆی لە گۆشت‌و خوێنی بەرازێك وەردابێ.

سـێ: مەرج نیە هەر شتێك (باطل) بوو، (حرام)یش بێ، چونکە نە لە زمانو نە لە شەرعیش وانیـــە:

أ- ئەوەتـــا (ابن فارس) دەڵـــێ[1]:

(مادة باطل من (بَطَل) والأصل فيها الدلالة على ذهاب الشَّيء وقِلَّة مكْثِـه و لُبْثِـه، (وبَطَـلَ الشـيءُ): ذهـب ضـياعاً و خُسْـراً)، واتـە: (باطـل) بنەڕەتەکـەی (بَطَـل)یە،کە لـە ڕیشـەدا مـەبەسـت پێـی نـەمانی شـتێكو زووتێپـەڕیو کـەم مانەوەیەتی،(بَطَلَ الشـيءُ) واتە: نەماو زایە بوو ولە کیس چوو.

ب- (إبن تيميه)ش لەوبارەوە گوتوویەتی[2]:

(الباطِلُ ضِدُّ الحق، والحق يُرادُ به الحق الموجود اعتقادُهُ والخَبَر عنه، و يُراد به الحق المقصود الذي ينبغي أن يُقْصَد وهو الأمر النّافع، فما لَيْس من هذا فهو باطلُ لَيْس بنافِعٍ)، واتە: (باطل) پێچەوانەی (حَقّ)ە، هـەقیش مـەبەسـت پێـی بڕواهێنـانو هەواڵدان بەو هەقەیە،کە هەیە، جاری واش هەیە مەبەست پێی ئـەو هەقەیە،کـە ویستراوەو پێویستە بکرێتە ئامانج، ئەویش شتی بەکەڵکـە، هەرشـتێك وانـەبێ، ئەوە باتیڵەو بەکەڵك نیە.

هەروەها (الحُلَيْمي)یش لەبارەی پێناسەی (باطِلْ)ەوە گوتوویەتی[3]:

(الباطل ما لا قربة الى الله تعالى فيه ولا يَصلُح التوصُّلُ به الى قربةٍ ... و لَيس كلُّ ما يُسمىّ بالـ(باطِلْ) يحرم، فـأن اللَّعِـبَ بالصـولجان باطِـلٌ ولا يكـره وكـذلك المصارعة... وجلوسُ الرّجل المستطيع للجهد والعبادة فارغِاً الاّ من الفرائضِ، باطِلٌ

---

١) مجموع مقاييس اللغة، ج١، ص٢٥٨ .

٢) مجموع الفتاوى، ج٣٢، ص.٢٢٣

١) (المنهاج في شعب الأيمان)، ج٣، ص١٩-٢٠.

لأن كلَّ ساعةٍ تَمرُّ بالعبد وهو فيها غَير مُتعَبِّدٍ لله تعالى بما يُقَرِّبُهُ اليهِ بلا عُذْرٍ و علّةٍ فهي ضائعة لاحظٌ له فيها ولا فائدة لَهُ إدْراكها ولكن ليس ذلك مِمّا يُحْرِمُ).

واتە: (باطِلْ) بریتیە لە هەرشتێك،كە مایەی لەخوا نێزیكبوونەوە نەبێ و نەگونجێ، كە پێی لە خوا نێزیك ببینەوە ... ،بەلاّم هەرچی ناونرا (باطِلْ) بەحەڕامدانانرێ، چونكە یاری كردن بە تۆپ هەرچەندە باتیلە ،بەلاّم حەڕام نیە، هەروەها زۆرانبازیش... دیسان بە دەستبەتاڵیی دانیشتنی كابرایەكی توانادار بەسەر كردوكۆش و خواپەرستییدا، ،جگە لە فەرزەكان، باتیلە، چونكە هەر سەعاتێك،كە لە مرۆڤ دەڕوات و ئەویش تێیدا سەرگەرمی كارێك نیە - بێئەوەی هیچ پاساوێكی هەبێ- كە لە خوای بەرزی نزیك بخاتەوە، ئەوە لەكیسی چووەو هیچ بەهرەیەكی لێ وەرنەگرتوە، ،بەلاّم ئەوە بە حەڕامدانانرێ.

كەواتە: (باطِلْ) ماناكەی حەڕام نیەو، بەكارهێنانی وشەی (لهو) و (باطِلْ)یش بۆ (غِناء) و (معازف) بەڵگەی حەڕامییان نیە، بەڵكو وەك پێشتریش باسمان كرد جاری وایە، شتی ناونراو بە (لهو) و (باطِلْ) پەسندو چاكیشە، بگرە جاری وایە فەرزیش دەبێ، مادام فەرزێك پەكی لەسەر بكەوێ، بۆ نموونە: سوارچاكیی و تیرەندازیی و مەلەوانیی و بەشاخ و چیا هەڵگەڕان، لە حاڵێكدا،كە مسوڵمانان جەنگ و جیهادیان لەسەر پێویست بووەو، بێگومانیش بەبێ لیاقەی جەستەیی و كارامەیی و شارەزایی كاری جەنگ و جیهاد ئەنجام نادرێ!

## ٣) دەقی سێیەم:

((عن أبي عامر أو أبي مالك الأشعري: سَمِعَ النبّي ﷺ يقول: ليكونَنَّ مِن أمَّتي أقوامٌ يَسْتَحِلّون الحِرَ والحَرير والخَمْر والمَعازف، ولَيَنْزِلَنَّ أقوامٌ الى جَنْبِ عَلَمٍ يروح عليهم بسارِحةٍ لهم، يأتيهم - يعني الفقير- فيقولوا: إرْجِعْ إلينا غداً فَيُبَيِّتُهم الله ويَضَعُ العَلَمَ ويَمْسَخُ آخرين قِرَدةً وخنازير الى يوم القيامة)) رواه البخاريّ مُعَلَّقاً.

واتە: لە ئەبو عامیر، یان ئەبوو مالیكی ئەشعەرییەوە هاتوە، كە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە، دەیفەرموو: كەسانێك لە ئۆممەتی من پەیدا دەبن،كە زیناو

ئاوریشم‌و مەی‌و مۆسیقا حەڵاڵ دەکەن (یان زۆر بەکاردێنن)، وە کەسانێك لە تەنیشت ئاڵایەك دادەبەزن، مێگەلێکی خۆیانیان بەلادا دێنن، بابایەکی نەدار دێتە لایان، ئەوانیش پێی دەڵێن: بەیانی بگەڕێوە لامان، ئیدی خوا شەوێ بەلایان بۆ دەنێرێ‌و لە بەینیان دەبات‌و، ئاڵایەکەش دەخات، کەسانێکیش،هەتا ڕۆژی قیامەتێ دەگۆڕێ بۆ مەیموون‌و بەراز.

چۆنیەتی بە بەڵگە هێنانەوەی ئەم فەرموودەیەش لەسەر قەدەغەبوونی گۆرانیی‌و مۆسیقا، یان مۆسیقا بە تەنیا، بەم جۆرەیە:

دەڵێن:

١- وشەی (يَسْتَحِلُّون) یانی حەڵاڵ دەکەن‌و بە حەڵاڵی دادەنێن، دیارە بە حەڵاڵ دانانیش بۆ شتی حەرامە.

٢- بەراورد پێکردنی (معازف) لەگەڵ چەند شتێکدا، کە حەرام بوونیان ئاشکراو ڕوونە، وەك، زیناو شەراب، بەڵگەی ئەوەیە،کە یەك حوکمیان هەیە، ئەویش حەرامە.

٣- دیارییکردنی سزا لەسەر ئەو کردەوانە لە بەرانبەریاندا، بەڵگەو نیشانەی قەدەغەبوونیانە.

شایانی باسیشە، کە زۆربەی بە قەدەغەدانەرانی گۆرانیی‌و مۆسیقا ئەم دەقە بە بەهێزترین بەڵگەیان دادەنێن لەسەر ڕاستیی ڕایەکەیان، بۆیە ئێمەش بە وردیی‌و بە نەفەسێکی درێژەوە هەڵی دەسەنگێنین:

## هەڵسەنگاندن :

لە وەڵامدا دەڵێین:

یەك: جارێ بەر لە هەموو شتێك پێویستە بزانرێ، کە ئەم فەرموودەیە (بخاري) بە (مُعَلَّق)ی هێناویەتی، هەر بۆیەش (ابن حزم)و ژمارەیەك لە زانایانی فەرموودەناس ڕەدیان کردۆتەوە، هەروەها ئەم فەرموودەیە، کێشەو مشتو

مڕی دیکەشی لەسەر هەن، بۆ نموونە: یەکێك لە (راوي)یەکانی، (هشام بن عمّار)ە، کە هەر کام لە: (أبو حاتم وأحمد ونسائي وذهبي) ڕەخنەیان لێی هەبووە.

دوو: (بخاري) بۆخۆی ئەم دەقەی نەکردۆتە بەڵگەی قەدەغەبوونی مۆسیقاو، بەم ناونیشانەش هێناویەتی: (باب ما جاء فيمن يستَحلُّ الخَمْرَ ويُسَمِّيه بغير اسمه)، (بخاري) لە (صحيح)ەکەی خۆیدا، لەبارەی قەدەغەبوونی گۆرانییو مۆسیقاوە هیچی نەهێناوە.

سێ: ئەم دەقە هەواڵ لە ئاینده دەداتو پێشتریش لە بەشی دووەمدا خستمانە ڕوو، کە ئەو دەقانەی هەواڵدان لە داهاتوویان تێدایە، بە شێوەیەکی سەربەخۆ حوکمی ئێستایان لێ وەرناگیرێ.

چوار: ئەو سزایەی،کە لەم دەقەدا دیاریکراوە، بۆ چەند کردەوەیەکە،کە بە جیاجیا هەرکامێکیان حوکمێکی جیاوازو تایبەتی هەیە، کە (زیناو شەڕابو ئاوریشمو مۆسیقا)ن، ،بەڵام لە فەرموودەکەدا سزا(عقوبة)یەکە لە بەرامبەر هەموویانداو وێکڕا دانراوە، کەواتە: مەرج نیە تاك تاکیانو بە جیاجیا، هەمان سزای،کە بۆ هەموویانو وێکڕا دانراوە، هەیانبێ، چونکە شتێکی ڕوونو ئاشکرایە،کە مەرج نیە حوکمێك،کە هەموو (کلّ) دەگرێتەوە، بەش (جزء)ە پێکهێنەرەکانیشی بگرێتەوە!

پێنج: وشەی (يَسْتَحِلُّون) سێ واتای هەن:

١- حەڵاڵکردنی حەرام (إستباحة الحرام).
٢- بەڕەوا دانانی حەڵاڵ (إستباحة الحلال).
٣- کردنی کارێکی حەرام بێ گوێدانە قەدەغەکرانی (مواقعة الفعل المحرم دون مبالاة بتحريمه).

١/ جا هەرچی یەکەمیانە - واتە بەڕەوا دانانی حەرام - ئەوە ،ئەگەر بە مۆڵەتی شەریعەت، یان بە عوزرێکی وەك نەزانین (جهل)و تەئویل کردنەوە نەبێ، بە کوفر دادەنرێ.

بەلاَم ،ئەگەر بە ئیزنی شەریعەت بێ، ئەوە هیچ ئیشكالی تێدانیە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إتقوا الله في النِساءِ فأنّكم أخذتموهُنَّ بأمان الله واستحللتُم فروجَهنَّ بكلمة الله)) رواه مسلم وغيره، واتە: لەبارەی ژنانەوە پارێز لەخوا بكەن، ئێوە وەك سپاردەیەكی خوایی وەرتان گرتوون‌و، بە وشەی خوا داوێنیانتان بۆخۆتان حەلاَڵ كردوە.

٢/ بەلاَم ڕەوادانانی حەلاَڵ (إستباحة الحلال)، ئەوە شتێكی هەق‌و ڕەوایەو ئەم دەربڕین (تعبير)ەش لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، وەك فەرموویەتی: ((ألا هل عسى رجلٌ يَبْلُغُهُ الحديثِ عَنَي وهو متَّكئٌ على أريكَتِهِ، فيقول: بَيْنَنا وبينكم كتاب الله، فما وَجَدنا فيه حلالاً استَحْلَلْناهُ، وما وجَدْنا فيه حَراماً حَرَّمْناهُ، وإنّ ما حرَّمَ رَسولُ الله كما حرّمَ الله)) رواه أحمد والترمذي وابن ماجه وأبوداود والدارمي والحاكم وابن حِبّان وإسنادَه صحيح.

واتە: وریابن، ڕەنگە پیاوێكی ئانیشك دادەر لەسەر كورسیەكەی فەرموودەیەكی منی پێبگات، ئەویش بلێ: كتێبی خوامان لە نێواندا دادوەرە، هەر شتێكمان تێدا بینی حەلاَڵ بوو، بە حەلاَلی دادەنێین، هەر شتێكیشمان تێدا بینی حەڕام بوو، بە حەڕامی دادەنێین! ، بەلاَم بێگومان ئەوەی،كە پێغەمبەری خواش قەدەغەی كردوە، وەك ئەوە وایە،كە خوا قەدەغەی كردوە.

٣/ دیارە هەركەسێكیش باش سەرنجی ئەم فەرموودەیە بدات، دەزانێ كە هیچ كام لە مانای یەكەم‌و دووەم بۆ وشەی (يَسْتَحِلّون) گونجاو نین، چونكە وەك لە بڕگەی شەشەمدا باسی دەكەین مانای یەكەمیان واتە: ( بە حەلاَڵ دانانی حەڕام) كوفرەو لەگەڵ ڕستەی (ليكونَنَّ مِن أمَّتي أقوامٌ)دا دژ دەوەستێ، مانای دووەمیش، كە بریتیە لە (بەڕەوا دانانی حەلاَڵ) دیسان گونجاو نیە، چونكە ناكرێ خەڵكێكی مسوڵمان، هەرچەندە لاڕێ‌و گوناهبار بن، زیناكردن‌و مەیخواردنەوە بە حەلاَڵ بزانن، كەواتە (بەڕەوا دانانی حەلاَڵ) لەگەڵ ئەم سیاقەدا نالوێ، چونكە ئەو چوار شتەی باسكراون، دوانیان،كە زیناو مەیخواردنەوەن، بۆ هەموو كەس‌و لە هەموو حالاَندا هەر قەدەغەو حەڕامن.

کەواتە: ئەوەی،کە لەو سێ مانایەی گوتمان، وشەی (یَسْتَحِلّون) هەین، تەنیا هی سێیەمیان گونجاوە،کە بریتیە لە: (کردنی کارێکی حەڕام بۆ گوێدانە قەدەغەبوونی)، ئەم مانایە وێڕای گونجاویی لەگەڵ سیاقی فەرمایشتەکەدا، هیچ ئیشکالو گرفتێکیش دروست ناکات.

کەواتە: خودی وشەی (إستحلال)،کەلە فەرموودەکەدا بە (یَسْتَحلّون) هاتوە، ئەوە ناگەیەنێ، کە شتێکی حەڕام حەڵاڵ کراوە، بەڵکو ئەوە پەکی لەسەر بەڵگەیەکی دەرەکی،کەوتوە.

شەش: ڕستەی: (لیکونَنَّ مِن أمَّتي أقوامٌ یَسْتَحِلّون...)) بە هیچ جۆرێك ڕێمان نادات، کە بڵێین: مەبەست لە (یَسْتَحِلّون) حەڵاڵکردنی حەڕامە، چونکە مادام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو جۆرە کەسانەی لە ڕیزی ئوممەتیدا حساب کردوە، مانای وایە حەڕامی خوایان بە حەڵاڵ دانەناوە،ئەگەرنا بەو ڕەفتارەیان کافر دەبوونو، لە ڕیزی مسوڵمانان دەردەچوون!

حەوت: وێکڕابوون (إقتران)ی چەند شتێك، بەڵگە نیە لەسەر وەك یەك بوونیان لە حوکمدا، ئنجا،ئەگەر یەکێکیش بڵێ:

ئایا بنیاتنرانی سزا (ترتیب العقوبة)یەکە لەسەر بەکارهێنانی ئەو چوار شتە، نیشانەو بەڵگەی ئەوەنیە،کە هەموویان ڕێژەیەکیان لە خراپیی هەیە؟!

دەڵێین: با،بەڵام تەنیا پێکەوە باسکرانیان ،ئەوە ناگەیەنێ، کە حوکمیان وەك یەکە لە هەموو حاڵاندا،ئەگەرنا، دەبوایە ئاوریشم (حریر)یش وەك زیناو شەراب (الزّنی والخمر) لە نێرو مێی مسوڵمانان قەدەغە بوایە، لە حاڵێکدا بۆ ئافرەتان ڕەوایەو، لە کاتی نەخۆشیو ناچاریشدا، بۆ پیاوانیش ڕەوایە!

ئنجا،ئەگەر بگوترێ: ئایا ئەو ڕێژە خراپییەی (مَعازف) چیە؟ دەڵێین: ئەوەیە،کە کراوەتە وەسیلەی کارێکی حەڕام، دیارە هەر شتێکیش بکرێتە هۆکاری حەڕام ، حەڕام دەبێ، وەك بنچینەی شەرعیی دەڵێ: (الوسیلة الی الحرام

مُحرَّمة)، بۆ نموونە: تریێ و خورمایەك،كە دەزانی شەڕابیان لێ دروست دەكرێ، هەرچەندە لە خودی خۆیاندا ڕەوان،بەلاَم حەڕامە بە كەسێك بفرۆشرێن،كە دڵنیای بۆ ئامانجێكی حەڕامیان بەكاردێنێ.

كەواتە: ئەو (مَعازفَ)ەی،كە لەم فەرمایشتەدا لەگەڵ زیناو مەیو ئاوریشم (زناوخمر وحرير) باسكراوە، وەك چۆن حوكمی هەر كام لە (زناوخمر وحرير)مان لە خودی فەرموودەكە وەرنەگرت، بەڵكو هی هەر كامێكیانمان لە دەرەوەی فەرموودەكە هێنا، پێویستە بۆ ئەویش هەروا بكەین، چونكە وەك گوتمان: ئەو سزایەی،كە دیاریكراوە، بۆ كۆ (مجموع)ی ئەو شتانە وێكڕا دیاریكراوە، نەك بۆ تاك تاكیان، ،بەلاَم ئێمە لە سۆنگەی ئەوەوە،كە (مَعازف)مان لەگەڵ (زناوخمروحرير)دا بینی، زانیمان،كە ئەو كۆمەڵە خەڵكە سزا دراوە (مَعازف)یان كردۆتە وەسیلە گوناهو خراپە.

<u>هەشت</u> : ئنجا لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ (مَعازف) هەبوون و لە بۆنە جیاجیاكانیشدا بەكارهێنراون، هەروەها گۆرانیی (غِناء)یش هەر هەبووە، بەلاَم هیچ بەڵگەیەكی سەربەخۆ (مستقلّ) لەسەر حەرام بوونیان نیە، وەك چۆن لەسەر حەڕامیی (زنا وخمر) لە هەموو حالاَنداو، لەسەر حەڕامیی (حرير) بۆ پیاوان، مەگەر لەچەند حالەتێكی هەلاَوێرراو (مسْتَثنْى)دا، بەڵگەی ڕوون و ڕاشكاو هەیە.

ئنجا بەڵگەش لەسەر هەبوونی ئامێرە دەنگییەكان (مَعازف) لە ڕۆژگاری شەرعدانان (زمن التشريع)دا زۆرن، بۆ نموونە:

١) ((عن جابر بن عبدالله قال: كان الجواري إذا نكحوا يَمُرّون بالكَبَرِ والمزامير و يتركون النبّي ﷺ قائماً على المنبر وينفضّون اليها، فأنزل الله ﴿ وَإِذَا رَأَوْا۟ تِجَـٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓا۟ إِلَيْهَا ... ﴿١١﴾ الجمعة ﴾. رواه ابن جرير[1] وهو صحيح.

١) تفسير الطبري، ج٢٨، ص١٠٥.

واتە: کاتی خۆی عادەت وابوو، کە ئافرەتانیان مارە دەکرد، بە تەپڵو ئامێرەکانی گوتنەوە تێپەڕ دەبوون‌و، پێغەمبەریان ﷺ بەپێوە لەسەر مینبەر جێدەهێشت‌و بە پەلە شوێنی دەکەوتن، ئیدی خوا (جلّ جلاله) ئەمەی ناردە خوار: ( کاتێك بازرگانیی‌و لەهوویان بینی بەرەو لای پڕژان...).

دیارە سەرزەنشتکرانی شوێنکەوتوانی لەهوش، لەبەر خودی لەهووەکە نەبووە، بەڵکو لەبەر جێهێشتنیان بووە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر، ئەگەرنا، دەبوایە بازرگانیی (تجارة)ش هەر خراپ‌و زەمکراو (مَزْموم) بێ!

ئنجا وشەی (كَبَرْ)،کەبە مانای تەپڵە، ئەوە دەگەیەنێ، کە ئامێریی دەنگیی لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا تەنیا دەف نەبووە وەك هەندێك دەڵێن، بەڵکو تەپڵو غەیری ویش هەبووە، وەك وشەی (مزامیر)یش، کە لە خودی فەرموودەکەدا هاتوە دەیگەیەنێ.

٢) ((عن نافع مولى ابن عمر: أن ابن عمر سَمِعَ صَوْتَ زَمّارةً راعٍ..)) رواه أحمد وأبوداود، کە دواتر لە ژمارە (٧)دا بەتەواوی دەیهێنین.

کەواتە: لەو ڕۆژگارەدا شمشاڵو بلوێریش بەکارهێنراوە.

٣) لەو دەقەدا، کە بە (حديث أمّ زرع) ناسراوەو (عائیشة) -خوا لێی ڕازی بێ- بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە،کە یازدە ژن، مێردەکانیان وەسف دەکەن، لە درێژەی قسەکەیدا دەڵێ:

((قالت العاشرة: زوجي مالك، ومالك؟ مالك خيرٌ من ذلك، لَهُ إبِلٌ كثيرات المبارك قليلات المسارح، وإذا سمعت صوت المِزْهَرِ أيْقَنَّ أنّهنَّ هوالك...)) متفق عليه، واتە: هی دەیەمیان گوتی: مێردی من مالیکە، جا دەزانی مالیك چیە، مالیك لەوە باشترە (کە بە خەیاڵتدا دێ) حوشتری زۆری هەن،کە زۆر مۆڵ دەدرێن‌و کەم دەردەکرێن، هەر کات دەنگی عوودیان بیست دڵنیا دەبن،کە فەوتاون.

(أبو عبيد) له (غريب الحديث)دا گوتوویەتی[1]:

((أرادت أن زوجَها قَدْ عـوَّدَ إبِلَـهُ أنـه إذا نَـزَلَ بـه الضِـيفانُ أن يَنْحَـرَ لهـم وَ يَسْقِيهُم الشراب و يأتيهم بالمعازف. فإذا سَمِعَتِ الأبِلُ ذلك الصوت عَلِمْنَ أنّهنَ مَنْحـورات))، واتــە: مەبەســتی ئەوەیە،کــە مێردەکــەی حوشــترەکانی وا ڕاهێناوە،کە هەر کات میوانی هاتن حوشتریان بۆ سەربڕیّو شەڕابیان بـداتیّو ئامێرە دەنگییەکانیـــان بۆ بەکاربێنێ، جا هەر کات حوشــترەکان ئەو دەنگەیان بیست، دڵنیا دەبن،کە سەردەبڕێن.

٤) أبو عثمان النَّهدي)،کەیەکێکە لە زانایانی شوێنکەوتوان(تابعين) گوتوویەتی: ((ما سمعت مِزْماراً ولا طُنْبوراً ولا صَنْجاً أحسن من صوت أبي موسى، إنْ كان ليُصَلِّي بِنا فَنودٌّ أنه قرأ البقَرَة من حُسْنِ صَوْتِهِ) رواه أبو عبيد في (فضائل القرآن) وأبوبكر الشافعي في (الفوائد) وأبونعيم في (الحلية) وإسنادهُ صحيح.

واتە: هیچ شمشاڵو کەمانچـەو صـەنجێکم[2] نەبیســتوە،کە دەنگـی لــە هــی ئەبوومووسا خۆشتر بێ، وە کاتێك پێشنوێژی بۆ دەکردین، دەنگی هێندە خۆش بوو، حەزمان دەکرد سوورەتی بەقەڕەی هەموو خوێندبایە.

لەم دەقانە بە ڕوونیی دەزانـرێ، کــە ئامێرەکــانی گــوتن (آلات الغِنـاء) لــە ڕۆژگاری پێغەمبــەر ﷺو پــێش ئیسلامیشــدا هــەبوونو، خــەڵکی لــە بۆنــە جیاجیاکاندا بەکاریان هێناون، کەواتە: ئەو مەسەلەیە شتێکی ئاشـکرا بــووەو پەنهان نەبووەو، بە زاراوی شەرعزانان (مِمّا تعمُّ به البَلْوى) بووە، کەچی هــیچ دەقێکــی شــەرعی ڕوونــی لــەوبارەوە نەهاتوە،کــە بشــێ بکرێتــە بەڵگــەی

---

١) ج٢، ص ٢٩٩-٣٠٠.

١) صَنْج: ئامرازێکی بەزمو شاییە، کە لە مسی زەرد دروست دەکرێتو بەدوو پەنجە لێدەدرێت، وەك تەپڵو دەف، دەنگێك دروست دەکات.

قەدەغەبوونی بەکارهێنانی ئامێرە دەنگییەکان، وەك لـەبارەی زینـاو قومـارو شەڕابو...هتدەوە هاتوە.

## پوختـەی قسـان :

پوختەی مەبەست لەبارەی ئەم دەقەوە، لەم چـەند بڕگەیـەدا کـورتو پوخـت دەکەینەوە:

١- شتی ڕەوا (مُباح) حوکمەکەی ڕەوایی یەو، ئەم حوکمەش چەسپاوو نـەگۆڕە، هەتا بەڵگەیەکی تایبەتی شەرعیی دێو دەیگوازێیتەوە بۆ حاڵەتێکی دیکە.

٢- ئەو زەمەی ئاڕاستەی (مَعازف) کراوە لە دەقەکەدا لەبەر خودی خۆیان نەبووە، بەڵکو لەبەر ئـەوەبووە، کـە کراونەتـە هۆکـاری گوناهــو خراپـە بەدەسـت کەسانێکی خراپەوە، چونکە ئامێرەکان (آلات) بە گشتیی، لەبەر خودی خۆیان نیە،کــە زەمو مـــەدح ڕوویــان تێــدەکات، بــەڵکو لەبــەر دەنگەکانیانــەو، دەنگەکانیشیان لەبەر خودی خۆیان نیە، بەڵکو لەبەر ئەو ئامانجەیە،کە بـۆی بەکاردەهێنرێن، جا ئەگەر قەدەغەوخراپ بوو، ئەوە ئەوانیش خراپنو، ،ئەگەر چاكو پەسندیش بوو، ئەوە ئەوانیش بە باشو پەسند وەسـف دەکرێن،ئەگـەر ڕەوا (مُباح)یش بوو، ئەوە هەر لەسەر ئەسڵی خۆی ماوەتەوە.

دەشتوانین مەسەلەی ئامێرە دەنگییەکان بە دەفرەکان (ظروف)ی مەی تێکران بچوێنین، کـە پێغەمبــەر ﷺ سـەرەتا بـەکارهێنانیانی قەدەغـە کـردو، پاشـان مۆڵەتیدا، وەك فەرموویەتی: ((ونهيتكم عن الظروف وان الظروف لا تُحـرِّم شيئاً ولا تُحِلُّهُ وكلُّ مُسْكِرٍ حرامٌ)) رواه أحمد ومسلم والترمذي وصحّحه عن سليمان بن بريدة عن أبيه.

واتە: بەکارهێنانی دەفرەکان -ی مەی تێکران-م لێتان قەدەغە کردبـوو، جـا بێگومان دەفرەکان هیچ شتێك حەڕامو حـەڵاڵ ناکـەن، هـەموو سەرخۆشـکەرێك حەڕامـە. هیچ گومانیشی تێدا نیە،کـە حیکمـەتی لـە سـەرەتاوە قەدەغـەکرانی بەکارهێنانی دەفرەکانی شەڕابو پاشان ڕەواکردنەوەی ئەوەبووە،کە لە سـەرەتاوە تازە مەی قەدەغەکراوەو ویسـتراوە ئـەو قـاپو دەفرانـەیان نەکەوێتـە بەرچـاوو

بەکارنەهێنن،کە هەتا دوێنێ شەڕابیان تێدا خواردوونەوە،تاکو بەتەواویی لە بیریان بچێتەوەو، پاشان،کە پێغەمبەری خوا ﷺ دڵنیا بووە، هیچ خوتخوتەو خەیاڵێکی خراپیان بۆ دروست ناکات، ڕێی پێداون،کە بەکاریان بێننەوەو مەسەلەکەی گێڕاوەتەوە سەر حاڵەتە ئەسڵییەکەی خۆی.

کەواتـــە:

مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە،کەکەسانێك لە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ پەیدا دەبن، کە زۆر بە گوێ پێنەدانەوە، دەکەونە نێو زەلکاوی گوناهو تاوان، لە زیناو مەیخواردنەوەو پۆشاکی ئاوریشم بەکارهێنانو، سەرگەرمبوون بە گۆرانییو مۆسیقاوەو، سەرەنجام دووچاری سزاو تۆڵەی خوا دەبن، هەر لە دنیادا پێش دوارۆژ.

(مَعازف)یش- کە وەك لە باسی یەکەمی ئەم بەشی سێیەمەدا گوتمان: سەرجەم ئامێرە مۆسیقاییەکان دەگرێتەوە- لەو ڕووەوە زەم کراوە،کە بە دەست کەسانێکی خراپەکارو گوناهبارەوە کراوەتە وەسیلەی بەزمو ڕەزمو خراپەو تاوان، بۆیە لەم فەرموودەیەدا، بە هیچ ڕەنگێك ناگونجێ زەمکرانی (مَعازف) بکرێتە بەڵگەی قەدەغەبوونی ئامێرە دەنگییەکان بە ڕەهایی، بەڵکو پێویستە بۆ بەڵگەیەکی ئاوا لە دەرەوەی ئەم فەرمایشتەدا بگەڕێین.

## ٤) دەقی چـــوارەم:

(عن عبدالرحمن بن سابط قال: قال رسول الله ﷺ: إن في أُمَّتي خَسْفاً ومَسْخاً وقَذْفاً، قالوا: يا رسول الله: وهم يشْهدون أن لا اله الاّ الله؟ فقال : نعم، إذا ظهرت المعازف والخمور ولُبِسَ الحريرُ) أخرجه ابن أبي شيبة وابن أبي الدنيا في (ذم الملاهي) رقم:٩، وهو حديث حسن.

واتە: بێگومان لە ئوممەتمدا بە زەویدا ڕۆچوونو شێوەو دیمەن گۆڕانو بەردباران کران، ڕوو دەدەن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! جا ئایا ئەوکەسانەی ئەو شتانەیان بەسەردێ شایەدییش دەدەن، کە جگە لە خوا پەرستراوی دیکە نین؟

فەرمووی: بەڵێ، هەر کات ئامێرەکانی گوتـنو مـەیخۆریی دەرکـەوتنو ئاوریشـم پۆشرا.

### ٥) دەقـی پێنجـەم:

(عن أبي مالك الأشعري قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: سيكون في أُمَّتي الخسفُ والمَسْخُ والقـذفُ، قال: قلت فيم يارسول الله؟ قال: باتخاذهم القَيْنات وشُربهم الخمور) أخرجه الطبراني في الكبير وابن عساكر والدولابي في: (الكنى والأسماء) وهو صحيح.

واتە: لەمەودوا لـەنێو ئوممەتمـدا بەزەویـدا ڕۆیـرانو وێنـەو دیـمەن گـۆڕانو بەردباران کران ڕوودەدەن، گوتی: گوتم لەسەرچی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەهۆی ئەوەوە،کە خوو دەدەنە ئافرەتانی گۆرانیی بێژو مەیخواردنەوە.

چۆنیەتی بە بەڵگە هێنانەوەی هەرکام لەم دوو فەرموودەیەش لەسەر ئەوە،کە گۆرانییو مۆسیقا قەدەغەن، بەم شێوەیە:

دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ لەم دوو فەرمایشتەدا ڕایگەیاندوە،کە یەکێك لە هۆکارەکانی بەزەویدا ڕۆبرانو مەسخ کرانو بەردباران کرانی،کەسانێك لە ئوممەتی، بریتیە لە: گۆرانییو مۆسیقا، جا دیارە گۆرانییو مۆسیقایەك سەرەنجامی ئاوا بۆ خاوەنەکەیان پەلکێش بکەن، ناگونجێ خراپو قەدەغە نەبن.

## هەڵسـەنگاندن :

لەوەڵامدا دەڵێیـن :

ئەم دوو فەرموودەیـەش وەك ئـەوەی پێشـوو - فـەرموودەی سـێیەم - وانو وەڵامی بە بەڵگە هێنانەوەیەی ئەو، بۆ ئەمانیش دەشێو ئەوەی بە مسۆگەریی لەم دوو فەرموودەیە دەفامرێتەوە هەرئەوەیە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئوممـەتەکەی هۆشیار دەکاتەوە،کە وریابنو بە ئارەزوو ویسـتییو ڕابواردنـدا نەچـنە خـواریو زێدەڕۆیی نەکەن.

بەڵام بێگومان حوکمی یەك یەكی ئەو شتانەی،كە باسكراونو كراونە هۆكاری ئەو سزا خوایی یە، لە خـودی فەرمایشـتەكان وەرناگیرێو،پێویسـتە لـەدەرەوەی جوغزی ئەواندا بۆی بگەڕێین.

كاتێكیش لەدەرەوەی جوغزی فەرموودەكاندا بۆ حوكمی هەركام لە:

(معازف و شرب الخمور ولبس الحرير و اتخاذ القينات) دەگەڕێیـــن، دەبینین هەركامێكیان حوكمێكی جیاوازو سەربەخۆی هەیە، وەك پێشتریش باسمان كرد.

ئنجا دیارە، كە مەسەلەی (اتّخاذ القَيْنات) پێشتر باس نەكراوە، ،بەڵام وەك لە دەقی ژمارە (٩)دا هاتوە هـەبوونی ئـافرەتی گـۆرانیی بێـژ (قَيْنَـة: مُغَنِّيـة) لـە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ شتێكی ئاسایی بووە.

شایانی باسیشە، كە فەرموودەی چوارەم ئەم دوو ڕاستییەشی لـێ وەردەگیرێن:

یـــەك: ئەو قسەیەی هاوەڵان،كە وەك پرسـیار ئاڕاسـتەی پێغەمبـەریان كـردوە: (يارسول الله! وهم يشـهدون أن لآ إلـه الاّالله؟!) بەڵگەیـەكی دیكەیـە لەسـەر ئەوە،كە وشەی (يستحلّون) لە فەرموودەی سـێیەمدا بـەمانای حـەڵاڵ دانـان نەهاتوە، بەڵكو مەبەست پێی: كردنی شتی قەدەغەو خراپە بەبێ گوێ پێدان.

دوو: وشەی ئاشكرابوو (ظهرت) ئاماژەیـە بـۆ بڵاوبوونـەوەو تەشـەنەكردنی ئـەو كردەوانە بەجۆرێك،كە ببنە دیاردە، كە دیارە ئەو حاڵەتەش لە كۆمەڵگایەكدا دەبێ نوقمی ئارەزوو بازییو زێدەڕۆیی بووبێو، خوای كاربـەجێش لـەوبارەوە یاسـایەكی هەیە،كـە بریتیـە لـە فەوتانـدنو لـەنێوبردنی ئـەو جـۆرە كۆمەڵگایانەی،كە لە زەلكاوی خۆشگوزەرانیی حەڕامو خراپەو تاوانـدا نغـرۆ دەبـن، وەك فەرموویـەتی: ﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ الإسراء﴾، واتـە: هـەركات ویستمان ئاوەدانییـەك بفـەوتێنین، فـەرمان بـە خۆشـگوزەرانەكانی دەكـەین -كـە

چاكەكاریی‌و دادگەریی بكەنە پیشە - كەچی ئەوان خراپەكـاریی تێدا دەكەن، ئیــدی بڕیار -ی خوا- یان لەسەر دێتە جیٚ‌و بەتەواویی كاولی دەكەین.

### ٦) دەقــی شەشــەم:

(عن عـائشة رضي الله عنها قالت: دخل علـيَّ ابـوبكرٍ وعنـدي جاريتـان مـن جواري الأنصار تَلْعبان بِدُفَّيْن تُغَنِّيانِ بما تقاولـت بـه الانصـار يـوم بعـاثٍ، قالـت: وليستا بِمُغَنِّيتيـن! فقال ابوبكر: أَمَزامِيرُ (وفي لفظٍ: أَبِمَزْمورِ، وفي لفظٍ: أَمِزْمارُ) الشيطان في بيت رسول الله؟ (وفي رواية: فنهاهنَّ ابوبكرٍ وقال: أتفعلون هذا ورسول الله ﷺ جالسٌ؟!) وذلك في يوم عيد (الفطر)، فقال رسول الله ﷺ: يا أبابكرٍ! إن لكلِّ قومٍ عيداً وهذا عيدُنا) رواه البخاري ومسلم وابن ماجه والبيهقي وابن حبان وإسحاق بن راهويه.

واتە: عـائیشە -خوا لێی ڕازی بیٚ- دەڵیٚ: ئەبوبـەكر لـێم وەژوور كـەوت لـە حاڵێكدا،كە دوو كچ لە كچانی ئەنصارییم لەلابوون، دوو دەفیان پیٚ بوون یارییان پێیان دەكرد، گۆرانیی‌یان دەگـوت بـەو شـیعرانەی،كە ئەنصـارییەكان لـە ڕۆژی (بُعاث)دا شەڕە شیعریان پێكردبوون، گوتی: گۆرانیی بێژیش نەبوون، جا ئەبوبەكر گوتی: چۆن دەبیٚ زوڕنایەكان (وەلەبێژەیەكدا: بە زوڕنای، وەلەبێژەیەكدا: زوڕنا)ی شەیطـان لەماڵی پێغەمبەری خوادا لـیٚ بدریٚ؟! ( لە ڕیوایەتێكداهاتوە: ئەبوبەكر نەیهێشتن وگوتی: چـۆن ئەمــە دەكـەن لەكاتێكداپێغەمبــەری خواشدانیشـتوە؟!) ئەوەش لەڕۆژی جەژن -ی ڕەمـەزان-دابوو، جا پێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرمووی: ئەی ئەبوبەكر! هەر كۆمـەڵێك جەژنێكیان هەیەو ئەمەش جەژنی ئێمەیە.

چۆنیەتی بەبەڵگە هێنانەوەی ئـەم دەقـەش لەســەر قەدەغـەبوونی گـۆرانیی‌و مۆسیقا بەگشتیی، لەلایەن بەقەدەغەدانەرانیانەوە، بەم جۆرەیە:

دەڵێــن:

١- ئینکاریی کردنی ئەبوبەکر - خوا لێی ڕازی بێ- بەڵگەیە لەسەر ئەوە،کە زانیویەتی گۆرانییو مۆسیقا حەڕامە، ،ئەگەرنا لەخۆیەوە ئەو هەڵوێستەی نەدەنواند.

٢- پاڵدانی (مزمار) بۆلای شەیطان، دیارە هەموو شتێکی شەیطانیش هەرخراپە.

٣- دانپێداهێنانی پێغەمبەر ﷺ بەقسەکەی ئەبوبەکردا -خوا لێی ڕازی بێ- کە گۆرانییو دەف، شمشاڵو زوڕنای شەیطانە، ئەوەندە هەیە بۆی ڕوون کردۆتەوە،کە ئەو ڕۆژە بەتایبەت هەڵاوێرراوە، چونکە ڕۆژی جەژنەو دیارە مۆڵەتیش نابێ لە شوێنی خۆی بەولاوەتر بچێ!

## هەڵسەنگاندن :

ئێمەش لەوەڵامدا دەڵێین:

یەك: ئەگەر ڕاستە (أبوبکر) قەدەغەبوونی گۆرانییو دەفی لەلا سەلمێنراو بووە، بۆیە ئینکاریی کردوە، کوا بەڵگەی ئەو قەدەغەبوونە سەلمێنراوە؟ ئەگەر ڕاست بێ هەبێ، پێویستە ئەو بەڵگەیە خۆی بخرێتەڕوو، نەك ئەم فەرموودەیە بەبەڵگە بهێنرێتەوە!

بەڵام لەڕاستیدا وانیەو هەڵوێستەکەی ئەبوبەکر -خوا لێی ڕازی بێ- هۆکارێکی دیکەی هەیە،کە دوایی ئاماژەی پێدەکەین.

ئنجا،ئەگەر یەکێك بپرسێ: ئەدی بۆچی (أبوبکر) ئینکاریی کردوەو گۆرانییو دەفی بە شمشاڵو زوڕنای شەیطان داناوەو، پێغەمبەریش ﷺ پاش هەڵاواردنی ڕۆژی جەژن دانی بۆ پێداهێناوە؟

دەڵێین:

پێشتر باسمان کرد، کە گۆرانییو مۆسیقا لە بازنەی (لهو)دانو، ئەمیش بەپێی ئەو ئامانجەی،کە بۆی بەکاردێ حوکمەکەی دەگۆڕێ، جاری وایە پەسندو، جاری واشە خراپو قەدەغەو، جاری واش هەیە هەر لەسەرحاڵەتی ئەسڵی خۆی،کە ڕەوایی (إباحة)یە دەمێنێتەوە.

کەواتە: کەمترین پلەی (لهو)ی ڕێ پێدراوو ڕەوایی (إباحة)یەو، (لهو)ش لەو ڕووەوە،کە بەگشتیی سوودێکی قیامەتی نیە بەشی شەیطانی پێوەیەو، دەچێتە بازنەی بەتاڵ (باطل)ەوە، لەو ڕووەوە،کە کاتێك لەکیس مرۆڤ دەدات لێی بەهرەمەند نابێ، دیارە شەیطانیش بەکردەوەی چاکی لەخوا نێزیکخەرەوە قەڵسەو، خافڵانو یارییش دەبنە مایەی لەدەستچوونی ئەو کردەوە چاکە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (نعمتان مغْبون فيهما كثيرٌ من الناس: الصحة والفراغ) رواه البخاري وأحمد والترمذي والدارمي وابن ماجه، واتە: دوو نیعمەت زۆرێك لەخەڵکی تێیاندا زیانبارن: تەندروستییو دەستبەتاڵیی.

جا کاتێك ئەبوبەکر ئەو خافڵانەی بینیوە لەماڵی پێغەمبەردا ﷺ کراوە، حاڵو پێیەی پێغەمبەری خوای پێ لەوە بەرزتر بووە،کە ئەو جۆرە شتە لە ماڵیدا بکرێ، بۆیە ئینکاریی لێکردوە، دیارە بە (لهو)و (باطل) زانرانی گۆرانییو مۆسیقاش بەس بووە بۆ ئەبوبەکر، کە پێی ناڕەحەت بێ لەماڵی پێغەمبەردا ﷺ بکرێ.

دوو: ئنجا،ئەگەر بێتو بەم لێکدانەوە ڕوونو مەنتیقییە هەڵوێستەکەی ئەبوبەکر تەفسیر نەکەینو بڵێین: ئەبوبەکر -خوا لێی ڕازی بێ- پێی وابووە،کە گۆرانییو دەف حەرامەو لە ماڵی پێغەمبەریشدا دەکرێ! مانای وایە ئەبوبەکر گومانی ئەوەی بە پێغەمبەر ﷺ بردوە،کە لەماڵیداو لەبەرچاوی شتی حەرامو خراپ کراوەو لێشی بێدەنگ بووە!! کە بێگومان ئەو جۆرە گومانە لە ئەبوبەکری صیددیق زۆر دوورە!

سـێ: ئنجا هەر لەو جۆرە هەڵوێستەی ئەبوبەکر، لە عومەریش -خوا لێیان ڕازی بێ- بینراوە، بۆ نموونە:

١- ((عن أبي هريرة قال: بينما الحبشة يلعبون عند رسول الله ﷺ بِحِرابهمْ اذْ دخل عمر بن الخطاب رضي الله عنه فأهوى الى الحَصْباءِ يَحْصِبُهُم بها، فقال لهُ رسول الله ﷺ: دَعْهُمْ يا عمر)) رواه البخاري ومسلم، واتە: لەکاتێکداحەبەشییەکان لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بە نێزەکانیان یارییان دەکرد، عومەری کوڕی خەتتاب وەژوور کەوت‌و داهاتەوە چەوی هەڵگرت، کە پێیاندا بدات، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەی عومەر لێیان گەڕێ!

٢- (عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال: دخل النبيُّ مكة في عُمرة القضاءِ وابن رواحة بين يَدَيْه يقول:

خَلُّوا بنـي الكفـار عن سـبيلـه
اليوم نضـربكم على تأويلـه
ضَـرْبـاً يُزِيـلُ الهـام عن مقيلـهِ
ويُذْهِـلُ الخيـل عن خليلـه

فقال عمر: يا ابن رواحة في حرم الله وبين يدي رسول الله تقولُ هذا الشِّعر؟!

((فقال النبي ﷺ: خَلِّ عنه فَوَالذي نَفْسي بيده لكلامُهُ أَشَدُّ عليهم من وَقْعِ النَّبْلِ)) رواه النسائي والترمذي وأبو يعلى وابن حِبّان والبيهقي وقال الترمذي: حديث حسنٌ صحيحٌ، واتە: لەکاتی عومرەی گێڕراوەدا پێغەمبەر ﷺ چووە مەککەوە، عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەش لەپێشیەوە بوو دەیگوت:

هۆ کافرینە ڕێی بۆ چۆڵ بکەن، ئەمڕۆکە لەسەر جێبەجێ کردنی کتێبی خوا لێتان دەدەین، لێدانێك سەر لە شوێنی خۆی لابەرێ‌و، بەهۆیەوە دۆست ئاگای لە دۆست نەمێنێ.

عومەریش گوتی: ئەی کوڕی ڕەواحە! لە حەرەمی خواداو لەپێش دەستی پێغەمبەری خوادا ئەم شیعرە دەڵێی؟!

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: وازی لێبێنە، سوێند بەو کەسەی گیانی بەدەستە، شیعرەکانی لە زەبری تیر لەسەریان کاریگەرترن.

وەك دەبینین عومەری کوڕی خەتتاب، هەم یاریکردنی حەبەشەییەکان بە نێزەکانیانو، هەم گوتنی شیعری (عبدالله بن رواحة)ی لەلای پێغەمبەر ﷺ بە هەڵە زانیوەو ڕەخنەی لێگرتوون، جا ئایا دەگونجێ بگوترێ: عومەر یارییکردن بە نێزەو شیعر گوتنی پێ حەرام بووە؟! دیارە نەخێر بەڵکو مەسەلەکە هەر ئەوەبووە،کە پێیان وابووە پێیەو ڕێزی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو جۆرە شتانەدا ناگونجێ، ،بەڵام پێغەمبەر بۆی ڕوون کردوونەوە،کە نەیان پێکاوە.

<u>چوار</u>: وەسفکردنی ئەبوبەکریش -خوا لێی ڕازی بێ- بۆ گۆرانییو دەف بە (مزمار الشيطان)، هەر لەبەر ئەوەیە،کە شەیطان پشکی هەیە لە خافڵانو سەرگەرمبوون (لهو)دا، چونکە،کەمترین پلەی (لهو)، دوورخستنەوەی مرۆڤە لەسوودو کەڵکی قیامەتی، لەوبارەشەوە شتی دیکەی هاووێنە هەیە، بۆ نموونە:

١- ((عن السائب بن يزيد أن امرأةً جاءت الى رسول الله ﷺ فقال: ياعائشة أتعرفين هذه؟ قالت: لا يا نبيَّ الله، فقال: هذه قَيْنَةُ بني فُلان، تُحِبِّين أن تُغَنِّيكِ؟ قالت: نعم، قال: فأعطاها طَبَقاً فَغَنَّتْها، فقال النبي ﷺ: قد نفخ الشيطان في مِنْخَرَيْها)) رواه أحمد والنسائي والطبراني وهو صحيح، واتە: ئافرەتێك هاتە لێی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەی عائیشە ئەمە دەناسی؟! گوتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئەوە گۆرانیی بێژەکەی فلانە تیرەیە، ئایا حەزدەکەی گۆرانیت بۆ بڵێ؟ گوتی: بەڵێ، دەڵێ ئەویش -واتە پێغەمبەر ﷺ- سینییەکی وێدا (تاکو لەجیاتی دەفو تەپڵ بەکاری بێنێ)

ئیدی ئەویش گۆرانیی بۆ گوت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: شەیطان فووی بە تفنکەکانیدا کردوە.

ئاشکراشە کەمەبەستی پێغەمبەر ﷺ لەوتەعبیرەی دوایی (قد نفخ الشيطان في مِنْخَرَيْها) ئەوەیە،کە باش تەفاعولی لەگەڵ گۆرانییەکەیدا کردوە.

٢- ((عن عائشة قالت: كان رسول الله ﷺ جالساً فسمعْنا لَغَطاً وصوت صِبْيانٍ فقام رسول الله ﷺ فاذا حَبَشيَّةٌ تَزْفِنُ والصبيان حولها، فقال: ياعائشة تعالي فانظري فَجِئْتُ فَوَضَعْتُ لَحْيَيَّ على مَنْكِبِ رسول الله فجعلت أنظر اليها مابين المَنْكِبِ الى رأسه، فقال لي: أما شبِعْتِ؟! أما شبِعْتِ؟! فجعلت أقول: لا، لأنظر مَنْزِلتي عنده، إذ طَلَعَ عمر، قالت: فارفضَّ الناس عنها، فقال رسول الله ﷺ: إني لأنظر الى شياطين الجنِّ والانس قد فَرّوا من عمرَ، قالت: فَرَجَعْتُ)) رواه الترمذي والنسائي وقال الترمذي: حسن صحيح، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، کە ئێمە غەڵبە غەڵبو دەنگی مندالانمان بیست، پێغەمبەری خواش ﷺ هەڵسا (بزانێ چی‌یە؟) بینی ئافرەتێکی حەبەشی بوو هەڵدەپەڕی‌و منداڵیشی بەدەورەوە بوون، فەرمووی: عائیشە وەرە تەماشا بکە! منیش چووم چەناگەم خستە سەر شانی پێغەمبەری خواو لەبەینی شانو سەرییەوە تەماشایم دەکرد، (پاش ماوەیەك) پێی فەرمووم: ئەوە هەر تێر نەبووی؟! ئەوە هەر تێر نەبووی؟! منیش دەمگوت: نەء، ،تاکو بزانم قەدرو پێیەم لەلای چۆنە؟ ئیدی کتو پڕ عومەر وەدەرکەوت، گوتی: خەڵکەکەش لەدەوری ئافرەتەکە بلاو بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێستاکە تەماشای شەیطانەکانی جن‌و مرۆڤ دەکەم، کە لە عومەر ڕادەکەن، دەڵێ: ئەوجار منیش گەڕامەوە (ماڵ).

ئاشکراشە،کە مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لە وشەی: (شياطين الجنّ والإنس) کەسانێك بووە،کە سەرگەرمی تەماشاکردن‌و پێوە خافڵانی هەڵپەڕین‌و شایی ئەو ئافرەتە حەبەشییە بوون، کە دیارە جۆرێك بووە لە (لهو)، وەك

پێشتریش گوتمان شەیطان،کەمو زۆر، پشكو بەشی لـە لـەهودا هەیـە، بـەڵام بێگومان ئەو تەعبیرو وشەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناگونجێ بكرێتە بەڵگەی قەدەغەبوونی تەماشاكردنی ئەو دیمەنەی،كە پێغەمبەر خۆی بانگی عائیشەی كردوە بۆ تەماشاكردنی، ئایا دەگونجێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان بەشتی حەڕام بكات، یان پێشنیاری بكاتو لێی بێدەنگ بێ؟! بێگومان نەخێر.

پێـنج: لەڕاستیدا پێغەمبەری خوا ﷺ پشتگیریی ئینكارییكردنەی ئەبوبـەكری نەكردوە، بەڵكو بەپێچەوانەوە ئینكاریی لە ئینكارییەكەی كـردوەو ڕەخنــەی لێگرتوە، وەك لە ڕیوایەتێكی (بخاري و أحمد وطبراني و أبو نُعَيْم)دا هاتوە، كە فەرموویەتی: (دعْهُما يا أبابكرٍ، إن لكلِّ قومٍ عيداً، وإن عيدَنا هذا اليوم) واتە: ئەی ئەبوبەكر وازیان لێ بێنە! هــەموو كۆمــەڵێك جـەژنێكیان هەیــەو جەژنی ئێمەش ئەمڕۆیە.

ئنجا،ئەگەر بشگوترێ: ئینكاریی كردنەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەبوبەكر (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، لەبـەر ئەوەبووە،كـە ئـەو ڕۆژە، ڕۆژی جـەژن بـووەو هەڵاوێراوە،ئەگەرنا بۆ ڕۆژانی دیكە پشتگیریی كردوە!

دەڵێین: لەسەرچـی پشـتگیریی كـردوە؟! ،ئەگـەر بگـوترێ: لەسـەر ئەوە،كـە گۆرانییو مۆسیقا قەدەغەیە، ئەوە دەركەوت، كە قەدەغـەبوونی گۆرانییو مۆسیقا بەڕەهایی، هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نیە،ئەگەر بگوترێ: لەسـەر ئـەوە پشـتگیریی كردوەو دانی بۆ پێدا هێناوە،كە گۆرانییو مۆسیقا بە (مزمار الشيطان) ناوبردوە، دەڵێین: ئەوە ڕاستە،بەڵام ڕوونـمان كردەوە،كە ئەو جۆرە تـەعبیرە، مەبەسـتێكی تایبەتی هەیەو بەڵگەی قەدەغەبوون نیە.

شـەش: (تعليل)كردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ڕەوایی گۆرانییو مۆسیقا بەوە،كە ڕۆژی جەژنە، مـەبەست پێی ڕەوایی (إباحة)ی تەنیاو ڕووت نیە، بەڵكو مـەبەست پێی ئەوەیە،كە لە ڕۆژی جەژندا شتێكی پەسندەو، تەنیا ڕەوا (مباح)ی ڕووت نیە، چونكە وەك پێشتریش باسمان كرد، (لهو) هەركات بەرژەوەندیەكی دەهێنایەدی، ئەوە حوكمەكەی لە ڕەوابوونەوە هەڵدەكشێ بۆ پەسـند بـوونو، جـاری وایــە

پێویست بوونیش، ئنجا مەبەست لەو هەڵاواردن (إستثناء)ەی جەژنیش کورت هەڵێنان (حَصْر) نیە لە جەژندا، بەڵکو مەبەست نموونەیەکە لەو بۆنە (مناسبة)انەی،کە واباشە خۆشحاڵیی‌و شادییان تێدا دەرببڕێ،ئەگەرنا، وەك دواتر باسی دەکەین، بۆنەکانی شادیی، هەرجەژنەکان نین، بەڵکو زیاترن، بۆ نموونە: گەڕانەوە لە سەفەر بەسەلامەتیی‌و دەعوەت‌و نان خواردن‌و...هتد.

شایانی باسیشە، کە مەبەست لە ڕستەی (وَلَيْستا بِمُغَنِّيَتَيْنِ) وەك بەقەدەغەدانەرانی گۆرانیی‌و مۆسیقا گوتوویانە، ئەوەنیە،کە: (باش گۆرانیی‌یان نەدەزانی)، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە،کە: (گۆرانیی‌یان نەکردبووە پیشە)، چونکە ئەم لێکدانەوەیە وێڕای گونجانی لەگەڵ سیاقی فەرموودەکەدا، هەندێك وشەی چەند ڕیوایەتێکی ڕاستی فەرمایشتەکەش پشتگیریی، وەك:

أ- (قَيْنَتان تُغَنِّيان)،کەدیارە (قَيْنة)ش بەمانای گۆرانیی بێژ (مُغَنِّية)ە.

ب- (وحَمامة وصاحبتهما تُغَنِّيان)،کەئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: ئەو دوو ئافرەتە گۆرانیی بێژی کارامەو شارەزاو ناسراو بوونە.

## ٧) دەقی حەوتەم:

((عن نافع مولى ابن عمر رضي الله عنهما: أنَّ ابن عمر سَمِعَ صوت زمّارة راعٍ فَوَضَعَ أُصْبُعَيْهِ في أُذُنَيْـه وَعَدَلَ راحِلَته عن الطريق وهو يقول: يا نافع أتَسْمَعُ؟ فأقول: نعم، فَيَمْضي، حتى قُلت: لا، فَوَضع يديه وأعاد راحِلَته الى الطريق، وقال: رأَيْتُ رسول الله ﷺ وَسَمِعَ صوت زمّارةِ راعٍ فَصَنَعَ مثل هذا)) رواه أحمد وأبو داود والطبراني وابن حِبّان وغيرهم وهو صحيح، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر -خوا لێیان ڕازی بێ- گوێی لەدەنگی بلوێری شوانێك بوو، یەکسەر دوو پەنجەکانی خستنە گوێیەکانییەوەو وڵاخەکەی لاڕێ کردو گوتی: ئەی نافیع دەنگەکەی هەر دەبیستی؟ منیش دەمگوت: بەڵێ، ئیدی هەر دەڕۆیی‌و دوور دەکەوتەوە،هەتا گوتم: نەخێر، ئنجا دەستی بەردانەوەو وڵاخەکەی هێنایەوە سەر ڕێ، گوتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی گوێی لە دەنگی شمشاڵی شوانێك بوو، بەم شێوەیەی کرد.

جا ئەوانەی ئەم فەرمووودەیەش بەبەڵگەی قەدەغەبوونی گۆرانییو مۆسیقا دادەنێن، بەمجۆرە بەبەڵگەی دێننەوەو دەڵێن:

ئەگەر شمشاڵو بلوێری شوان قەدەغە نەبوایە، پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجەی نەدەخستنە گوێیەکانیەوە، تاکو گوێی لەدەنگەکەی نەبێ!

## هەڵسەنگاندن :

ئێمەش بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو بە بەڵگە هێنانەوەیە، دەڵێین:

یەك: ئەو قسەیە،کە دەڵێ: ئەگەر دەنگی شمشاڵ حەرام نەبوایە پێغەمبەر ﷺ پەنجەی نەدەخستە گوێیەوە، ئەوە دەگەیەنێ، کە گۆرانییو مۆسیقا بە بەڵگەیەکی پێشووتر قەدەغەبوونیان ئیسپات بووبێ،بەڵام هەرچەندە دەگەڕێین ئەو بەڵگەیە دیار نیە.

دوو: ئەو فەرموودەیە تەنیا ئەوە دەگەیەنێ، کە پێغەمبەری خوا خۆی لە بیستنی پاراستبێ، دیارە هەرئەمەش شایستەی پێغەمبەرە ﷺ، چونکە خافڵان بە (مَلاهـي)یەوە لە خەسڵەتە بەرزەکان (فضائل) نیە،تاکو دوا ڕۆژ داواکەران پێیەوە سەرگەرم بن، چ جای پێغەمبەری خوا ﷺ! وەك چۆن لەکاتی گۆرانیی گوتنو دەف لێدانی دوو ئافرەتە گۆرانیی بێژەکە لە ماڵی عائیشەدا، پێغەمبەر ڕووی وەرچەرخاندوە، وەك لەرپوایەتێکی (بخاري ومسلم)دا هاتوە: (فاضطجع على الفراش وحوَّل وَجْهَهُ) واتە: لەسەر جێگا ڕاکشاو ڕووی خۆی وەرچەرخاند.

ئنجا دیارە پێغەمبەری خواش ﷺ وەك دایکمان عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- گوتوویەتی: (كان رسول الله ﷺ يذكر الله على كلِّ أحيانـِهِ) رواه أحمد ومسلم وأبو داود والترمذي وابن ماجه، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو هەردەم یادی خوای دەکرد.

سێ: ئنجا سەرباری ئەوە،کەڕابرد،ئەگەر بڵێین: گوێگرتن، یان گوێلێبوونی دەنگی شمشاڵو بلوێر حەڕامە، لەگەڵ چەند پرسیارێکی بێ وەڵامدا ڕووبەڕوو دەبینەوە:

١- بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شوانەکەی ڕوون نەکردەوە،کە شمشاڵو بلوێر لێدان حەڕامە؟!

دیارە وەڵامدانەوەش بەوەکە:

أ- شوانەکە لەسەر لوتکەی چیا بووە.

ب- شوانەکە منداڵی نابالغ بووەو موکەللەف نەبووە.

ج- پێغەمبەر ﷺ دەنگەکەی بیستوە،بەلاّم نەیبینیوە.

هیچ نیە، چونکە ئەم قسانە هەموویان گۆترەکارین.

٢- بۆچی پێغەمبەر نەهی لە (ابن عمر) نەکرد، کە گوێ بگرێو بۆی ڕوون نەکردەوە،کە حەڕامە؟!

٣- بۆچی (ابن عمر) نەهی لە (نافع) نەکرد، کە گوێ نەگرێو قەدەغەبوونی ئەو دەنگەی بۆ ڕوون نەکردەوە.

چوار: ئنجا،ئەگەر بلێین: گوێ لێبوون (سَماع)و گوێ لێگرتن (إستماع) لەیەك جیان، دەڵێین: ڕاستە،بەلاّم خۆ پێغەمبەر ﷺ بە (ابن عمر)ی فەرموو، گوێ هەڵبخاتداخۆ دەنگەکەی هەردەبیستێ، یان نا؟ هەروەها (ابن عمر)یش لەگەڵ (نافع)دا بەهەمان شێوە!

کەواتــە:

ئەم فەرمایشتە، نەك هەر بەڵگەی قەدەغەبوونی گۆرانییو مۆسیقا نیە، بەڵکو بەڵگەی ڕەوابوون (مباح)یشیانە، ئەوەندە هەیە لێی دەفامرێتەوە،کە پەسند وایە مرۆڤ مادام بۆنەیەك نەبێ داخوازی بکات، گوێ بۆ ئەو جۆرە دەنگە ڕانەگرێ، بەتایبەت بۆ کەسێك،کە بیەوێ پارێزو دوور بینی بکات.

## ٨) دەقی هەشتەم :

((عن عامر بن سعد البَجَليِّ قال: دخلتُ على أبي مسعود وقرظة بن كعب وثابت بن يزيد، وجوارٍ يَضْرِبْنَ بِدُفٍّ لَهُنَّ وَيُغَنِّينَ، فقلتُ: تُقِرُّونَ بهذا وأنتم

أصحابُ رسول الله ﷺ ؟! قالوا: إنه رُخِّصَ لنا في الغناءِ في العُرْس والبكاءِ على الميِّت في غَيْر نَوْحٍ)) رواه النسائي والطبراني والبيهقي والحاكم وغيرهم وهو صحيح، واتە: لە (أبو مسعود)و (قرظة بن كعب)و (ثابت بن يزيد) وەژووركەوتم، چەند كەنیزەكێك دەفیان لێدەداو گۆرانییان دەگوت، منیش گوتم: ئێوە هاوەڵانی پێغەمبەری خوان ﷺ لەمەش بێدەنگ دەبن؟! گوتیان: مۆڵەتدراوین،كە لەكاتی زەماوەندا گۆرانیی هەبێ‌و، لەسەر مردووش گریان ، بەڵام بەبێ پێهەڵاگوتن.

چۆنیەتی بەڵگە هێنانەوەی بەقەدەغەدانەرانی گۆرانییو مۆسیقا، بەم فەرموودەیەش ئەوەیە،كە دەڵێن:

وەڵامی هاوەڵان بۆ كەسێك،كە ڕەخنەی لێیان گرتوە لەسەر ئامادەبوونیان لە كۆڕی گۆرانییو دەف لێداندا بەوە،كە لەكاتی زەماوەندو بووك هێناندا مۆڵەت دراون، بەڵگەیە لەسەر ئەوە،كە لە غەیری ئەو حاڵەتە هەڵاوێرراوەدا، قەدەغەیەو دیارە قەدەغەبوونی بەشداریكردنی كۆڕی گۆرانییو مۆسیقاش، بەڵگەی حەرامبوونیانە.

## هەڵسەنگاندن:

ئێمەش لەوەڵامدا دەڵێین:

یەك: ئەم فەرموودەیە تەنیا ئەوە دەگەیەنێ، كە دەفو گۆرانیی لەكاتی زەماوەندا مۆڵەت دراون‌و دروستن، ،بەڵام ئەوە ناگەیەنێ، كە لەغەیری زەماوەندا مۆڵەت نەدرابن، چونكە وەك پێشتر گوتمان: (لهو) لە جۆری هەڵس‌و كەوتەكان (المعاملات)ە، كە ئەسڵ تێیدا ڕەواییە، مەگەر بەڵگە هەبێ لەسەر هەڵاواردنی شتێك،بەڵام هیچ بەڵگەیەك لەسەر قەدەغەبوونی گۆرانییو مۆسیقا نیە لە غەیری زەماوەندا.

دوو: وشەی مۆڵەت (رخصة) بەرانبەر عەزیمەت (عزيمة)ە نەك حەرام، جادیارە، كە لە بواری خافڵان‌و سەرگەرمییەكان (الملاهي)دا عەزیمەت لە جیددییەت

(جِدّ)دایە، نەك گاڵتەو یاریی (الهزل واللّعب)و، ژیانیش جیددیەت تێیدا ئەسڵ‌و بنچینەیەو، گاڵتەو یاریی شتێکی کاتییو زوو تێپەڕە.

سێ: یەکێك لە بەڵگەکانی ڕەواییو مۆڵەتدرانی گۆرانییو مۆسیقا لەغەیری حاڵەتی بووك گواستنەوەشدا ئەم دەقەیە:

((عن طارق بن شهاب قال: دخلتُ على عِدَّةٍ من أصحاب رسول الله ﷺ وهم مُعْتكفون على شرابٍ لهم وعندهم قَيْنَة، فقلت: أنتم النُّجَباء من أصحاب رسول الله!! فقال أبو مسعود الأنصاري، انَّ رسول الله ﷺ رخَّصَ لنا في الغناءِ في العُرْسِ)) أخرجه أبو الشيخ الأصفهاني في (طبقات المحدِّثين بأصبهان) رقم: ٦٣، وإسناده صحيح، واتە: لە ژمارەیەك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ وەژوور کەوتم، کە سەرگەرمی خواردنەوەی شتێك بوون -کە دیارە مەبەستی خواردنەوەیەکی حەڵاڵە- ئافرەتێکی گۆرانیی بێژیان لەلابوو، منیش گوتم: ئەدی ئێوە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا نین؟! ئەبو مەسعودی ئەنصاریی گوتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوین،کە لەکاتی زەماوەندا گۆرانیی هەبێ.

وەك دەبینین:

(أبو مسعود الأنصاري) مۆڵەتدانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ گۆرانیی گوتنی کاتی زەماوەندی، کردۆتە بەڵگەی ڕەوایی گۆرانیی لەحاڵەتی دیکەی ئاساییدا.

## ٩) دەقی نۆیەم:

((عن السائب بن يزيد: أن امرأة جاءت الى رسول الله ﷺ فقال: ياعائشة أتعرفين هذه؟ قالت: لا يا نبيَّ الله، فقال: هذه قينَة بني فلان، تحبِّين أنْ تُغَنِّيك؟ قالت: نعم، قال: فأعطاها طبقاً فَغنَّتْها، فقال النبي ﷺ قد نفخ الشيطان في مِنْخَرَيْها)) رواه أحمد والنسائي والطبراني وهو صحيح.

جا ئێمە پێشتر ئەم فەرمایشتەمان مانا کردو چۆنیەتی بە بەڵگە هێنرانەوەیشی لەسەر مەبەستی ناوبراو بەم شێوەیە:

دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ گۆرانیی بێژەکەی بەوە وەسف کردوە،کە شەیطان فووی بە تفنکانیدا کردوە، جا ئەگەر گۆرانیی حەڕام نەبوایە، پاڵ نەدەدرایە لای شەیطانو ئاوا وەسف نەدەکرا!

## هەڵسەنگاندن :

ئێمەش لەوەڵامدا دەڵێین:

یەکەم: پێشتر لەکاتی توێژینەوەی دەقی (٦)دا خستمانە ڕوو، کە پاڵدرانی شتێك بۆلای شەیطان وەك (مزمار الشیطان)، حەڕامیی ئەو شتە ناگەیەنێو، هۆی ئەو جۆرە ناونرانەشمان ڕوون کردەوە.

دووەم: جێی سەرسوڕمانە کە:

١- ناساندنی پێغەمبەر ﷺ گۆرانیی بێژە ئافرەتەکە بەعائیشە.
٢- پێشنیار کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ عائیشە، کە ئافرەتەکە گۆرانیی بۆ بڵێ.
٣- پێدانی تەبەقێك،کە لەجیاتی دەف بەکاری بێنێ..

نەکرێنە بەڵگەی ڕەوایی گۆرانییو مۆسیقا، ،بەلاَم وشەو تەعبیرێك،کە زیاتر بۆ حاڵەتی سەرسام (مُعْجَبْ)بوون بەکاردێ، بکرێتە بەڵگەی قەدەغەبوونیان!

## ١٠) دەقی دەیەم:

((عن علي بن أبي طالب قال: سمعتُ رسول الله ﷺ يقول: ما هَمَمْتُ بشيء (وفي لفظٍ: بقبيحٍ) عمّا أهلُ الجاهلية يَهُمُّون بهِ الاّ مرَّتَيْنِ من الدَّهْرِ، كلاهُما يعصمني الله تعالى منهما، قلت ليلةً لِفتىً كان معي من قريشٍ في أعلى مكة في أغنامٍ لأهلها ترعى: أبْصِرْ لي غَنَمي حتى أسْمُرَ هذه الليلة بمكة كما تَسْمُرُ الفِتيانُ، فقال: نعم، فخرجت، فلما جئت أدْنى دارٍ من دور مكة سَمِعْتُ غناءً

وصوت دفوفٍ وزمرٍ (وفي لفظٍ: عَزْفاً بِغرابيل ومزامير) فقلت: ما هذا؟! قالوا: فلانٌ تزوج فلانةً، لرجلٍ من قريشٍ تزوج امرأةً، فلهوتُ بذلك الغناء والصوت (وفي لفظٍ: جلستُ أنظر) حتى غَلَبَتْني عيْني فَنِمْتُ فما أيقظني الاّ مَسُّ الشمسِ، فرجعتُ، فسمعت مثل ذلك، فقيل لي مثل ما قيل لي، فَلَهَوْت بما سَمِعْتُ (وفي لفظٍ: فجلستُ أنظر) وغَلَبَتْني عيْني، فما أيقظني الاّ مَسُّ الشمسِ، ثم رجعت الى صاحبي، فقال: ما فَعَلْتَ؟! فقلتُ: ما فعلت شيئاً. قال رسول الله ﷺ: فوالله ما هَمَمْتُ بَعْدهُما بسوءٍ أبداً، ممّا يعمل أهل الجاهلية حتى أكرمني الله تعالى بِنُبوَّتِه)) أخرجه ابن إسحاق في السيرة، والبخاري في التأريخ الكبير والبزَار في مُسنده والفاكهي في (أخبار مكة) وابن حِبَّان في صحيحه والحاكم والبيهقي وأبو نُعيم كلاهما في (دلائل النبوة) وهو صحيح.

واتە: عەلی کوڕی ئەبوطالیب دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: هەرگیز بەدڵمدا نەهاتوە شتێك (وەلەبێژەیەكدا: خراپەیەك) بكەم لەوەی،كە خەڵكی سەردەمی نەفامیی دەیانكرد، ،جگە لە دوو جاران، هەردوو جارەكەش خوای بەرز پاراستمی:

شەوێكیان بەگەنجێكی قوڕەیشییم گوت، كە لەگەڵم بوو و لە سەروی شاری مەككە لەگەڵ ڕانە مەڕێك بوو بۆ خاوەنەكەی، دەڵەوەڕا: چاوت لە مەڕەكەمەوەبێ،تاكو ئەمشەو منیش وەك گەنجان شەو بگوزەرێنم، گوتی: بەڵێ.

ئیدی هاتم ، هەتا گەیشتمە نێزیكترین ماڵ لە ماڵەكانی مەككە،گوێ بیستی گۆرانیی و دەنگی دەف لێدان-ی ئامێری دەنگی- (وەلەبێژەیەكدا: لێدانی دەفو زوڕنا) بووم، گوتم: ئەمە چی‌یە؟! گوتیان: فلانكەس فلانەی هێناوە، پیاوێكی قوڕەیشی ژنێكی هێنابوو، ئیدی منیش بەو گۆرانیی و دەنگە خافلام (وەلەبێژەیەك دا: دانیشتم تەماشام كرد)،هەتا چاوم چووە خەوو نووستم، تەنیا بەتینی خۆر خەبەرم بووەوە، ئیدی گەڕامەوەو (شەوێكی دیكە) دیسان وەك ئەوەی پێشووم بیستەوەو (پاشداواكردن) ئەوەم پێگوترا، كە پێم گوترابوو، منیش خافلام

بەوەی،کە بیستم (وە لەبێژەیەکدا: دانیشتم تەماشام کرد) وە چاوم چووە خەوو تەنیا بە تینی خۆر بێدار بوومەوە، پاشان گەڕامەوە لای هاوەڵەکەم، گوتی: چیت کرد؟ گوتم: هیچم نەکرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەخوا دوای ئەوە خراپەم بەدڵدا نەهاتوە لەوەی،کە خەڵکی ڕۆژگاری نەفامیی دەیانکرد، هەتا خوای بەرز بە پێغەمبەرایەتی ڕێزی لێگرتم.

چۆنیەتی بەبەڵگە هێنانەوەی ئەم فەرموودەیەش بەم جۆرەیە: دەڵێن:

پێغەمبەری خوا ﷺ گوێگرتن لە گۆرانییو مۆسیقا بەکردەوەی سەردەمی نەفامیی وەسف کردوەو بە (قبیح و سوء)یش ناوی بردوە، خوای بەرزو مەزن پێش پێغەمبەرایەتییش پێغەمبەر ﷺ خۆی لێ پاراستوە، کەواتە: گوێگرتن لە گۆرانییو مۆسیقا حەڕامە!

## هەڵسەنگاندن :

ئێمەش بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو جۆرە بەبەڵگەهێنانەوەیە دەڵێین:

یەك: ئەوەی،کە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو کەڕەتان بە دڵیدا هاتوە لەکارو ڕەفتاری نەفامێتی بیکات، گوێگرتن لەگۆرانییو مۆسیقا نەبووە، چونکە فەرموویەتی: (کلاهما یعصمني الله تعالی منهما) لەحاڵێکدا، کە بۆخۆی فەرموویەتی: گوێم لەو گۆرانییو دەنگە گرت: (فلهوت بذلك الغناء والصوت)، لە ڕیوایەتێکدا فەرموویەتی: دانیشتمو تەماشام کرد: (فجلست أنظر)، بەڵکو مەبەست لەو شتەی،کە لێی پارێزراوە شتی دیکەی وەك: مەیخۆرییو شتی دزێو بووە.

بەڵگەیەکی دیکەش لەوبارەوە ئەوەیە،کە کاتێك گەڕاوەتەوە لای هاوەڵەکەیو لێی پرسیوە: چیت کرد؟! فەرموویەتی: هیچم نەکرد: (مافعلتُ شیئاً) کەواتە: نابێ مەبەست لە شتی خراپو دزێو (سوء و قبیح)ی نەفامیی،کە خوا لێی پاراستوە، گوێگرتن لە گۆرانییو ئامێرەکانی بووبێ، چونکە ئەوەی کردوەو

،هەتا چاوی چۆتە خەو پێیەوە خافڵاوە: (فلهوتُ بذلك الغناءِ والصوت حتى غَلَبَتْني عيْني).

دوو: ئەم فەرموودەیە، نەك هەر بەڵگەی حەرامیی گۆرانییو مۆسیقا نیە، بەڵكو بە پێچەوانەوە بەڵگەی ڕەوایی گوێ لێگرتنیشیانە، مادام نەكرابنە وەسیلەی شتی خراپو حەرام، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایگەیاندوە،كە خوای كاربەجێ، پێش پێغەمبەرایەتی (نُبوَّة)یش لە: دزێوییو خراپە (قبیح و سوء)ی نەفامێتی پاراستوویەتی، ئنجا خۆیشی بە ڕاشكاویی فەرموویەتی،كە بە گوێ لێگرتنی گۆرانییو دەنگی ئامێرەكانی خافڵاوە ، هەتا خەوی لێكەوتوە، جا بێگومان،ئەگەر گوێ لێگرتنی گۆرانییو ئامێرەكانی خراپو دزێو بوایە، ئەوە خوا لەویشی دەپاراست، وەك چۆن لە شتە خراپو دزێوەكانی دیكەی پاراستوە، كەواتە: گوێ لێگرتنی گۆرانییو مۆسیقا بەڕەهایی، خراپو حەرام نیە، مادام شتی خراپیان تێكەڵ نەبووبێو نەكرابێتە هۆكاری گوناهو خراپە.

سێ: لەم فەرموودەیە دەفامرێتەوە،كە ئامێرە دەنگییەكان (معازف)ی ڕۆژگاری نەفامییو ڕۆژگاری پێغەمبەریش ﷺ وەك هەندێك گوتوویانە بەس (دەف) نەبووە، چونكە، باسی (غرابیل)و (مزامیر) كراوە، هەردوو وشەی (زَمْر)و (عَزْف)یش هەربەكار هێنراون، جا ،ئەگەر وشەی (غرابیل)،كەكۆی (غِرْبال)ەو بە مانای دەف دێ، بەس دەف بگرێتەوە، ئەوە وشەی (مزامیر) وەك پێشتر گوتمان چەمكو واتایەكەی گشتگیرەو، سەرجەم ئامێرە دەنگیەكان دەگرێتەوە، هەروەها هەردوو وشەی: (زَمْر)و (عَزْف)یش بەهەمان شێوە.

## (١١) دەقی یازدەیەم:

((عن ابن عباس عن النبي ﷺ قال: إِنَّ الله حرَّم عليَّ - أَوحرَّم - الخَمْرَ والمَيْسِرَ والكُوبة، وكلُّ مُسْكرٍ حرامٌ)) رواه أحمد وابن أبي الدنيا في (ذم الملاهي) رقم: ٧٦، والبيهقي في (الكبرى) والدار قطني، ورواه الطبراني بلفظ مختلف، وهو صحيح.

واتە: بێگومان خوا مەیو قومارو (كُوبَة)ی لەسەرم قەدەغــە كـردوە، هــەموو سەرخۆشكەرێكیش حەرامە.

شایانی باسیشە كە مانای وشەی (كُوبَة) تاوڵە (نَرْد)یە،،بـەلاّم ئێمـە دوامــان خست،تاكو كاتی ئاسایی خۆی دێو، ئێستاش با چۆنیەتی بە بەڵگە هێنرانــەوەی ئــەم فەرموودەیــە لەســەر بەقەدەغــە دانــانی گـۆرانیی‌و ئــامێرە دەنگییــەكان، بخەینەڕوو:

گوتوویانە:

وشەی (كُوبَة) بەمانای تەپڵ (طَبْل)ە، چونكە لە (سُفْیان الثوري)یەو هاتوە،كە گوتوویەتی: (قُلْت لِعَليٍّ بن بَذِیمة: ما الكوبـة؟ قـال: الطَبــلُ) رواه أحمـد وغـیره وهـو صحیح، واتە: بەعەلی كوڕی بەزیـمەم گوت: (كوبة) چیيە؟ گوتی: تەپڵە.

كەواتە: ئەم فەرمایشتە دەق (نصّ)ە لەسەر قەدەغەبوونی تەپڵ، كە ئەویش یەكێكە لە (معازف)و دیارە ئامێرە مۆسیقاییەكانی دیكەش لە تەپڵ خراپترن، كەواتە: هەمان حوكمی وییان هەیە:

## هەڵسەنگاندن:

ئێمەش لەوەلاّمدا دەڵێین:

یــەك: تەفسیری (إبن بَذِیمة) بۆ وشەی (كوبة)،كەگوایە مانای (طَبْل)ە ڕاست نیە، چونكە: زۆربەی شارەزایانی زمان (كوبة)یان بە تاوڵە (نَـرْد) لێــك داوەتــەوەو تەنیا هەندێكیان بە (طَبْل)، یان (عـود)یان داناوە.

بۆ نــموونە:

(أبو عُبید القاسم بن سلاّم) گوتوویەتی[1]: (وأما الكوبة فإن محمد بن كثیر أخبرني أن الكوبة: النَّرْدُ في كلام أهـل الـیَمَنِ، وقــال غـیره الطبــل) واتــە: وە

---

١) (غریب الحدیث)، ج٤، ص٢٧٨.

(كوبة) وەك (محمد بن كثير) هەواڵی پێداوم لە زاراوی خەڵکی یەمەندا بریتیە لە تاوڵە، هەیشە بەتەپڵی لێك داوەتەوە.

هەروەها (الأزهري)یش لەبارەی ئەم ڕایەوە گوتوویەتی[1]: هەر ئەوە ڕاستە (هو الصحيح).

دیسان (ابن الأثير)یش هەر ئەو ڕایەی بەڕاستتر داناوە، وەك گوتوویەتی[2]: (هي النَّرْدُ، وقيل الطَّبلُ، وقيل: البَرْبَطُ) واتە: بریتیە لەتاوڵە، وەگوتراوە: تەپڵە، وەگوتراوە عودە.

بەڵام (الجوهري) بە تەپڵی گچکەی لێك داوەتەوە، وەك گوتوویەتی[3]:

(و الكوبة: الطَّبلُ الصَّغير المخصّر)

دوو: ئنجا وێڕای قسەی زۆربەی زانایانی زمان، دەتوانین دوو بەڵگەی دیکەش لەوبارەوە بێنینەوە:

١- (بخاري) لە (الأدَبُ المفرد)دا ئەم شوێنەوار (أثر)ەی هێناوە[4]:

(إنّ (فضالة بن عُبَيْد) كان بِجَمْعٍ من الجامع فَبَلَغَهُ أن أقواماً يَلْعبون بالكوبة فقام غضباناً يَنْهى عنها أشدَّ النَّهي، ثم قال: ألا إن اللاّعبَ بها ليأكْلُ قَمْرَها كآكلِ لحمِ الخِنْزير ومُتَوضِّيءٍ بالدم، يعني بالكوبةَ: النَّرْد)، واتە: (فضالة بن عُبَيْد) لەكۆڕێكدادانیشتبوو هەواڵی پێگەیشت، كەكەسانێك یاری بە (كوبة) دەكەن، ئەویش هەڵساو زۆر بەتوندی ڕێگریی لێكرد، پاشان گوتی: ئاگاداربن ئەوەی یاریی پێ بكات، ئەوە ئەو پارەیەی بەهۆیەوە بردوویەتەوە كاتێك

١) (لسان العرب) مادة: قنن.
٢) (النهاية في غريب الحديث والأثر)، ج٤، ص٢٠٧.
٣) (مختار الصَّحاح)، ج١، ص٢١٥.
٤) رقم: ٧٨٨ و ١٢٦٧، وإسنادُهُ حَسَن.

دەیخوات، وەك گۆشتی بەراز بخوات‌و دەستنوێژ بەخوێن بگرێ ئاوایە، مەبەستیشی لە (كوبة) تاوڵە (نَرْد) ە.

شایانی باسیشە، کە (فُضالة) یەکێکە لە زانایانی هاوەڵان لە شام‌و، واشپێدەچێ قسەکەی خۆی لەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ وەرگرتبێ، کە پێشتریش هێناومانەو مانامان کردوە: ((من لعب بالنرد شير فكأنما صَبَغَ يَدَهُ في لحم خنزيرٍ وَدَمِهِ)) رواه مسلم.

٢- (الزَّمَخْشَري) لەبارەی ئەو پەندەوە،کە دەڵێ: (لايَزال معه كُوبُ الخَمرِ وكوبَةُ القَمْر) واتە: بەردەوام پەرداخی شەراب‌و تاوڵەی قوماری پێیە، گوتوویەتی: (وهي النَّرْدُ والشِّطرنج)[1]، واتە: ئەویش تاوڵەو شەترەنجە.

ئنجا ، ئەگەر یەکێك بڵێ: ( علي بن بَذيمة) لە ڕاوییانی فەرموودەکەیەو، گێڕەرەوە (راوي)ش زاناترە بەوەی،کە دەیگێڕێتەوە، کەواتە: تەفسیرو لێکدانەوەکەی وی ڕاستترە بۆ وشەی (كوبة)، دەڵێین:

مەرج نیە ئەم بنچینەیە هەمیشە ڕاست بێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (نَضَّر الله امْرءاً سَمِعَ مِنّا حديثاً فَحَفِظَهُ حتى يُبَلِّغَهُ غَيْرَهُ، فَرُبَّ حامِلِ فقْهٍ الى مَنْ هو أفقه منه وَرُبَّ حامِلِ فقْهٍ لَيْسَ بفقيهٍ) رواه أحمد وأبو داود والترمذي والدارمي وهو صحيح، واتە: خوا ڕووی کەسێك گەشاوە بکات، کە فەرمایشتێکمان لێ دەبیستێ‌و لەبەری دەکات،هەتا دەیگەیەنێتە غەیری خۆی، چونکە هەیە شارەزاییەکی پێیەو دەیگەیەنێتە لەخۆی شارەزاتر، هەیە زانیارییەکی لەبەرە، بەلاّم شارەزاو تێگەیشتوو نیە.

کەواتە: وشەی (كوبة) بە مانای تاوڵە (نَرْد)ەو، بەمانای تەپڵ‌و عوود نیە، بۆیە ناگونجێ ئەم فەرموودەیە بکرێتە بەڵگەی قەدەغەبوونی تەپڵ‌و ئامێرەکانی دیکەی مۆسیقاو گۆرانیی.

## ١٢) دەقی دوازدەیەم:

---

١) (أساسُ البلاغة)، ص٤٠٠.

((عن أبي هريرة قال: قال رسول الله ﷺ: (بِئْسَ الكَسْبُ أَجْرُ الزَّمَّارَةِ) وفي لفظٍ: (نَهَى رسول الله ﷺ عن كَسْبِ الزَّمَّارَةِ)) رواه البيهقي والبغوي في (شرح السنة) وفي (التفسير) وأبو عبيد في (غريب الحديث) والخطيب البغدادي في (التأريخ)، واته: خراپترین بەرهەم کرێی (زمّارة)یە، لەبێژەیەکدا: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی کردوە لەپارەی پەیداکراو بەهۆی (زمّارة)وە.

دیارە وەك ڕوونی دەکەینەوە، وشەی (زمّارة) لێرەدا بەمانای ئافرەتی داوێن پیس (زانیة)ە، ،بەلاّم ئێمە پەلەمان نەکرد لەهێنانی واتایەکەیدا،تاکو دواتر ڕوونی دەکەینەوە.

چۆنیەتی بەبەڵگە هێنانەوەی ئەم دەقەش ئەوەیە،کە مەبەست لە (زمّارة) ئافرەتی گۆرانیی بێژ (مُغَنِّیة)، یان ئافرەتی بەکارهێنەری ئامێرە دەنگییەکانە، جادیارە نەهی کردن لە بەرهەمو کاسبییەکەی، حەرامیی پیشەکەی دەگەیەنێ، کە گۆرانیی گوتن، یان بەکارهێنانی ئامێرەکانی گۆرانییە.

هەڵسەنگاندن :

ئێمەش لەوەلاّمدا دەڵێین:

یەك: وشەی (زمّارة) لەم فەرمایشتەدا بەمانای (زانیة)یە، نەك (مُغَنِّیة)، وەك (أبو عُبید القاسم بن سلاّم) گوتوویەتی[1]:

(قال الحجّاج: الزمّارة: الزانية... فَمعْنى قوله هذا مثل قوله: أنه نهى عن مَهْر البَغيِّ والتفسير في الحديث... وقال بعضهم: الرَّمّازَة وهذا عندي خطأ في هذا الموضع إنما الرَّمّازَةُ في حديث آخر، وذلك ان معناها مأخوذ من الرَّمزِ وهي التي تُومِيءُ بِشَفَتَيْها أو بِعَيْنَيْها، فأي كسْبٍ لها هنا يُنْهى عنه؟...)، واتە: حەججاج گوتوویەتی: (زمّارة) ئافرەتی داوێن پیسە... جا مانای ئەم قسەیەی وەك مانای ئەو فەرموودەیەی دیکە وایە،کە دەڵێ: ڕێگریی کردوە لە کرێی

١) (غريب الحديث)، ج١، ص ٣٤١- ٣٤٣.

ئافرەتی داوێن پیس، کە لە سوننەتدا تەفسیر کراوە... وە هەندێکیان گوتوویانە: (الرَّمّازَة) ،بەلاّم من لێرەدا ئەوەم پێ هەڵەیە، چونکە (الرَّمّازَة) لە فەرمایشتێکی دیکەدا هاتوە، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە،کە مانایەکەی لە وشەی (الرَّمز)ەوە هاتوە، کە بریتیە لەو ئافرەتەی بە لێوەکانی، یان بە چاوەکانی ئاماژە (بۆ پیاوان) دەکات، جا ئایا چ بەرهەمو دەستکەوتێکی لەوەدا هەیە ،تاکو نەهی لێ بکرێ؟!

شایانی باسیشە، کە وشەی (زمّارة)ش بۆیە مانایەکەی (زانية)یە چونکە: خۆیو قسەکانی جوان دەکات، دیارە (الزِّمر) واتە: چاك (الحَسَن) وە (تَزْمُرُ) واتە: جوان دەكات: (تُحَسِّنُ).

دوو: چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەن،کە پشتگیریی ئەو ڕایە دەکەن،کە (أبو عُبيد القاسم بن سلاّم) لەبارەی مانای (زمّارة)ەوە گوتوویەتی، بۆ نموونە:

أ- ((عن أبي مسعود الأنصاري أن رسول الله ﷺ نهى عن ثَمَنِ الكَلْب، ومَهر البَغيِّ، وحُلوانِ الكاهنِ)) متفق عليه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی کردوە لە نرخی سەگو کرێی ئافرەتی داوێن پیسو کرێو بەرتیلی فاڵچی.

ب- ((عن أبي هريرة قال: نَهى رسول الله ﷺ عن كَسْبِ الأمائي)) رواه البخاري.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی کردوە لە بەرهەمی (داوێن پیسیی) کەنیزەکان.

کەواتە: ناگونجێ کە فەرموودەی ناوبراو بکرێتە بەڵگەی قەدەغەبوونی گۆرانییو مۆسیقاو هیچ پەیوەندیی بەو بابەتەوە نیە.

خوێنەری بەڕێـــز!

ئێستاش کە ڕوون بۆوە،کە لە سوننەتی پێغەمبەریشدا، وەك کتێبی خوا، هیچ بەڵگەیەك لەسەر قەدەغەبوونی گۆرانیی‌و مۆسیقا بـەڕەهایی‌و گشـتیی نیـە، بـا بگوازینەوە بۆ سەرنجدانی ئەو شـتانەی دیکە،کـە بەقەدەغـەدانـەرانی گـۆرانیی‌و مۆسیقا بە بەڵگەیان دێننەوە:

## جۆری سـێیەمی بەڵـگەکـانی بەقەدەغەدانـەرانی گـــۆرانیی و مۆســیقــا : یەکـدەنگـیی زانـایـان :

بەڵێ خوێنـــەری بەڕێز!

جۆری سێیەمی بەڵگەکانی بەشێك لەوانـەی گـۆرانیی‌و مۆسـیقا بـەڕەهایی‌و بەگشتیی بەحەرام دەزانن، ئەوەیە،کە دەڵێن:

زانایانی ئیسلام بەگشتیی‌و بەتایبەت هاوەڵان (أصحاب) (خوا لێیان ڕازی بێ) لەسەر ئەوە کۆك‌و یەکدەنگن،کە گۆرانیی‌و مۆسیقا قەدەغەن!

جا هەرچەندە ئێمە لەباسی سێیەمی ئەم بەشـی سـێیەمەدا، بەرپەرچـی ئـەو قسەیەمان داوەتەوە،کە یەکدەنگی (إجماع) زانایان لەسەر قەدەغەبوونی گۆرانیی‌و مۆسیقا هەبێ،بەڵام لێرەشدا چەند قسەیەکی هەر لەبارەوە دەکەین:

## هەڵوەشـاندنەوە:

ئێمە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم قسەو دەعوایە دوو خاڵان دەخەینە ڕوو:

یـــەك: ناگونجێ ئیجماع لەسەر قەدەغەکردنی شتێك دابمەزرێ، کـە لەسـەردەمی هاتنە خواری شەریعەتدا بـووەو -وەك ڕوونیشـمان کـردەوە- هـیچ دەقێکـی قورئان‌و سوننەتی لەسەر نەبێ! چونکە یەکدەنگیی (إجماع) بەس لەسەر ئـەو مەسەلانە دادەمەزرێ، کە بەئاشکرا زانراون لە ئاییندا (مـا عُلِم مـن الـدین

بالضَّرورة))، دیارە ئەمەش بەبێ دەقێكی شەرعیی ڕوونو بێ چەندوچوون، یان زیاتر نایەتەدی.

<u>دوو:</u> لە ڕاستیدا لە سێ ڕووەوە هەبوونی ئیجماع لەسەر ئەو مەسەلەیە ڕاست نیە:

١- هەبوونی چەندان دەقی قورئانو سوننەت لەسەر ڕەوابوونی گۆرانییو مۆسیقا بەچەند مەرجێكەوە، وەك لە ڕابردوودا باسمان كردو لە باسی هەشتەمیشدا بەتێرو تەسەلی قسەی لێدەكەین.

٢- هەر لەزووەوە هەبوونی زانایانێك،كە بەگشتیی گۆرانییو مۆسیقایان بەڕەوا زانیوە، بۆ نموونە هەركام لە: الزُّهري والأوزاعي ومَعْمَر بن راشد ويحيى القَطَّان باسیان كردوە،كە خەڵكی حیجاز (سَماع)یان بەدروست زانیوە، هەروەها زانایانێكی زۆر لەوبارەوە كتێبو نامیلكەو فەتوایان هەن، وەك لە بڕگەی (٣)ی باسی سێیەمی ئەم بەشەدا ناوی چلو شەش (٤٦) لەوانەمان نووسیوە.

٣- زۆرێك لەوانەی باسی یەكدەنگیی زانایان دەكەن، قسەكانی زانایانیان بەوردییو وەك خۆیان نەهێناوە، بۆ نموونە: هەیە باسی (سَماع)ی هەندێك لە ئەهلی تەصەووفی لاڕێ (مُنْحرف)ی كردوە، ،بەڵام كە قسەكەی لێوە نەقڵ كراوە، واپیشاندراوە،كە بەگشتیی قسەی كردوە!

هەیانە، كە بەس قسەی لەبارەی هەندێك لەئامێرە دەنگییەكانەوە كردوە، كەچی واپیشاندراوە،كە بەگشتیی لەبارەی هەموویانەوە دواوە!

هەیانە، كە تەنیا باسی گۆرانییو بەزمی فاسقانی كردوە، بەڵام دوایی قسەكەی گشتێنراوە!

با وێنەیەك لەوبارەوە بێنینەوە بۆ زیاتر ڕوونكرنەوەی مەبەست:

((عن إسحاق بن عيسى الطبّاع قال: سألت مالك بن أنسٍ عَمّا يَتَرَخَّصُ فيه بعض أهل المدينة من الغِناءِ؟ فقال: إنما يَفْعَلُهُ عندنا الفُسّاقُ)) رواه أحمد في (العِلَل) رقم: ١٥٨١، وهو صحيح، واتە: ئیسحاقی كوڕی عیسای طەبباع دەڵێ: لە مالیكی

کوڕی ئەنەسم پرسی لەبارەی ئەو گوتنەوە،کە هەندێك لە خەڵکی مەدینە مۆڵەتی پێدەدەن؟ گوتی: لەلای ئێمە بەس لاڕێبووەکان دەیکەن.

ئاشکراشە کە لێرەدا (مالك) بەس وەسفی واقیعی گۆرانیی بێژانی مەدینەی کردوەو نەیگوتوە: هەرکەسێك گۆرانیی بڵێ، یان گوێی بۆ بگرێ لاڕێ (فاسق)یە، وەك ئێستاکە ئەم قسەیەی (مالك) بەو چەمكو واتایە بەکاردێ!

کەواتە: یەکدەنگیی هەبوونی زانایان لەبارەی قەدەغەبوونی گۆرانییو مۆسیقاوە هەر نەبووە، تاکو بکرێتە بەڵگە!

## جۆری چوارەمی بەڵگەکانی بەقەدەغەدانەرانی گۆرانیی و مۆسیقا: گۆرانیی و مۆسیقا عادەتی خراپەکارانەو خۆ وێچواندنی وانیش قەدەغەیە :

بەڵێ ئەمیش جۆرێکی دیکەیە لەوشتانەی،کە بەقەدەغەدانەرانی گۆرانییو مۆسیقا بە بەڵگەیان هێناونەوەو پوختەکەیشی ئەوەیە،کە: گۆرانییو مۆسیقا تەنیا عادەتو نەریتیی گوناهبارو خراپەکارانە، دیارە خۆ چواندن (تَشَبُّه) بەوانیش حەرامە، وەك لە سوننەتدا هاتوە: (مَنْ تَشبَّه بقومٍ فهو منهم) رواه أحمد وأبو داود، واتە: هەرکەسێك خۆی بە کۆمەڵێك بچوێنێ ئەوە لەوانە.

## هەڵوەشاندنەوە :

ئێمە لەبەرپەرچدانەوەی ئەو قسەیەدا، کە بە بەڵگە زانراوە، دەڵێین:

یەك: ڕاست نیە،کە گوتنو گوێ لێگرتنی گۆرانییو مۆسیقا بەس عادەتو نەریتی گوناهبارو خراپەکاران بێ، چونکە:

أ- لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺو لەکۆمەڵگێی ئیسلامیی یەکەمدا، کە چاکترین‌و پاکترین کۆمەڵگای سەرزەوی بووە، گۆرانیی‌و مۆسیقا هەبووە، وەك پێشتریش خرایە ڕوو، دواتریش تیشکی زیاتری دەخەینە سەر.

ب- لە مێژووی ئیسلامییدا،کەسانی دیندارو خاوەن کەسێیەتیی بەرز، گۆرانیی بێژو مۆسیقار بوونە، بۆ نموونە:

١- إسماعیل بن جامع المُغَنِّي، کە لە ڕۆژگاری شوێنکەوتوانی شوێنکەوتواندابووە[1].

٢- إبراهیم بن سعد بن إبراهیم بن عبدالرحمن بن عوف، کە پێشتریش باسمان کردوەو شێخی ئیمام شافیعی بووەو، (بخاري ومسلم)و ئەوانی دیکەش فەرموودەیان لێ گێڕاونەوەو، کاتی خۆی سوێندی خواردوە،کە پاش گۆرانیی گوتن‌و عوود لێدان نەبێ، فەرموودان باس نەکات[2]!

٣- عُلَيَّةَ بِنْتِ المهدي، کە خوشکی (هارون الرشید) بووەو (الذهبي) لەم بارەیەوە گوتوویەتی[3]: (شاعرة عارفة بالموسیقی رخیمة الصَّوت ذاتُ عِفَّةٍ وتقوىً ومَناقِب) واتە: شاعیرو شارەزای مۆسیقا بووەو دەنگی نەرم‌و بەسۆز بووەو پاك‌و پارێزکارو خەسڵەت بەرز بووە.

٤- إسحاق بن ابراهیم الموصلّي (سَيِّد المُغَنِّين)[4].

دوو: خۆ چواندن (تَشَبُّه) بە ئەهلی کوفر یان خراپەو تاوان، بەرەهایی خراپ نیە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر شتی باشی لە کافران وەرگرتوە، وەك: خەندەك لێدان بەدەوری شاری مەدینەدا، مۆرکردنی نامەکان، گرتنی ڕۆژووی عاشوڕا...

---

١) (الأغاني)، ج٦، ص ٢٨٩.

٢) (رجال صحیح البخاري) للکلاباذي، ج١، ص٥١.

٣) (سیرُ الأعلام النبلاء)، ج١، ص١٨٧.

٤) هەمان سەرچاوە، ج١٠، ص١١٨.

هەربۆیەش (المنّـاوي) لەوبارەوە گوتوویەتی[1]:

(أي: تَزَيّا في ظاهره بِزَيِّهم وفي تعرُّفِه بِفعلهم وفي تَخلُّقه بِخُلُقِهِم، وسار بِسيرتهم وهديهم في ملبسهم وبعض أفعالهم وكان التشابه، بحق قد طابق فيه الظاهر والباطن)، واته: یانی: بەڕواڵەت پۆشاکی ئەوانی پۆشیوەو کردەوەی وانی کردۆتە پیشەو، ڕەوشتی وانی ڕەچاو کردوەو بەڕێی واندا ڕۆیشتوە لە پۆشاكو هەندێك ڕەفتاریاندا، بەجۆرێك،کە ڕواڵەتو پەنهانیان لەوەدا یەکی گرتۆتەوە.

پاشان لەمەسەلەی گۆرانییو مۆسیقادا هیچ خۆشوبهاندن (تَشَبُّه)ێك بەئەهلی کوفرو خراپە نیە، چونکە ئەو مەسەلەیە،کەمو زۆر لەنێو مسوڵماناندا هەر هەبووەو تایبەت نیە بەکافرانو خراپەکارانەوە، هەرچەندە،ئەگەر تایبەتیش بوایە بەوانەوە، مادام لەبواری هەڵسوکەوتەکان (المعاملات) دایە، نەك عەقیدەو عیبادەت، ئەوە بەس ئەو جۆرەیان،کە ناشەرعیی یە ڕەفز دەبوو، نەك بەگشتیی، چونکە وەك پێشتر لە باسی بنچینە شەرعییەکاندا خستمانە ڕوو، بناغە لە هەڵسوکەوتەکاندا ڕەواییو دەستکراوەیی‌یە.

ئنجا سەرباری هەموو ئەوانەش، کە ڕابردن: دەقی: (مَنْ تَشبَّه بقومٍ فهو منهم) لەنێو فەرموودەناساندا کێشەو مشتو مڕی زۆری لەسەرە، (الزركشي) گوتوویەتی[2]: (في سَنَده ضُعْفٌ)، (طبراني) بە (حَسَن)ی داناوە،بەڵام (العراقي) بە بێهێز (ضعيف)ی وەسف کردوە[3].

کەواتە: ئەم جۆری چوارەمەش لەو شتانەی،کە بە بەڵگەی قەدەغەبوونی گۆرانییو مۆسیقا بە ڕەهایی دانرابوون، دەرکەوت، کە بەڵگەنیەو ناگونجێ لەوبارەوە پشتی پێ ببەسترێو دڵی پێ خۆش بکرێ!

---

١) (فيض القدير)، ج٦، ص١٠٤.

٢) (فيض القدير) للمناوي، ج٦، ص١٠٤.

٣) (الغناء والمعازف في الأعلام المعاصر)، ص٢٧٧.

## جۆری پێنجەمی بەڵگەکانی بەقەدەغەدانەرانی گۆرانیی و مۆسیقا : ڕێگـرتن لە گوناهـو خراپـە (سَدُ الذریعـة) :

ئەمیش یەکی دیکەیە لەو شتانەی،کە بەقەدەغەدانەرانی گۆرانییو مۆسیقا بە بەڵگەیان هێناونەوەو، پوختەی مەبەستی ئەم بەڵگەیەش ئەوەیە،کە: (پێویستە ڕێ لەشتی ڕەوا بگیرێ، کە سەردەکێشێ بۆ چوونە نێو شتی قەدەغەوە).

جا دەڵێن: ئێستا ڕۆژگار بەجۆرێکە،کە خەڵکەکەی زۆر تێکچووەو خراپ بووە، بۆیە پێویستە ڕێ نەدرێ، کە بەهۆی گۆرانییو مۆسیقاوە خـەڵك بـەرەو خراپـەی زیاتری ببرێ.

### هەڵوەشـاندنـەوە :

ئێمەش لەوەڵامدا دەڵێیـن:

پێشتر لەبەشی دووەمدا، کە تەرخانمان کردوە بۆ خستنەڕووی چەند بنچینەیەکی شەرعیی،کە پێویستە لەسەر بناغـەیان هەڵسوکـەوت لەگـەڵ هونـەردا بکـرێ، بنچینەی حەوتەمان بەم ناوو نیشانە خستەڕوو:

(ڕێی گوناه گرتن (سَدُّ الذریعـة)، نابێ بکرێتە پاساوی شـتی ڕەوا لـە خـەڵك قەدەغەکردنو، هەرشتێك لە ڕۆژگاری دابەزینی شەریعەتدا ڕەوا بوویێ هەر ڕەوایە).

کەواتە: هەر لەو شوێنە، کە ئاماژەمان پێکرد ئـەو قسـەیەی لێـرە خـەریکی هەڵوەشاندنەوەینی، هەڵمانوەشاندۆتەوە،بەڵام لێـرەش هـەر بـەکورتی قسـەیەکی لەبارەوە دەکەین: (القَـرافـي) لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە گوتوویەتی[1]:

(الذرائع ثلاثـــة أقســامٍ:

١- قسمٌ أجمعت الأُمة على سدِّه.

٢- وقسم أجمعت الأُمة على فَتْحِهِ.

١) (الفروق)، ج٢، ص٢٢.

٣- وقسم اخْتَلَفَتْ فيه، فهناك من يَسُدُّهُ كمالك، ومن يُخالِفُهُ...).

واتە: هۆکارەکانی تووشبوونی گوناه سێ بەشن:

١- بەشێکیان ئوممەت لەسەر ڕێ لێگرتنی یەکدەنگە.

٢- بەشێکیان ئوممەت لەسەر ڕێپێدانی یەکدەنگە.

٣- بەشێکیان تێیدا،کەوتۆتە ڕاجیاییەوە، هەیە ڕێی لـێ دەگرێ وەك (مالك)، هەشە پێچەوانەیەتی.

پاشان (القَرافي) دێتە سەر ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای هەرکام لەو سێ بەشەو، نموونە بۆ هێنانەوەیان و لەبارەی یەکەمیانەوە دەڵێ:

بەشی یەکەم: ئەوەیە،کە ببێتە مایەی زیانێکی مسۆگەر، یان نێزیك لە مسۆگەر، وەك هەڵقەندنی بیرێك لەسەر ڕێگایەك،کە خەڵکی پێدا دەڕوات.

لەبارەی دووەمیشیانەوە دەڵێ:

بەشی دووەم: ئەوەیە،کە مەگەر بەدەگمەن، دەنا سەرناکێشێ بۆ خراپەو زیان، وەك: ناشتنی درەختی ترێ، کە ڕەنگە مەی (شراب)ی لـێ دروست بکرێ.

لەبارەی سێیەمیشیانەوە دەڵێ:

بەشی سێیەم: ئەوەیە،کە لەهیچ کامیان نیە، نە زیـان گەیـەنییو نـەبێ زیـانیی نێزیك مسۆگەر نین.

جا دیارە وەك پێشتر لە باسی (٦)ی ئەم بەشی سێیەمەدا گوتمان، هیچ کام لەو زانایانەی،کە گۆرانییو مۆسیقایان بەڕەوا (مباح) داناوە -مەگەر بەدەگمەن- دەنا کەسیان نەیگوتوە: بەبێ بەندو مەرج (قید وشرط) ڕەوان، بـەڵکو چـەند مـەرجو بەندێکیان بۆ داناون،کە پێشتر خستمانە ڕوو، جا،ئەگەر بێتو ئەو مەرجو بەندانە ڕەچاو بکرێن، ئەوە گۆرانییو مۆسیقا سەرناکێشن بۆ زیانو خراپە، ئـەو کاتـەش نەپێویست دەکاتو، نەڕێشی تێدەچێ بنچینەی ڕێی گوناه گرتن (سَدُّ الذريعة)یان بەسەردا بچەسپێنن.

## جۆری شەشەمی بەڵگەکانی بەقەدەغەدانەرانی گۆرانیی و مۆسیقا : گۆرانیی و مۆسیقا بۆ تێکدانی خەڵك لە شەراب خراپترن :

ئەمیش بەڵگەیەکی دیکەی بەقەدەغەدانەرانی گۆرانیی‌و مۆسیقایەو، نموونەی زۆریش بۆ پشتڕاستکردنەوەی قسەکەیان، لەواقیعی ژیانی هونەرمەندان‌و دەوروبەریشیان دێننەوە!

هەڵوەشاندنەوە :

ئێمەش لەوەلامداو بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم قسەیە دەڵێین:

یەك: ئەگەر مەبەست گۆرانیی‌و مۆسقای ئەهلی کوفرو خراپە بێ، تا ڕاددەیەك ئەم قسەیە ڕێی تێدەچێ،بەلاّم وەك چەند جارێك دووبارەمان کردۆتەوە ئەوانەی،کە گۆرانیی‌و مۆسیقا بەڕەوا دادەنێن، دەڵێن: پێویستە چەند بەندو مەرجێك ڕەچاو بکرێن،کە لەباسی شەشەمی ئەم بەشی سێیەمەدا لەچوار بڕگەدا خستوومانەڕوو، دیارە ئەوکاتەش ئەو کاریگەرییە خراپەیان نابێ.

دوو: ئەگەر ڕاستە گۆرانیی‌و مۆسیقا زیانیان لە شەڕاب زیاترەو، پێویستە لەویش قەدەغەترین! ئەدی کوا بۆچی وەك لەسەر قەدەغەبوونی شەڕاب ئایەت‌و فەرموودەی ڕوون‌و ڕاشکاو هەن، لەسەر قەدەغەبوونی گۆرانیی‌و مۆسیقاش دەقی قورئان‌و سوننەت نابینین؟!

ئاشکراشە، کە پلەی حوکمە شەرعییەکان، لە قورئان‌و سوننەتدا دیاری دەکرێن، نەك بەپێی میزاج‌و ئارەزوو!

سێ: پێویستە بزانرێ، کە زۆرجاران زانایان کاتێك بەتوندی قسەیان لەبارەی گۆرانیی‌و مۆسیقاوە کردوە، مەبەستیان پێی ئەو جۆرە گۆرانیی‌و مۆسیقایەیە،کە نێوەڕۆکێکی خراپ‌و زیانبەخشی هەیەو، کراوەتە هۆکار

(وسيلة)ی گەیشتن بە ئامانجی حەرام! بۆ نموونە باسەرنجی قسەیەکی (إبن تيمية) بدەین لەو ڕووەوە،کە دەڵێ[1]: (الغِناءُ نُهيَ عنه لأنه قدْ يَدعوا الى الزِّنا كما حُرِّمَ النَّظَرُ الى الأجنبية) واتە: بۆیە ڕێگریی لە گۆرانیی کراوە، چونکە ڕەنگە ببێتە هاندەر بۆ زینا، وەك چۆن تەماشاکردنی ئافرەتی بێگانە قەدەغەکراوە).

لەسەر ئەم قسەیەی (إبن تيمية)ش دوو تێبینیم هەن:

یەکەم: وەك دەبینین (إبن تيمية) -خوا لێی خۆش بێ- گۆرانیی دەشوبهێنێ بە ڕوانینی حەرام (نظر)ەوە، دەجا بێگومان وەك چۆن لە بەرانبەر ڕوانینی حەرامو ئارەزووبازانەدا، هی ڕەواو ئاساییش هەیە، بەهەمان شێوە لە بەرانبەر گۆرانیی خراپو هاندەر بۆ زیناو خراپەشدا، هی ڕەواو بگرە پەسندیش هەیە، کە یان هیچ شوێنەواری خراپی نیە، یان زیاد لەوەش بەرهەمو شوێنەواری باشیشی هەیە.

دووەم: لە قورئانو سوننەتدا بەڕاشکاویی ڕوانینی حەرامو ئارەزوو بازانەی هەرکام لە پیاوانو ئافرەتان بۆیەکدی قەدەغەکراوە، بۆ نموونە: خوا (عزّ وجلّ) فەرموویەتی: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ ...(٣٠) وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ ...(٣١) النور﴾.

بەلاّم وەك لە باسەکانی ڕابردوودا بۆمان دەرکەوت، هیچ ئایەتو فەرموودەیەك نیە، کە بگونجێ بەبەڵگە بهێنرێنەوە لەسەر بەڕەهاییو گشتیی قەدەغەبوونی گۆرانییو ئامێرەکانیشی.

دیارە هۆکاری مشتومڕو ڕاجیایی زانایانیش، لەبارەی قەدەغەبوونی گۆرانییو مۆسیقاوەو یەکدەنگییان لەسەر حەرامیی ڕوانینی خراپو ئارەزوو بازانەش، هەر

---

١) (مجموع الفتاوى)، ج٢٩، ص٣٠٥.

ئەوەیە،کە لەسەر حەرامیی ڕوانینی خراپ، دەقی شەرعیی ڕوونو ڕاشکاو هەیە، بەڵام لەبارەی گۆرانییو مۆسیقاوە نیە!

## جۆری حەوتەمی بەڵگەکانی بەقەدەغەدانەرانی گۆرانیی و مۆسیقا : دەنگی گۆرانیی و مۆسیقا مایەی سەرگەرمبوون و بەکەیف هاتنی مرۆڤە :

بەڵێ ئەمەش یەکی دیکەیە لەوشتانەی،کە بەقەدەغەدانەرانی گۆرانییو مۆسیقا بەبەڵگەیان هێناوە لەسەر قسەو دەعوایەکەیان، ئەمە حەوتەمینو دوامین بەڵگەیانە بۆ ئیسپاتی ڕاستیی بیروڕاو هەڵوێستەکەیان.

هەڵوەشاندنەوە :

ئێمەش لە وەڵامی ئەم قسەیەداو بۆ هەڵوەشاندنەوەی دەڵێین:

یەك: کوا بە چ ئایەتو فەرموودەیەك شادییو خۆشییو کەیفو هەست جووڵان بەرەهایی حەرام کراوە؟!

دوو: ،ئەگەر بڵێین: گۆرانییو مۆسیقا لەبەر دەنگی خۆشیی قەدەغەن، دەبێ قاسپەی کەوو جریوەی بولبولو کەنارییو گمەی کۆترو خوڕەی ئاوو...هتد حەرام بن!

سێ: خوا سبحانه وتعالى فەرموویەتی: ﴿ وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ١٩ لقمان﴾، واتە: لەڕۆیشتنتدا میانە بەو لە دەنگت بگرەوە، بێگومان ناخۆشترین دەنگ دەنگی کەرانە.

کەواتــــە:

وەك چۆن دەنگی کــەر ناخۆشــترین دەنگــە، خــواش (عــزّ وجــلّ) فــەرمانی پێکردووین، کە دەنگی خۆمان زۆر بەرز نەکەینــەوە، ،تــاکو نەشــوبهێتە ئــەو دەنگە ناسازە، دیارە دەنگی خۆشیش پەسندەو، خواش هــیچ شــتێکی جــوانو خۆشو پاکی قەدەغە نەکردوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ... ؟! (٣٢) الأعراف﴾، وەك لە بەشی دووەمدا لە بنچینەی (٣)دا بەدرێژیی قسەمان لەوبارەوە کردوە.

چــوار: چۆن دەگونجێ بگوترێ، دەنگی خۆش قەدەغەیە لە حاڵێکدا،کە یەکێك لە بەڵگەو نیعمەتە بەخشراوەکان بە (داود) علیه السلام دەنگی زوڵاڵ خۆش بووە، وەك خــوا فەرمووییــەتی: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ (١٠) سبأ﴾، واتە: بەخششی خۆمــان بــە داوود دابــوو، ئــەی چیایەکانو باڵندەکان، لەگەڵی بڵێنەوە،ئاسمانمان بۆ نەرم کردبوو.

پێغەمبەری خواش ﷺ بە (أبو موسى الأشعري)ی،کە دەنگێکی بەجۆشو خۆشی هەبوو، فەرمووە: ((لو رأيتني وأنا أَسْتَمِعُ قراءَتك البارحة! لقد أُوتيت مِزْماراً من مزامير آل داود)) متفق عليه، واتە: ئەگەر دەتبینیم دوێنــێ شــەو گوێم بۆ قورئــان خوێندنەکــەت ڕاگرتبــوو! بێگومــان تــۆ ئاوازێــك لــەئاوازە خۆشەکانی داوودت پێدراوە.

کەواتــــە:

دەنگی خۆش بەرەهایی نیعمەتەو مادام بەشێوەیەکی ناشەرعییو بۆ ئامانجێکی خراپ بەکارنەیەت، ئــەوە بــەپێی ئــەو ئامانجــە شــەرعییەی،کە بــۆی بــەکاردێ حوکمەکەی دیاری دەکرێ، لەنێوان: فەڕزبوونو پەسندبوونو ڕەوابووندا.

ئنجا خوێنــەری بەڕێـز!

ئێستاش كە لەدووتوێی ئەم باسی حەوتەمەدا بۆمان ڕوون بۆوە،كە هیچ كام لەو شتانەی بەقەدەغەدانەرانی گۆرانییو مۆسیقا بە بەڵگەیان دانابوون، بە هەر حەوت جۆرەكانیانەوە، بەڵگەنەبوونو بایی ئیسپاتی دەعوایەكەیانیان نەكردو دەركەوت، كە دەعوای: (قەدەغەبوونی گۆرانییو مۆسیقا بەڕەهایی) قسەیەكی بـێ پشـتو پەنایە، با بۆ زیاتر دڵنیابوونو بەرچاو ڕوونی لەباسی هەشتەمدا، ئاماژە بەچـەند بەڵگەیەك بكەین لەسەر سەلماندنی: (لە بنەڕەتەوە ڕەوابوونی گۆرانییو مۆسیقا):

## باسـی هەشـتەم: چـەند بەڵگـەیەك لەسـەر لە بنەڕەتەوە ڕەوابوونی گۆرانیـی و مۆسـیقا :

خوێنەری سـەنگین!

هەرچەندە دوای ئەوەی لەباسی پێشوودا ڕوون بۆوە، كە هیچ بەڵگەیەك لەسەر قەدەغـەبوونی گـۆرانییو مۆسـیقا - بـە ڕەهـایی- نیـە، بێگومـان گـۆرانییو مۆسیقاش لەبواری هەڵسوكەوتەكاندان، كە ئەسڵ تێیدا ڕەوایی (إباحة)یە، مەگەر بەڵگەی ڕاستو ڕوون هەبێ لەسەر هەڵاوێررانی شتێك لەو حوكمە گشتییە، بەڵێ دوای ئەوە، ئێمە هیچ پێویستیمان بە بەڵگەهێنانەوە نیە، بـۆ ئیسـپاتی ڕەوایـی گۆرانییو مۆسیقا -مادام مەرجە پێویسـتەكانیان تێـدا ڕەچـاوكرابن-، چـونكە هەرشتێك لـە جـوغزی هەڵسوكەوتـەكان (معـاملات) دابـوو ، دەقێـك لەسـەر قەدەغـەكرانی نەبوو، مانای وایە لەسەر ئەسڵی خۆی،كە ڕەوایییە ماوەتەوە.

بەلاّم ئێمە بۆ زیاتر بەرچاوڕوون بوونەوەو دلّنیایی لەوبارەوە، چەند بەلّگەیەکیش لەسەر ئیسپاتی لە بنەڕەتەوە ڕەوابوونی گۆرانیی‌و مۆسیقا، دەخەینەڕوو:

## یەك: چەند ئایەتێکی قورئان:

١- ﴿يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْ ۖ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ...﴾ ﴿٤﴾ المائدة، واتە: پرسیارت لێدەکەن چی‌یان بۆ حەلاّلّ کراوە؟ بلّێ: شتە خۆش‌و چاك‌و پاکەکانتان بۆ حەلاّلّکراون.

٢- ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ ...﴾ ﴿٣٢﴾ الأعراف، واتە: بلّێ: کێ ئەو شتە جوانانەی، کەخوا بۆ بەندەکانی پەیدێی کردوون‌و، ڕۆزییە خۆش‌و چاکەکانی قەدەغە کردوە؟!

٣- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحَرِّمُوا۟ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ﴾ ﴿٨٧﴾ المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەو شتە بەتام‌و چاکانەی خوا بۆی حەلاّلّ کردوون، قەدەغەیان مەکەن، سنوور بەزێنیی مەکەن، بێگومان خوا سنوور شکێنانی خۆشناوێ.

٤- ﴿...وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ...﴾ ﴿١٥٧﴾ الأعراف، واتە: ...وە -پێغەمبەر ﷺ- هەرچی بەتام‌و چاکە بۆیان حەلاّلّ دەکات‌و، هەرچی پیس‌و زیان بەخشیشە لێیان قەدەغە دەکات...

شایانی باسیشە، کە وشەی (الطَّیِّبَاتِ) - وەك لەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا باسمان کرد- مەبەست پێی هەموو ئەو شتانەن، کە مرۆڤ چێژیان لێوەردەگرێ،

لە بەرگو پۆشاكو خواردنو خواردنەوەو دەنگو ڕەنگو...هتدەكان، وەك (العزُّ بن عبدالسلام) لە كتێبی (دلائل الأحكام)دا وشەی (الطَّيِّبَاتِ)ی بە: چێژ لێوەرگیراوەكان (المُسْتلذّات) لێكداوەتەوە[1].

٥- ﴿ وَإِذَا رَأَوْاْ تِجَـٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا ۚ قُلْ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ مِّنَ ٱللَّهْوِ وَمِنَ ٱلتِّجَـٰرَةِ ۚ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١﴾ الجمعة﴾، واتە: كاتێك -مسوڵمانان- بازرگانییەك، یان لەهوویێكیان بینی، بەرەولێی پرژانو تۆیان بەپێوە (لەسەر مینبەر) جێهێشت، بڵێ ئەوەی لای خوایە لە خافڵانو لە بازرگانی باشترەو خواش باشترین ڕۆزی دەرە.

جا لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەوە (مسلم) لە (صحیح)ەكەی خۆیدا، فەرمایشتێكی لە (جابر بن عبدالله)وە -خوا لێیان ڕازی بێ-، بە چەند ریوایەتێك هێناوە،كە ئەمە یەكێكیانە[2]:

(عن جابر بن عبدالله أن النبي ﷺ كان يخطب قائماً يوم الجمعة فجاءت عِيرٌ من الشام فانْفَتَلَ الناس اليها، حتى لم يَبْقَ الاّ اثنا عشرَ رجُلاً، فأنزلت هذه الآية التي في الجمعة: ﴿ وَإِذَا رَأَوْاْ تِجَـٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا ۚ ﴾)، واتە: ... پێغەمبەر ﷺ جارێكیان لە ڕۆژی جومعەدا بەپێوە وتاری دەدا، كاروانێك لە شامەوە هات، خەڵكی بەپرتاو بەرەو ڕووی چوون، ،هەتا تەنیا دوازدە پیاو مانەوە، ئیدی ئەم ئایەتەی،كە لە (الجمعة) دایە هاتە خوارێ...

دیارە پێشتر باسمان كرد، كە وشەی (لهو) گۆرانییو ئامێرەكانی دەگرێتەوەو، لێرەشدا مەبەست پێی گۆرانیی گوتنو تەپڵو دەف لێدانە، چونكە عادەتی خەڵكی مەدینە وابووە، كاتێك كاروانی بازرگانییان بەسەلامەتی گەیشتبایەوە جێ، بەگۆرانییو تەپڵو دەف لێدان پێشوازییان دەكرد، ئنجا مادام خوای

---

١) بڕوانە: (نیل الأوطار)، ج٨، ص٣٢.

٢) (صحیح مسلم)، رقم: ٨٦٣، و (صحیح البخاري)، رقم: ٩٣٦ .

بەرزو مەزن لێرەدا (تجارة)و (لهو)ی پێکەوە لە یەك سیاقدا هێناون، دیارە یەك حوکمیشیان هەیە،هیچ گومانیشی تێدانیە،ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ (گۆرانیی‌و ئامێرە دەنگییەکان)ی قەدەغە کردبایە، خەڵکی مسوڵمان بە گۆرانیی گوتن‌و تەپڵ‌و دەف لێدانەوە بەلای مزگەوتەکەیدا ڕەت نەدەبوون‌و، ئەویش لێیان بێدەنگ نەدەبوو!

٦- ﴿...إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾ لقمان﴾، واتە: ...بەڕاستی ناخۆشترین دەنگ، دەنگی کەرانە.

چۆنیەتی بەڵگەبوونی ئەم ئایەتەش لەسەر ڕەوایی دەنگی خۆشی گۆرانیی‌و ئامێرەکانی گوتن (آلات الغناء) وەك (أبو حامد الغزالي) گوتوویەتی[1]، ئاوایە:

خوای کاربەجێ ڕایگەیاندوە،کە ناخۆشترین دەنگ، دەنگی کەرانە، دیارە بەو بۆنەیەشەوە وایفەرمووە،کە لوقمانی حەکیم (خوا لێی ڕازی بێ) لەمیانەی ئامۆژگاریکردنی کوڕەکەیدا گوتوویەتی: ﴿وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ﴾ واتە: لە دەنگت بگرەوەو دەنگ زیاد لەپێویست هەڵمەهێنە، کەواتە: خوا -سبحانه وتعالی- لەسەر زمانی لوقمان دەنگ زۆر بەرزکردنەوەی قەدەغە کردوە، لە سۆنگەی ئەوەوە،کە دەنگی بەرزو زل ناخۆشە، بەبەڵگەی ئەوە،کە دەنگی کەر، ناخۆشترین دەنگ‌و سەدایە، چونکە زۆر گەورەو بەرزو جاڕزکەرە، جا ئەگەر دەنگی بەرزو ناخۆش شتێکی خراپ‌و ناپەسند بێ، دیارە دەنگ‌و ئاوازی خۆش‌و هەست بزوێن، شتێکی پەسندو باشە.

---

١) بڕوانە: (فقه الغناء والموسيقى في ضوء القرآن والسنّة) ص٨٦، کە ئاماژەی بەو قسەیەی (أبو حامد الغزالي) کردوە، بەڵام من بەشەرح‌و شیکردنەوەوە هێنام.

دیارە پێشتریش چەند فەرموودەیەکمان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هێنان،کە مەدحو ستاییشی دەنگو ئاوازی خۆشیان تێدا خرابۆ ڕوو ، لێرەدا پێویست بە دووبارەکردنەوەیان ناکات.

ئێستاش پاش ئاماژەکردن بەم چەند ئایەتە بەپیزەی کتێبی بەڕێزی خوا تبارك وتعالی،کە هەرکامێکیان بەتەنیا دەگونجێ بکرێتە بەڵگەی ڕەوابوونی دەنگی خۆش (الصَّوت الحسن) چ هی مرۆڤ بێ، چ هی باڵندە، چ هی تاڤگەو ڕووبار، چ هی ئامێر، باسەرنجێکی خێرای ژمارەیەك لەفەرمایشتەکانی پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە بدەین.

## دوو: چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ:

خوێنەری بەڕێز!

ئەگەر هیچ فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ لەسەر قەدەغەبوونی گۆرانیی‌و مۆسیقا نەبوو -وەك لەباسی پێشوودا خرایە ڕوو و سەلمێنراش- ئەوە بەپێچەوانەوە، چەندان دەقی ڕوونو ڕاشکاوی سوننەت هەن، لەسەر ڕەوایی گۆرانیی‌و مۆسیقا، بەمەرجێك ئەو شتانەیان تێدا ڕەچاو بکرێن،کە زاناو شارەزایانی ئیسلام بۆ هەموو، یان زۆربەی شتە ڕەوایەکان (الأشياءُ المباحة) بەمەرجیان گرتوونو، لەباسی شەشەمدا خستماننەڕوو.

ئەمەش ژمارەیەك لەو دەقانەی سوننەت:

١- ((عن عائشة رضي الله عنها أن رسول الله ﷺ دخل عليها أيّام مِنىً وعندها جاريتان تُغَنِّيان وَتَضْرِبان بِدُفَّيْنِ ورسول الله مُسَجّىً على وجهه الثوب ((وفي رواية: مُسْتَتِرٌ بثوبه)) لايأمرهن ولايَنْهاهُنَّ، ((وفي رواية: فانتهرهما)) أبوبكر فكشف رسول الله (ثوبه) عن وجهه فقال: دَعْهُنَّ، ((وفي رواية: دَعْهُما)) يا أبا بكرٍ فإنها أيّامُ عيدٍ) رواه أحمد واسحاق بن راهويه والنسائي وابن حِبّان، وهو صحيح، واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لە ڕۆژانی مانەوە لەمینادا

پێغەمبەری خوای ﷺ لـێ وەژوور کەوتوە، لە کاتێکـدا، کە دوو کچی[1] لەلا بوون، گۆرانیان دەگوت‌و دوو دەفیان لـێدەدان، جا لە حاڵێکدا پێغەمبەری خوا ڕاکشاوەو پۆشاکێکی بەسەر دەم‌و چاوی خۆی داداوە، ((وە لە ڕیوایەتێکدا: بە پۆشاکەکەی خۆی داپۆشیبوو)) نە فەرمانی پێدەکردن‌و، نە ڕێشی لـێ دەگرتن، ئەبوبەکر تێی خوڕین، ((وە لە ریوایەتێکدا: لە هەردووکیانیەوە خوڕی))، ئیدی پێغەمبەری خواش پۆشاکەکەی لەسەر ڕووی لاداو فـەرمووی: ئـەی ئەبوبـەکر وازیان لێ بێنە، ((وە لە ڕیوایەتێکدا: واز لە هەردووکیان بێنە))، چونکە ئەم ڕۆژانە جەژنن.

هەروەها ئەم فەرموودەیە بەم شێوەش گێڕراوەتەوە:

((عـن عـائشة: دخل عليَّ رسول الله وعندي جاريتـان تُغَنِّيـان بغنـاءِ بُعـاثٍ، فاضْطَجَعَ على الفراش وحوَّلَ وَجْهَهُ، ودخل أبوبكرٍ فانتهرني وقال: مزمارة (وفي لفظ: مِزْمارُ) الشيطان عند النبـي ﷺ؟ فأقبل عليه رسول الله، فقال: دَعْهُما، فلما غَفَلَ غَمَزْتُهُما فَخَرَجَتا وكان يوم عيد يَلْعَبُ السُّودانُ بالدَّرَقِ والحِراب، فأمّا سألتُ النبـي وإمّا قال: تشتهين تنظرين؟ فقلـت: نعـم، فأقـامني وراءَه، خَدِّي على خَدِّهِ وهو يقول: دونكم يابني أرْفِدة، حتى إذا مَلِلْتُ، قال: حَسْبُكِ؟ قلـتُ: نعم، قال: فاذهبـي)) متفق عليه.

پێشترمانای ئەم فەرموودەیەمان کـردوە - لـە باسـی حەوتەمـدا- و لێـرە دووبارەی ناکەینەوە.

شایانی باسیشـە، کـە ئـەم دەقـەی سـوننەت بەهـەردوو ڕیوایەتەکەیـەوە، بەڵگەیەکی ڕوون‌و ڕاشـکاوی لـە ڕەوایـی گـۆرانیی‌و ئـامێرە دەنگییەکانـەو، پێشـتریش چۆنیەتی دەلالـەتی ئـەم فەرمایشـتەمان لەسـەر ڕەوایـی گـۆرانیی‌و مۆسیقا ڕوون کردۆتەوە، بۆیە لێرە بەم ئاماژەیە وازی لـێ دێنین.

---

١) وشەی (جارية)، هەم بەمانای کچی تازە پێگەیشتوو دێ‌و، هـەم بـەمانای کـەنیزەك‌و، بـەپێی سیاقی یەکێك لەو دوو مانایە دیاری دەکرێ. بڕوانە: (المعجم الوسيط)، ص١١٩.

٢-((عن بُريدة الأسلمي قال: خرج رسول الله ﷺ في بعض مغازيه، فلما انصرف جاءَتْ جاريةٌ سَوْداء فقالت: يارسول الله إني كنت نَذَرْتُ إنْ ردَّك الله سالماً ان أضْرِب بين يديك بالدّفِّ وأتغنّى، فقال لها رسول الله ﷺ: إن كنتِ نذرتِ فاضربي والاّ فلا، فَجَعَلَتْ تَضْرِبُ فدخل أبوبكر وهي تضرب، ثم دخل علي وهي تَضْرِبُ، ثم دخل عثمان وهي تضربُ، ثم دخل عمرُ فألْقَتِ الدُّفَّ تحت أسْتِها ثم قعدتْ عليه، فقال رسول الله ﷺ: إن الشيطان ليخاف منك ياعمرُ! إني كنت جالساً وهي تَضرِبُ، فدخلَ أبوبكر وهي تضرب، ثم دخل علي وهي تَضْرِبُ، ثم دخل عثمان وهي تضربُ، فلما دخلْت أنت ألْقَتِ الدُفَّ)) رواه أحمد والترمذي وصحَّحهُ وابن حبّان والبيهقي، وأخرج أبوداود عن عبدالله بن عمرو بن العاص حديثاً قريباً منه.

کە پێشتر مانامان کردوەو لێرە دووبارەی ناکەینەوە.

دیارە ئەم دەقەش بەڵگەیەکی ڕوونو بێ چەندو چوونی ڕەوایی گۆرانییو دەف لێدانە - هەروەها سەرجەم ئامێرە دەنگییەکانی دیکەش، چونکە هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر جیاوازییان- چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من نَذَرَ أنْ يُطيع الله فَلْيُطِعْهُ، ومن نذر أن يَعْصِيَهُ فلا يَعْصِهِ)) رواه مالك والبخاري وأحمد وأبو داود والترمذي وابن ماجه والنسائي، واتە: هەرکەسێك لەخۆی گرتوە فەرمانبەریی خوا بکات، با فەرمانبەریی بکات، ،بەڵام هەرکەسێك لەخۆی گرتوە سەرپێچی بکات، باسەرپێچی نەکات.

هەروەها فەرموویەتی: ((لاوفَاءَ لِنَذْرٍ في مَعْصيةٍ)) أخرجه أحمد ومسلم والنسائي وأبوداود وابن ماجه والترمذي، واتە: نابێ لەخۆگرتن (نەزر) لەشتی ناشەرعییدا جێبەجێ بکرێ.

کەواتە: گۆرانیی گوتنو دەف لێدان، حەڵاڵو ڕەوان،ئەگەرنا ،ئەگەر ناشەرعیی بوونایە، نەزریان تێدا دروست نەبوو،و پێغەمبەری خواش ﷺ ڕێی پێنەدەدان.

هەروەها ئەم فەرموودەیە ئەوەش دەگەیەنێ، کە گۆرانیی گوتنو دەف لێدان -کە دیارە دەف نموونەیەکی ئامێرە دەنگییەکانە-، تایبەت نین بە زەماوەندو

جەژن (عُرْس وعيد)ەوە، چونكە ئەو بۆنە (مناسبة)یە،كە ئەو ئافرەتـە نـەزری كردوە، گۆرانيی بۆ پێغەمبەر بلێ‌و دەفی لەبەردەمدا لێبدات، بریتی بووە لـە گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگ بە سەلامەتی، بەلاّم بێگومان خالّی هاوبەشی نێوان هەركام لەوسێیانە: زەماوەندو جەژن‌و لەسەفەر گەڕانەوە، بریتیە لە شـادیی‌و خۆشـی (الفَرَح والسرور)، كەواتـە: هـەركاتێ مرۆڤـ شـادیی‌و خۆشییەك ڕووی تێكرد، بۆی هەیە دەنگی گۆرانیی‌و ئامێرەكانی ببیستێ.

٣- ((عـن السّائب بن يزيد ﷺ: أنّ امرأةً جـاءَتْ الى رسـول الله ﷺ، فقـال: يـا عـائشة! أتعرفين هذه؟ قالت: لا، يا نبـيَّ الله، فقال: هذه قينَة بني فلان، تحبِّـين أنْ تُغَنِّيك؟ قالت: نعم، قال: فأعطاها طبقاً فَغنَّتْها، فقال النبـي ﷺ قد نفـخ الشيطان في مِنْخَرَيْها)) رواه أحمد والنسائي والطبراني وهو صحيح.

كە پێشتر مانامان كردوەو، چـۆنیەتی دەلالـەت كردنیشـی لەسـەر ڕەوایـی گۆرانیی‌و ئامێرەكانی، ڕوون‌و ئاشكرایەو پێشتریش ئاماژەی پێكراوە.

٤- ((عن عـائشة رضي الله عنها قالت: بَيْنـا أنـا ورسـولُ الله جالسـان في البيـت استأذَنتْ علينْا امرأةٌ كانت تُغَنِّي فلم تَزَلْ بها عائشة حتى غَنَّـتْ، فلمـا غَنَّـتْ استأذن عمر بن الخطـاب ﷺ فلمـا اسـتأذن عمـر ألْقَـتِ المُغَنِّيـةُ مـا في يَـدِها وخرجَتْ، واستأخرت عائشة عـن مَجْلِسها، فـأذِنَ لـهُ رسـول الله ﷺ فَضَـحِكَ، فقال: بأبي أنت وأُمِّي عمّا تَضْحَكُ؟! فأخبره ما صَنَعَتِ القَيْنَةُ وعـائشـة، فقـال عمر: وأما والله لا، ألله ورسولهُ أَحَقُّ أنْ يُخْشـى ياعـائشـة)) أخرجـه الفـاكهي في (أخبار مكة) رقم: ١٧٤٠، وإسناده قوي.

واتــە: عـائیشــە -خــوا لێــی ڕازی بــێ- دەگێڕێتەوە،كــە لەكاتێكـداخۆی‌و پێغەمبەری خوا لەماڵێ دانیشتوون، ئافرەتێكی گـۆرانیی بێـژ مۆڵـەتی لـــێ خواستوون بۆ هاتنەماڵ، عائیشە زۆری هەوڵداوە ،هەتا گۆرانیی بۆ گوتوە، جا كاتێك دەستی بەگوتنێ كردوە، عومەری كوڕی خەتتاب –خوا لێی ڕازی بێ- مۆڵەتی خواستوەو بۆ هاتنە ماڵ، ئنجا پاش مۆڵەت خواستنی عومەر، ئافرەتە

گۆرانیی بێژەکە ئەوەی لەدەستی دابووە فڕێیداوەو چۆتەدەرێ، عائیشەش لەو شوێنەی لێی بووە چۆتە دواتر، جا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوەو هاتۆتە ژوورێ، پێکەنیوە، ئەویش گوتوویەتی بابو دایکم فیدات بن، بەچی پێدەکەنی؟ ئەویش هەڵوێستی هەرکام لە ئافرەتە گۆرانیی بێژەکەو عائیشەشی بۆ باس دەکات، عومەریش دەڵێ: نەخێر، بەخوا ڕاست نیە، ئەی عائیشە خواو پێغەمبەرەکەی شایستەترن بە لێترسان!

دیارە دەلالەتی ئەم فەرمایشتەش لەسەر ڕەوا بوونی گۆرانیی گوتنو ئامێرە دەنگییەکان زۆر ڕوونو ئاشکرایە،ئەگەرنا، چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێی بە عائیشە دەدا، کە گۆرانیی بەو ئافرەتە گۆرانیی بێژە بچڕێ؟! هەروەها لەم فەرموودەیەوە دەشفامرێتەوە،کە گۆرانیی گوتنو بەکارهێنانی ئامێرەکانی گوتنو گوێ لێگرتنیان، لە هەموو حاڵاندا ڕەوا (مُباح)ە، بۆنە (مُناسبة)یەکی دیاریکراو هەبێ، یان نا.

٥- ((عن الرُّبيِّع بنت مُعَوِّذ، قالت: دخل عليَّ النبيُّ ﷺ غَداةَ بُنِيَ عليَّ فَجَلَسَ على فِراشي كمجلسك منِّي وجُوَيريات يَضْرِبْنَ بالدفِّ يَنْدُبْنَ مَنْ قُتِلَ من آبائهنَّ يوم بدرٍ، حتى قالت جارية: وفينا نبِيٌّ يعلم مافي غدٍ، فقال النبيُّ ﷺ: لاتقولي هكذا وقولي ماكنت تقولين، وفي رواية الترمذي: )مايعلم ما في غدٍ الاّ الله)) رواه البخاري وأبو داود والترمذي والنسائي وابن حِبّان والطبراني والبيهقي.

واتە: ڕوبەییعی کچی موعەوویذ دەڵێ: ئەو بەیانییەی،کە بەبووك چووم، پێغەمبەر ﷺ لێم وەژوورکەوتو وەك ئەو شوێنەی ئێستای تۆ، لەلامەوە دانیشت، -ڕووی قسەی لە ڕاویەکەیە- چەند کچێکیش دەفیان لێدەداو بەو بابو باپیرانەیانیان هەڵدەگوت، کە لە جەنگی بەدر کوژرابوون،هەتا کچێك گوتی: (پێغەمبەرێکمان لەنێودایە، دەزانێ بەیانی چی ڕوودەدا) پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئاوا مەڵێو هەرئەوەی لەپێشدا دەتگوت بیڵێ، لە ڕیوایەتی تیرمذییدا هاتوە: (جگە لە خوا هیچ کەس نازانێ بەیانی چی دەبێ!).

دەلالەتی ئەم فەرمایشتەش لەسەر ڕەوابوونی گۆرانییو ئامێرە دەنگییەکان زۆر ڕوونە، بەتایبەت، کە پێغەمبەرﷺ پاش قەدەغەکردنی ئەو کچە گۆرانیی بێژو دەف لێدەرە لە گوتنی قسەیەك،کە بۆنی شیرکی لێدێ، کە بریتییە لە زانینی شتی پەنهان (غیب) پاڵدانەلای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموویەتی: ئەوە بڵێ، کە پێشتر دەتگوت، واتە: فەرمانی پێکردوە بە بەردەوام بوون لەسەر دەف و گۆرانیی، دیارە هەرگیزیش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان بەشتی حەرامو قەدەغەو، بگرە ناپەسند (مكروه)یش ناکات! کەواتە: بەلای کەمەوە ئەوکارەی فەرمانی پێکردوە،ئەگەر سوننەتو پەسندیش نەبووبێ، ڕەوا (مباح) بووە!

٦- ((عن محمد حاطب الجُمَحيِّ قال: قال النبـي ﷺ: فَصْلُ ما بين الحلال والحرام: الدُّفّ والصّوت في النكاح)) أخرجه أحمد والنسائي والطبراني والبيهقي والحاكم وابن ماجه والترمذي وحسّنه.

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە یەك جیاکەرەوەی حەڵاڵو حەرام -لە بواری لەیەك نیزیکی پیاوانو ئافرەتاندا- بریتیە لەدەفو دەنگ-ی گۆرانیی- لەکاتی مارەکردندا.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ مسوڵمانانی هانداوە،کە لەڕێی گۆرانیی گوتنو دەف لێدانەوە - کە باوترینو بەکارهێنراوترین ئامێری دەنگیی ئەو ڕۆژگارو شوێنەبووە - مەسەلەی مارەکردنی ئافرەتو هاوسەرگیریی شەرعییانە، ئاشکرا بکەنو لە پەیوەندییە جینسییە ناشەرعییەکانی دیکە، کە لەڕۆژگاری نەفامیی (جاهلي)دا هەبوون، جیێی بکەنەوە.

کە دیارە لێرەدا بەکارهێنانی گۆرانییو ئامێرەدەنگییەکان، بۆ ئەو ئامانجە شەرعییە، بەلای کەمەوە سوننەتو پەسند (مُستحبْ)ە.

٧- ((عن أنس بن مالك رضي الله عنه: أن النبـي ﷺ مرَّ ببعض المدينة، فاذا هو بِجوارٍ يَضْرِبْنَ بِدُفِّهِنَّ وَيَقُلْنَ:

نحــن جَــوارٍ من بني النجّـــــــار
يــا حَبَّـــــــذا محمـــــداً من جـــــارِ

فقال النبــي ﷺ : أَللّه يعلـم إنــي لأُحِـبُّكُنَّ)) رواه ابـن ماجـه والطبرانـي وقـال البويصري في ( زوائد ابن ماجه ) هذا إسنادٌ صحيح رِجالُهُ ثقاتٌ.

واتـە: پێغـەمبـەر ﷺ بەشوێنێکی مـەدینـەدا ڕەت بوو، بینـی هەنـدێك کـچ دەفەکەیان دەکوتن‌و دەڵێن: ئێمە کچانێکین لە تیرەی (بەنی نەججار)، ئای لـە موحەممەد، چ دراوسێیەکی پەسندو چاکە! پێغەمبەریش ﷺ فـەرمووی: خـوا دەزانێ، کە من خۆشم دەوێن!

دەلالەتی ئەم دەقەش لەسەر ڕەوابوونی دەنگی خۆشی گۆرانیی‌و ئامێرەکانی، کە دەف یەکێکیانە، زۆر ڕوونەو پێویستی بەڕوونکردنەوە نیە.

٨- ((عن عبدالله بن عباسٍ رضي الله عنهما قال: أنكحتْ عائشة ذات قرابةٍ لها رجلاً من أنصار، فجاءَ رسول الله ﷺ فقال: أهديتم الفتاة؟ قالوا: نعـم، قـال: أرسلتم معَها منْ يُغَنّي؟! قالت: لا، فقال رسول الله ﷺ: إن الأنصارَ قومٌ فيهم غَزَلٌ، فلو بَعَثْتُمْ معها من يقول، أتيناكم أتيناكم فحيّانا وحيّـاكم) أخرجـه ابـن ماجه والطحاوي وأحمد والنسائي والبزّاز والبيهقي وأبو الشيخ، وهو حسن. وعند الطّبراني في الأوسط برقم: ٣٢٨٩:

((عن عائشة أن النبـي ﷺ قال: ما فَعَلَتْ فُلانـةُ؟ لِيَتيمَـةٍ كانـتْ عنـدها، فقلتُ: أهديناها الى زوْجها، قـال: فهـل بعثْتُمْ معهـا بِجاريـةٍ تَضْرِبُ بالـدُفّ وتُغنّي! قالت: تقول ماذا؟! قال: تقول:

(أتينـاكـم أتينـاكـم فَحيُّـونـا نُحيِّـــكم
لـــولا الذهـــب الأحمـر ماحَـلَتْ بِواديـــــكم
ولولا الحبَّـة السّـــمْرا ماسَـمُنَ عَذاريكـــم).

واتە: جارێکیان عائیشە ئافرەتێکی خزمی خۆی مارە کردبوو -واتە سەرپەرشتی مارەکرانی کردبوو- لە پیاوێکی ئەنصاریی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوەو فەرمووی: کچەکەتان بەڕێ کرد؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: کەستان لەگەڵ نارد گۆرانیی بڵێ؟ (عائیشە) گوتی: نەء، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەنصارییەکان خەڵکێکن،کەیفیان بەگۆرانیی گوتندایە،ئەگەر یەکێکتان لەگەڵ ناردبایەو گوتبای: هاتینە لاتان هاتینە لاتان، جا خوا ئێمەش‌و ئێوەش بژیەنێ!

(طبراني)یش بەمجۆرە هێناویەتی:

عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوەو فەرمووی: فلان ئافرەتە چی کرد؟ کەمەبەستی کچێکی هەتیو بوو لەلای عائیشە بوو، منیش گوتم: بۆ مێردەکەیمان بەبووك برد، فەرمووی: ئەدی بۆچی کچێکتان لەگەڵ نەنارد، کە دەفی لێداباو گۆرانیی گوتبایە! ئەویش گوتی: جا چی گوتبایە؟! فەرمووی: گوتبای:

هاتینە لاتان هاتینە لاتان
سڵاومان لێبکەن‌و سڵاوتان لێدەکەین
وە ئەگەر زێڕی سوور نەبوایە
دەشت‌و ساراکانتان بێ لەوەڕو قاقڕ دەبوون
وە ئەگەر دەغڵی بۆر نەبوایە
گوویەکانتان قەڵەو نەدەبوون.

واش پێ دەچێ مەبەست (الذهب الأحمر) باران بێت‌و، دیارە مەبەستیش لە (الحبَّة السّمْرا) گەنمە، کە دیارە دەبێتە مایەی قەڵەو بوون‌و گیپ خڕبوون، ڕەنگە ئەم تەعبیرانەش مەجازیی بن‌و مەبەستی دیکەیان هەبێ.

دیارە هاندانی پێغەمبەریش ﷺ بۆ عائیشەی هاوسەری -خوا لێی ڕازی بێ-و، سووکە گلەیی ئاراستەکردنی،کە دەبوایە بۆ ئەو زەماوەندو بووك گواستنەوەیە، گۆرانیی گوتنو دەف لێدان ببوایە، پاشان ڕێنمایی کردن بۆ گوتنی چەند پەندو شیعرێکیش، کە بۆ ئەو بۆنەیە بشێن، هەموویان بەڵگەی پتەون لەسەر نەك هەر ڕەوابوون، بگرە پەسندو سوننەت بوونی گۆرانییو دەف لێدان بۆ زەماوەندو هەر بۆنە (مناسبة)یەکی دیکە،کە مایەی شادییو دڵخۆشیین!

٩- ((عن عامر بن سعد البَجَليِّ قال: دَخَلْتُ على أبي مسعود وقرظة بن كعب وثابتِ بن يزيد وجوارٍ يَضْرِبْنَ بِدُفٍّ لهن ويُغَنِّيْنَ، فقلت: تُقِرُّونَ هذا وأنتم أصحابُ رسول الله ﷺ؟! قالوا: إنه رُخِّصَ لنا في الغناءِ في العرْسِ والبُكاءِ على الميِّت في غيْرِ نوْح)) أخرجه الطبراني في الكبير وعبدالباقي بن قانع في (معجم الصحابة) وأخرجه البيْهقي باسنادٍ صحيح وأخرجه الحاكم.

واتە: عامیری کوڕی سەعدی بەجەلیی دەڵێ: چوومە لای ئەبی مەسعودو قەرظەی کوڕی کەعبو ثابیتی کوڕی زەید، لە حاڵێکدا،کە چەند کچێك (یان،کەنیزەکێك) دەفیان لێدەداو گۆرانیان دەگوت، منیش گوتم: ئایا دان بەمەدادێننو ئێوەش هاوەڵانی پێغەمبەری خوان ﷺ؟! گوتیان: ئێمە مۆڵەتدراوین،کە لە کاتی زەماوەندا گۆرانیی هەبێو، گریانیش لەسەر مردوو هەبێ،بەڵام بەبێ شینو شەپۆڕ.

دەلالەتی ئەم دەقەش لەسەر ڕەوایی گۆرانییو ئامێرەکانی ئاشکرایەو، پێشتریش باسمان کرد، کە ئەم دەقەو هاو وێنەکانی،کە گۆرانییو دەف لێدان تایبەت دەکەن بەبۆنەی وەك زەماوەندو جەژن، بەڵگە نین لەسەر ئەوە،کە لە غەیری ئەو جۆرە بۆنانەدا دروستو ڕەوا نەبن، چونکە دیارە سیاقی قسەکان ئەوەی خواستوە،کە باسی ئەو بۆنانە بکرێ.

١٠- ((عن أنس بن مالكٍ ﷺ قال: كان للنبيِّ ﷺ حادٍ، يُقالُ له: أنْجَشة، وكان حسن الصَّوتِ، فقال النبي ﷺ: رُويْدك يا أنجشة لاتَكْسِرِ القوارير).

وفي رواية: (أن النبـي ﷺ أتى على أزواجه (ومعهن أم سليم) وسَوّاق يَسوق بِهنَّ يقال له: أَنْجَشة، فقال: ويحك يا أَنْجَشة رُويداً سَوْقك بالقوارير).

(قال أبو قلابة: تكلّم رسولُ الله ﷺ بكلمةٍ لو تكلّم بها بعضكم لَعِبْتموها عليه) متفق عليه.

وفي رواية عن أنس: (أن البراء بن مالك كان يَحْدو بالرِّجال (وفي لفظ: كان البراءُ جيِّد الحِداءِ وكان حادي الرِّجال) وأَنْجَشة يَحْدو بالنِّساء وكان حسن الصوت، فَحَدا، فأَعْنَقتِ الإبلُ فقال رسول الله ﷺ: ياأَنْجَشة رُوَيْداً سَوْقك بالقوارير) رواه الطيالسي وأحمد وعَبْدُ بن حُمَيد والبخاري في الأدب المفرد والبيهقي وابن عبدالبرّ واللّفظ له، وإسناده صحيح.

واتە: پێغەمبەر ﷺ (حادیی)یەكی هەبوو، ناوی ئەنجەشە بوو دەنگی خۆش بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەی ئەنجەشە! هێواشبە شووشەكان نەشكێنی.

لە ڕیوایەتێكداهاتوە: كە پێغەمبەر ﷺ چووەلای هاوسەرەكانی (خوا لێیان ڕازی بێ) وە ئوممو سولەیمیشیان لەگەڵ بوو، هەروەها سەرقافڵەیەكیان لەگەڵ بوو ولاّخەكانیانی لێدەخوڕی، ئەنجەشەی پێدەگوترا، پێی فەرمووو: ئەی ئەنجەشە بێبەلاّبی، لەسەرەخۆ شووشەكان بەڕێیەدا بەرە.

(ئەبوو قولابە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وشەیەكی فەرمووە ،ئەگەر یەكێكتان گوتبای لێتان بەڕەخنە دەگرت) .

لە ڕیوایەتێكی ئەنەسدا هاتوە: كە بەڕائی كوڕی مالیك گۆرانیی بۆ پیاوان دەگوت (وەلەبێژەیەكدا: بەڕاء گۆرانیی بێژی باش بوو وگۆرانیی ڕێیەی بۆ پیاوان دەگوت) ئەنجەشە گۆرانیی ڕێیەی بۆ ئافرەتان دەگوتو دەنگیشی خۆش بوو، جا گۆرانیی گوتو حوشترەكانیش زۆر خێرا ڕۆیشتن، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەی ئەنجەشە بەهێواشی شووشەكان بەڕێیەدابەرە.

(حادیی) كەسێكە،كە بە دەنگێكی خۆش گۆرانیی بۆ كاروانی حوشتران دەڵێ ،تاكو باش بڕۆن.

(قەواریر)یش، کە کۆی (قارورة)یە، بەمانای شووشەی شت تێکران - بۆ وێنە: دەرمان- دەگوترێو ئافرەتان لەبەر ناسکیی جەستەیان، یان هەستو سۆزیان، یان هەردووکیان وە (شووشە) چوێنراون.

بەڵگەبوونی ئەم فەرمایشتەش بەهەموو ڕیوایەتەکانییەوە، لەسەر ڕەوابوونی گۆرانیی شتێکی زۆر ڕوونە، ئەوەندە هەیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجەشەی ئاگادارکردۆتەوە،کە زێدەڕۆیی نەکات، نەبادا ئافرەتان بەهۆی زۆر خێرا ڕۆیشتنی حوشترە کەژاوە دارەکانەوە،کە ئەویش بەرهەمی کارتێکران (متأثّر)یانە بە دەنگی خۆشی گۆرانیی گوتنی ئەنجەشە، تووشی کەوتنە خوارەوەو ئەزیەتو ئازار ببنو وەك شووشەی ناسك بشکێن!

دەشگونجێ مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بووبێ، کە ئافرەتان بەهۆی سۆزو جۆشی دەنگی خۆشی ئەنجەشەوە لە ڕووی دەروونییەوە، دووچاری گرفتو خراپەیەك نەبن!

بەڵام ڕستەی: (فأعْنَقتِ الإبلُ) حوشترەکان زۆر خێرا ڕۆیشتن، بەڵگەی مەبەست بوونی مانای یەکەمە.

قسەکەی (أبو قُلابة)ش ئەوە دەگەیەنێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بازنەی حەڵاڵو موباح دا زۆر کراوەو ئیجابیی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا، کە لە لووتکەی پارێزکارییو لەخواترساندا بووە، وەك فەرموویەتی: ((ما بالُ رجالٍ بَلَغهم عنّي أمْرٌ تَرَخَّصْتُ فيه، فكرهوهُ وتنزَّهوا عنه! فوالله لأنا أعلمهم بالله وأشدّهم له خشيةً)) رواه البخاري برقم: ٦١٠١، ومسلم برقم: ٢٣٥٦ عن عائشة رضي الله عنها.

واتە: ئەوە بۆچی پیاوانێك شتێکیان لەمنەوە پێگەیشتوە،کە مۆڵەتم تێیدا وەرگرتوە، پێیان ناخۆش بووەو خۆیانیان لێ پاراستوە؟ دە بەخوا من لە هەموویان بەخوا زاناترمو، لە هەمووشیان چاکتری لێ دەترسم!

کەواتە: با هەموو کەس بزانێ، کە مەرج نیە پارێزکارییو لەخواترسان هەمیشە لە توندییو سەختگیریی دابێ، بەڵکو جاری وایە پارێزکاریی لە کراوەییو ئاسانکارییو مۆڵەت وەرگرتندایە!

١١- (عن سلمة بن الأكوعْ قال: خرجْنا مع النبي ﷺ الى خيبر فسِرْنا ليلاً، فقال رجلٌ من القوم لعامرٍ: يا عامرُ ألا تُسْمِعُنا من هُنَيْهاتِكَ؟ وكان عامرُ رجلاً شاعرا حَدّاءً فنزَلَ يحْدو بالقومِ، يقول:

ألَلّهم لولا أنت ما اهتدينا ولا تَصَدَّقْنا ولا صَلَّيْنا
فاغفر فِداءً لك ما اتّقينا وثَبِّتِ الأقدامَ إنْ لاقَيْنا
وألقينْ سكينة علينا إنّا إذا صِيحَ بنا أبَيْنا
وبالصِّياح عَوَّلوا علينا

فقال رسول الله ﷺ: منْ هذا السائقُ؟! قالوا: عامِرُ بن الأكوعِ، قال: يَرْحَمُهُ الله، قال رجلٌ من القوم: وَجَبَتْ يانبيَّ الله لولا أمْتَعْتَنا به!) متفق عليه.

واته: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەرەو خەیبەر دەرچووین‌و بەشەو دەڕۆیشتین، پیاوێك لە خەڵکەکە گوتی: هۆ عامیر! ئەریّ لە شیعرەکانت بۆمان نالێی؟ عامیریش پیاوێکی شاعیرو گۆرانیی بێژی ڕێگا بوو، ئیدی دابەزی‌و دەستی کرد بە گۆرانیی گوتن بۆ خەڵکەکە، دەیگوت:

ئەی خوایە تۆ نەبای ڕێی ڕاستمان نەدەگرت‌و، نەخێرو چاکەمان دەبوو، نە نوێژمان دەکرد.

دەجا لێمان ببوورە، یاخوا فیداتبیّ هەرچی،کە دەیپارێزین، لە کاتی بەرەنگاربوونەوەشدا پێیەکانمان بچەسپێنە.

ئارامیمان برژێنەسەر، بێگومان ئێمە کاتێك هاوارمان لێکرا ناهێڵین -دوژمن زەفەرمان پیّبەریّ-.

وە بۆ هاوار تێبەستن لەکاتی تەنگانەدا پشتیان بەئێمە بەستوە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەو کاروان دەنگدەرە کیّیە؟! گوتیان: ئەوە عامیری کوڕی ئەکوەعە، فەرمووی: خوا بەزەیی پێیدابیّ! پیاوێك لە خەڵکەکە

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆی پێویست بوو (واتە بەهەشتی بۆ پێویست بوو بەهۆی دوعای پێغەمبەرەوە ﷺ) دەبوایە پێت هێشتباین!

دەلالەتی ئەم دەقەش لەسەر مەبەستی ناوبراو وەك مانگی چواردە دیارەو پێویستی بەڕوونکردنەوە نیە، بەڵکو بەلێی،کەمەوە پەسند (مُسْتحبٌ) بوونی گۆرانیی گوتن لەو جۆرە حاڵەتانەدا دەگەیەنێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەرانبەر ئەو شیعرو گۆرانیی گوتنەیدا دوعای خێری بۆ کردوە.

شایانی باسیشە، کە لەلای هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ شتێکی جەڕبێنراو (مُجَرَّبْ) بووە،کە هەرکەسێك پێغەمبەر ﷺ دوعای بەهەشتو ڕەحم پێکرانی بۆ کردبێ، زوو شەهید بووە، بۆیەش لەکاتی دوعاکەی پێغەمبەردا بۆ (عامر)، یەکێکیان گوتوویەتی: (وجَبَتْ) واتە: بەهەشتی بۆ پێویست بوو، پاشان گوتوویەتی: (لولا أمْتَعْتَنا به) واتە: خۆزگە لێی گەڕابایو دوعای چوونە بەهەشتت بۆ نەکردبایەو لەنێوماندا مابایەوە!

دیارە لە سیرەشدا هاتوە،کە عامیر لەو سەفەرو جەنگەدا کوژراوەو نەگەڕاوەتەوە.

خوێنەری بەڕێز!

پاش ئەم یازدە (١١) دەقەی سوننەتی پێغەمبەری خواش ﷺ بۆمان دەرکەوت، کە سوننەتی پێغەمبەریش وەك کتێبی خوا سبحانە وتعالی، بەڕوونو ڕاشکاویی ڕەوایی گۆرانییو ئامێرەکانی دەردەخات،بەڵام بێگومان بەو مەرجانەوە،کە پێشتر خستماننە ڕوو، ئێستاش باسەرنجێکی خێراش لەچەند شوێنەوارێکی هاوەڵان (آثار الصَّحابة)ش بدەین: بۆ زێدە دڵنیاییو بەرچاو ڕوونبوونەوە:

## سێ: چەند شوێنەوارێك لە هـاوەڵانەوە لەسەر لە بنەڕەتەوە ڕەوابوونـی گۆرانیی و ئامێرە دەنگـییەكـان :

خوێنــەری بەڕێــز!

دوای ئەوەی لە خاڵی یەكەم و دووەمی ئەم باسەدا، چەند ئایــەتێكی قورئــان و چەند دەقێكی سوننەتمان بە بەڵگــە هێنانــەوە لەســەرئەوە،كە گــۆرانییو ئــامێرە دەنگییەكان لە بنەڕەتەوە ڕەوا (مُباح)ن، مادام ئەو چوار مەرجەیان تێــدا ڕەچــاو كرابن،كە پێشتر خستماننەڕوو - لە باســی شەشــەمی ئــەم بەشــی ســێیەمەدا-، لێرەشدا حەوت نموونە لەو شوێنەوار (أثر)انەی هاوەڵان -خوا لێیان ڕازی بێ-، كە ڕەوایی گۆرانییو مۆسیقا دەگەیەنن، وەك بەڵگەیەكی دیكەی سێیەم دەخەینەڕوو، هەرچەندە لە باسەكانی ڕابردووشدا، ئاماژەیەكمان بەهەڵوێستی ئیجابیی هەندێك لە هاوەڵان لەوبارەوە كردووە:

١- (عن وهَبِ بن كَيْسان قال: قال عبدالله بن الزّبير وكان مُتَكئاً: تَغَنَّى بِلالٌ، فقال له رَجُلٌ: تَغنَّى؟! فاستوى جالساً ثم قـال: وأَيُّ رجُـلٍ مـن المهـاجرين لم أسْـمَعْهُ يَتَغَنَّى النَصْبَ؟! وفي لفظٍ: ما أعلمُ رجلاً من المهاجرين الاّ سَمِعْتُهُ يَتَرَنَّمُ) أخرجه البيهقي باللفظ الأول، وعبدالرزاق في (المصنَّف) باللفظ الثاني وإسنادهُ صحيحٌ وأخرجـه الفاكهي باسناد صحيح.

واتە: وەهەبی كوڕی كەیسان دەڵێ: عەبدوڵلای كوڕی زوبەیر، كە پاڵیدابۆوە گوتی: بیلال (واتە: بیلالی حەبەشەیی (خوا لێی ڕازی بێ) ) گــۆرانیی گــوت، پیاوێك پێی گوت: گۆرانیی گوت؟! ئەویشدانیشتو پاشان گوتی: جا چ پیاوێك هەبووە لە كۆچكەران،كە گوێم لێی نەبووبێ گۆرانیی (نەصب)ی گوتبێ؟!

لەبێژەیەكداهاتوە: هیچ پیاوێكم لە كۆچكەران پێ شك نایەت، كە گوێم لــێ نەبووبێ دەنگی خۆی نەلاراندبێتەوە (واتە: گۆرانیی نەگوتبێ).

(نَصْب)یش جۆرە گـۆرانیی گـوتنێکی عـەرەبییـە، وەك چـۆن كـورد لاوكو حەیرانی هەن.

٢- (عن السّائب بن يزيد قال: بيْنا نحن مع عبدالرحمن بن عوف في طريق الحجِّ ونحن نَؤُمُّ مكة، اعتزل عبدالرحمن الطريق ثم قال لِرَباح بن المغترف: غَنِّنا يا أبا حسّان، وكان يُحْسِنُ النَّصْبَ، فَبَيْنا رباح يُغَنِّيه أدركهم عمر بن الخطاب في خلافته، فقال: ما هذا؟ فقال عبدالرحمن ما بأس بهذا نَلْهو ونُقَصِّرُ عنّا، فقال عمر: فانْ كنت آخذاً فَعَلَيْك بشعر ضرار بن الخطاب، وضرار رَجُلٌ من بني مُحارِبِ بن فِهْرٍ) رواه البيهقي وأحمد وأبو يعلى والضياء في (المختار) وهو صحيح.

واتە: سائیبی کوڕی یەزید دەڵێ: لەکاتێکدا،کە لەگەڵ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف لەڕێی حەجدا بووین بەرەو مەککە، عەبدوڕڕەحمان لەڕێ لایداو پاشان بە ڕەباحی کوڕی موغتەریفی گوت: هۆ ئەبا حەسسان گۆرانیمان بۆ بڵێ! کە گۆرانیی نەصبی باش دەزانی، جا لەکاتی گۆرانیی گوتنی ڕەباحدا عومەری کوڕی خەتتاب، کە لە ڕۆژگاری خەلیفایەتی خۆیدابوو، پێیان گەیشتو گوتی: ئەوە چییە؟ عەبدوڕڕەحمانیش گوتی: ئەمە هیچ گرفتی تێدانیە خۆ دەخافڵێنینو ڕێیەکەمان کورت دەکەینەوە، عومەریش گوتی: جا ئەگەر شیعر دەخوازییەوە هی ضیڕاری کوڕی خەتتاب بخوازەوە، ضیڕاریش پیاوێك بوو لە هۆزی موحارِیبی کوڕی فیهر.

٣- (عن عبدالله بن عباس رضي الله عنهما: أنه بينما هو يسير مع عمر ﷺ في طريق مكة في خلافته ومعه المهاجرون والأنصار فَتَرَنَّم عُمَرُ بِبَيْتٍ فقال رجلٌ من أهل العراق ليس معه عراقي غيره: غَيْرَكَ فَلْيَقُلْها يا أمير المؤمنين! فاسْتَحْيا عمرُ من ذلك وَضَرَبَ راحِلَتَهُ حتى انْقَطَعَتْ عن الركبْ) أخرجه البيهقي باسنادٍ صحيحٍ.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس -خوا لێیان ڕازی بێ- دەڵێ: لەکاتێکدا،کە لەگەڵ عومەردا -خوا لێی ڕازی بێ- لە ڕۆژگاری خەلیفایەتی خۆیدا بەرەو مەککە دەچوونو کۆچکەرو پشتیوانانیشی لەگەڵ بوون، عومەر شیعرێکی بە

شێوەی گۆرانیی گوت، کابرایەکی عیـراقیش، کە جگە لەو عیـراقی دیکـەی لەگەڵ نەبوون، گوتی: ئەی ئەمیری بڕواداران بایەکێکی دیکە ئەوە بڵێ! ئیـدی عومەریش بەو هۆیەوە شەرمی کردو ولاخەکەی دەنگدا ،هـەتا لـە کاروانەکـە دابڕا.

٤- (عن أسلم مَولى عمر بن الخطاب قال: سَمِعَ عُمَرُ رجُلاً يتَغَنَّى بِفَلاةٍ من الأرض، فقال: الغِناءُ من زادِ الرّاكبِ) أخرجه ابن أبي شيبة والبيهقي وإسناده حسن، وابن عبدالبَرّ.

واتە: ئەسلەمی خزمەتکاری عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێ:

عومەر - خوا لێی ڕازی بێ- گوێی لە پیاوێك بـوو لـە دەشـتو سـارایەك گۆرانیی دەگوت، ئەویش گوتی: گۆرانیی گوتن بەشێکە لە توێشووی ڕێبوار.

٥- (عن محمد بن عبدالله بن نوفَل: أنَّه رأى أُسامة بـن زَيْـدٍ رضـي الله عنهمـا في مَسْجِد الرسول ﷺ مُضْطجِعاً رافعِاً إحدى رِجْلَيْه على الأخرى يَتَغَنّى النَّصْبَ) أخرجه البيهقي وابن عبدالبَر وإسناده صحيحٌ.

واتە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی نەوفەل دەڵـێ: ئوسـامەی کـوڕی زەیدی -خوا لێیان ڕازی بێ- بە ڕاکشـاویی لـە مزگـەوتی پێغەمبـەردا ﷺ بینیوە،کە لاقێکی لەسەر ئەوی دیکە داناوەو گۆرانیی نەصبی چڕیوە.

٦- (عن عبدالله بن عُتْبة أنه سمع عبدالله بن الأرقم رافعاً عَقِيرَتَـهُ يتَغنّـى، قـال عبدالله: ولا والله مارأيت رجلاً قطّ مِمَّنْ رأيت وأدركتُ، أراه قال: كان أخشى لله من عبدالله بن الأرقم رضي الله عنه). أخرجه البيهقي بأسنادٍ صحيحٍ.

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عوتبە دەڵێ: گوێی لە عەبدوڵلای کوڕی ئەرقەم بوو دەنگی خۆی هەڵبڕیبوو گۆرانیی دەگوت، عەبدوڵلا (واتە: کوڕی عوتبە) دەڵێ: نەخێر بەخوا هیچ پیاوێکم لەوانەی بینیومن و پێیان گەیشتووم، نەبینیوە،کە لە عەبدوڵلای کوڕی ئەرقەم لەخوا ترستر بووبێ.

دیــاره مەبەســتی عەبــدوڵڵای کــوڕی عوتبــەش بــەو قســەیەی کۆتــایی هەرئەوەیە،کــە گــۆرانیی گــوتنی عەبــدوڵڵای کــوڕی ئەرقــەم بــەهۆی کــەم پارێزکارییەوە نەبووە، لەو قسەیەشەوە دەفامرێتەوە،کە مرۆڤی زۆر پارێزکارو دینداریش دەگونجێ گۆرانیی بڵێ.

٧- (عن خالد بن ذكوان قال: كنّا في المدينة يوم عاشوراء والجواري يَضْرِبْنَ بالدُّفِّ وَيَتَغَنَّيْنَ فَدَخَلْنا على الرُّبيِّع بنت مُعَوِّذٍ رضي الله عنها فذكرنا ذلك لها، فقالت: دَخَلَ عليَّ رسول الله ﷺ صبيحة عُرْسي وعندي جاريتان تَتَغَنّيان وتَنْدُبانِ آبائي الذين قُتلوا يوم بدرٍ، وتقولان فيما تقولان: ((وفينا نَبيٌّ يَعْلَمُ ما في غدٍ)) فقال: أمّا هذا فلا تقولون، مايَعْلَمُ ما في غدٍ الاّ الله) رواه ابن ماجه برقم: ١٨٧٩ وإسناده صحيحٌ.

واتە: خالیدی کــوڕی ذەکــوان دەڵــێ: ئێمــە لــە مەدینــە بــووین لــە ڕۆژی عاشووراداو چەند کچــێك - یــان چــەند کــەنیزەکێك -یــش دەفیــان لێــدەداو گۆرانییان دەگوت، پاشان چووینە لای ڕوبەییعی کچی موعەوویذ -خــوا لێــی ڕازی بێ-، ئەوەمان بۆ باسکرد (کە بینیبوومان)، ئەویش گوتی: بەیانی ئەو ڕۆژە، کە بە بووك چووم، پێغەمبەری خوا ﷺ لێم وەژوور کەوتو منیش دوو کچ (یان دوو کەنیزەك)م لەلابوون گۆرانییان دەگوتو ئەو بابو باپیرانەمان،کە لەڕۆژی (بــەدر)دا کوژرابــوون دەیــان لاواندنــەوە، لــە میانــەی ئــەوەدا، کــە دەیــانگوت، گوتیــان: ( پێغەمبــەرێکمان لەنێودایــە دەزانــێ ســبەینێ چــی دەقەومێ) ئەویش فەرمووی: ئەمەیان مەڵێن، بێجگــە لــە خــوا، هیچــکەس نازانێ سبەینێ چی تێدایە.

ئەم شوێنەوارەش چەند شتێکی لێوەردەگیرێن:

یــەك: مسوڵمانانی شاری مەدینە لە ڕۆژگاری هاوەڵاناو لە ڕۆژی عاشووڕادا، کە نە زەماوەند بووەو نە جەژن، گۆرانییان گوتوەو دەفیان لێداوە، کەواتــە: هەموو کاتەکانی شادیی، کاتی گۆرانیی گوتنو بەکارهێنانی ئامێرەکاننی.

دوو: ڕوبەییع -خوا لێی ڕازی بێ- کە ئافرەتێکی هاوەڵە، ڕەوابوونی گۆرانیی‌و دەفی لە ڕۆژی گوازرانەوەیدا کردۆتە بەڵگەی ڕەوایی‌یان لە کاتەکانی دیکەشدا.

سێ: دروستە پیاوان گوێ بۆ گۆرانیی‌و دەف لێدانی ئافرەتان بگرن‌و بە پێچەوانەوەش، وەك ئەو فەرموودەیەی،کە باسی(أنجشة)ی تێدایەو پێشتر هێنامان دەیگەیەنێ، بەڵام وەك هەمیشە دووبارەی دەکەینەوە بەرەچاوکردنی ئەو چوار مەرجە، کە لە باسی شەشەمدا هێناومانن‌و، هەموو مویاحێکی دیکەش لەوڕووەوە هەروایەو، هیچ شتێك بەڕەهایی‌و بەبێ مەرج‌و بەند (شَرْط وقيد) ڕەوا نیە!

خوێنەری بەڕێز!

ئێستاش پاش خستنە ڕووی بەڵگەکانی قورئان‌و سوننەت‌و شوێنەواری هاوەڵان،کە بێگومان هاوەڵان - خوا لێیان ڕازی بێ- بەگشتیی لە هەموو جیلەکانی دیکەی مسوڵمانان ڕاستترو قووڵتر لە قورئان‌و سوننەت تێگەیشتوون، ئەمجار نۆرەی خستنەڕووی بەڵگەی چوارەم‌و کۆتاییە، لەسەر لە بنەڕەتەوە ڕەوابوونی گۆرانیی‌و ئامێرەکانی.

## چوار: ئامانجەکانی شەریعەت:

جۆرە بەڵگەیەکی دیکە لەسەر لە بنەڕەتەوە ڕەوابوونی گۆرانیی‌و مۆسیقا، ئەوەیە،کە کاتێك سەرنجی شەریعەتی خوای کاربەجێ -سبحانه وتعالي- دەدەین، دەبینین هێنانەدی بەرژەوەندی (تحقيق المصلحة) ئامانجی سەرەکییەتی‌و سووڕگەیەکە،کە سەرجەم دەستوورو یاساکانی تێیدا دەخولێنەوە، جا دیارە بەرژەوەندیی (مصلحة)یش یانی: دوور خستنەوەی زیانەکان‌و دابینکردنی سوودەکان (دَرْءُ المضارّ وجَلْبُ المنافع).

بۆ دەرخستنی ئەو ڕاستییەش، کە هێنانەدی بەرژەوەندیی خەڵکی، سەرەکیترین ئامانجی شەریعەتە، ئەوەندە بەسە کە تەنیا سەرنجی چەند ئایەتێکی قورئانی بەپێز

بدەین، چۆن باسی چوار دروشمە سەرەکییەکەی خوا پەرستیی دەکەن، واتە: نوێژو زەکاتو ڕۆژوو و حەج!

خوای بەبەزەییو زاڵ لەوبارەوە فەرموویەتی:

١- ﴿ ...إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ... ﴿٤٥﴾ العنكبوت ﴾، واتە: بێگومان نوێژ، ڕێگریی دەکات لە هەموو قسەو کردارێکی ناشیرینو خراپ.

٢- ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ... ﴿١٠٣﴾ التوبة ﴾، واتە: لە ماڵو سامانەکانیان زەکاتێك وەربگرە، کە دەبێتە مایەی پاکبوونەوەو تەزکیەبوونیان.

٣- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ البقرة ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ڕۆژوو گرتنتان لەسەر پێویست کراوە، وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە نووسرابوو، بەڵکو پارێز بکەن.

٤- ﴿ وَأَذِّن فِى ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾ لِّيَشْهَدُوا۟ مَنَٰفِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۖ فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ الحج ﴾، واتە: لەنێو خەڵکیدا جاڕی حەج کردن بدە، کە بە پیادەو بەسواری هەر وڵاخێکی لاواز - بەهۆی بڕینی ڕێی دوورەوە- لە هەر ڕێیەکی دوورەوە بێن، تاکو چەندان سوود ببینن، لە ڕۆژانێکی زانراودا (کە ڕۆژانی یەك ،هەتا دە (١٠)ی (ذي الحجة)ن) ناوی خوا لەسەر ئەو ئاژەڵانە بێنن،کە پێماندا‌ون

(لەکاتی سەر بڕیندا)، دەجا خۆشتان لێی بخۆنو لێشی بکەنە خۆراکی هەژاری بێچارە.

وەك دەبینین هەرکام لە نوێژو زەکاتو ڕۆژوو گرتنو حەج، خوای کاربەجێ بۆیە لە سەرمانی پێویست کردوون، چونکە بەرژەوەندیی جۆراوجۆرمان بۆ دێننە دی، ئنجا گومانیشی تێدا نیە وەك پێشتریش گوتوومانە، کە خوا پەرستییەکان ئەسڵ تێیاندا پابەندییە بەدەقەکانەوە، بێ سەرنجدانی حیکمەتەکانیان،بەلاّم هەڵسوکەوتەکان ئەسڵ تێیاندا، سەرنجدانی ئامانج حیکمەتو ڕازو نهێنییەکانیانە، وەك هەرکام لە: (الشاطبي) لە کتێبی: (الموافقات)دا و (ابن تيمية) لە کتێبی: (القواعد النورانية الفقهية)دا و (العِزّ بن عبدالسلام) لە کتێبی: (قواعد الأحكام في مصالح الأنام)دا و زاناو پێشەوایانی دیکەش ڕوونیان کردۆتەوە.

ئنجا ئاشکرایە،کە گۆرانییو مۆسیقا لە بابەتی هەڵسوکەوتەکان (المعاملات)نو، وەك پێشتریش باسمان کردوە خوای کاربەجێ، زۆر بە ڕاشکاویی ڕایگەیاندوە،کە هەرچی پاكو چاكو خۆشە حەڵاڵی کردوەو، هەموو ئەو شتانەش کە پیسو خراپو زیانبەخشن قەدەغەی کردوون: ﴿...وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ...﴿١٥٧﴾ الأعراف﴾، بۆیە بینا لەسەر ئەوە،کە ڕابرد دەڵێین:

هەموو ئەو گۆرانییو مۆسیقایانەی،کە ناچنە خانەی (الخبائث)ەوەو زیان گەیێن نین، ئەوە لەسەر بنەڕەتی خۆیان،کە ڕەوایی (إباحة)یە ماونەوەو حەڵاڵن، چونکە بێگومان دەنگی خۆش ، چ هی مرۆڤ، چ هی باڵندە، چ هی ئامێر بێ، شتێکی چێژ لێوەرگیراو (مُسْتَلَذّ)ەو، ئەمیش مانای سەرەکی (طيِّب)ە، وەك پێشتر لە (العِزّ بن عبدالسلام)ەوە هێنامانو، (الشوكاني)یش لە (نيل الأوطار)دا هەر ئاماژەی

پێکردوە[1]، ئنجا خوای بەبەزەیی زۆر بەڕوونیی‌و لە چەند ئایەتێکدا - کە پێشتر خستوومانە ڕوو- ڕایگەیاندوە،کە هەرچی (طیِّبات)ە حەڵاڵ‌و زەلاڵە‌و، سەرزەنشتی ئەوانەشی کردوە،کە هەروا لەخۆوەو بەپێی میزاج شتە حەڵاڵ‌و ڕەوایەکانی خوا لە بەندەکانی قەدەغەدەکەن!

کەواتـــە:

دەنگ‌و سەدا خۆش‌و چێژدارەکان بەگشتیی ڕەوان، مەگەر بکرێنە وەسیلەو هۆکاری ئامانجێکی خراپ، یاخود شیعرو هەڵبەستێکیان پێ‌بگوترێ، کە نێوەرۆکێکی خراپ‌و ناشەرعیی هەبێ، یان ببنە مایەی وروژاندنی مرۆڤ بەرەو خراپەو تاوان‌و شوێنەواری خراپ لە مرۆڤدا پەیدا بکەن، کە دیارە لەو حاڵەتانەدا ئەو دەنگ‌و سەدایانە، خەسڵەتی (طیِّب)یّتی لەدەست دەدەن‌و، دەچنە خانەی (خبائث)ەوە، بۆیەش حوکمەکەیان لە حەڵاڵیی‌و ڕەواییەوە، بەرەو قەدەغەیی‌و ناڕەوایی دەگۆڕێ.

ئێستاش با کۆتایی ئەم باسی هەشتەمە، کە تەرخانمان کردبوو بۆ هێنانەوەی چەند بەڵگەیەك لەسەر: لە بنەڕەتەوە ڕەوابوونی گۆرانیی‌و مۆسیقا، بەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێنین:

((عن عائشة رضي الله عنها قالت: وَضَعَ رسول الله ذَقَني على مَنْكَبَيْهِ لأَنْظُرَ الى زَفَنِ الحَبَشَةِ، حتى كنت مَلِلْتُ فانْصَرَفْتُ عنهم، قالت: قال رسول الله ﷺ: لتعلم يهودُ أنَّ في ديننا فُسْحَةً إني أُرْسِلْتُ بحنيفية سَمْحَةٍ)) أخرجه أحمد وإسناده حسن.

واتە: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چەناگەمی خستە سەر شانەکانی خۆی،تاکو تەماشای هەڵپەڕینی حەبەشییەکان بکەم، هەتاکو خۆم ماندوو بووم‌و وازم لێیان هێنا، گوتی: پێغەمبەری خواش ﷺ

---

١) بڕوانە: (نیل الأوطار)، ج ٨، ص١٠٩.

فەرمووی: تاکو جوولەکەکان بزانن،کە ئاییینەکەمان فراوانیی تێدایە، من بە ئاییینێکی پاكو ئاسان ڕەوانە کراوم.

لێرەشدا کۆتایی بەم باسی هەشتەمە دێنینو دەگوازینەوە بۆ باسی نۆیەمو کۆتایی ئەم بەشی سێیەمە.

## باسی نۆیەم: چەند وردە بابەتێك لەبارەی گۆرانیی و سروودو مۆسیقاوە:

خوێنەری بەڕێز!

لەم باسی نۆیەمەدا، کە باسی کۆتایی‌یە لە بەشی سێیەمی تەرخانکراو بۆ توێژینەوە لەبارەی (گۆرانییو مۆسیقا)وە، تیشك دەخەینە سەر حەوت وردە بابەت، کە هەندێکیان پێشتریش لەمیانەی باسە پێشووەکاندا ئاماژەیان پێکراوەو، هەمووشیان پەیوەستن بەبابەتی گۆرانییو مۆسیقاوە:

### یەك : گوێ بیست بوونی پیاوان و ئافرەتان بۆ دەنگی یەکدی شتێکی ڕەوایە : بە بەڵگەی ئەوە کە :

١- وەك پێشتریش باسمان کرد، دەنگی خۆش (الصوت الحسن) بەگشتییو، هی هەرکەسو هەرشتێك بێ، لە شتە خۆشو چاکەکان (الطیِّبات)ەو، ئەمانیش بەگشتیی ڕەوان.

٢- ئەو هەموو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ کە گوێی لە دەنگی ئافرەتی گۆرانیی بێژ بووەو قەدەغەشی نەکردوە، هەروەها (أنجشة)ش گۆرانیی بۆ کاروانی ئافرەتان گوتوە.

ئەوەش،کە گوتراوە:

فەرموودەی: ((...مَنْ رابَهُ شيءٌ في صلاتِهِ فَلْيُسَبِّحْ، فأنه اذا سَبَّح التُفِتَ اليه، وإنَّما التصفيق للنساء)) متفق عليه، بەڵگەیە لەسەر قەدەغەبوونی بیسرانی دەنگی ئافرەت، قسەیەکی بێهێزوپێزەو لەگەڵ دەیان ئایەت‌و فەرمایشتی پێغەمبەردا تێکدەگیرێ‌و پێشتریش ڕوونمان کردەوە،کە حیکمەتی چەپڵەلێدانی ئافرەتان لەکاتی نوێژدا بۆ ئاگادارکردنەوەی ئیمام، ئەوەیە،کە دەنگی ئافرەت کزو نزمەو هیچی دی! هەروەها بە بەڵگە هێنانەوەی ئایەتی: ﴿...فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٣٢﴾ الأحزاب﴾، واتە: دەجا قسەی نەرم‌و ناسك مەکەن بە جۆرێك،کە ئەو کەسەی دڵی نەخۆشی تێدایە وەتەماع بکەوێ، بە شێوەیەکی باش قسە بکەن.

بەڵێ، بەبەڵگە هێنانەوەی ئەم ئایەتەش، لەسەر قەدەغەبوونی بیسرانی دەنگی ئافرەت قسەیەکی بێ بنەمایە، چونکە ئەوەی،کە ئایەتەکە قەدەغەی کردوە، خودی قسەکردنی ئافرەتان نیە لەگەڵ پیاواندا، بەڵکو قسەی نەرم‌و ناسك کردن (الأخضاع بالقول)ە[1]، وەك لە ڕواڵەتی ئایەتەکەوە دیارەو، پاشان خوای کاربەجێ هەر لە خودی ئایەتەکەشدا فەرمانی کردوە بە قسەکردن بەشێوازێکی باش: ﴿وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾، کەواتە: ئەوەی،کە قەدەغەیە بریتیە لە قسەکردن بەشێوەیەکی وا، کە سەرنجی بابای دڵنەخۆش ڕابکێشێ، واتە: قسەی نەرم‌و ناسك‌و بە عیشوەو ناز.

ئنجا دەنگی خۆ خۆشکردن (تحسين الصوت) لەکاتی خوێندنی قورئاندا، کە ئەگەر فەرزیش نەبێ سوننەتە، جیاوازیی تێدا نەخراوەتە نێوان (نێرو مێ)وەو، پێغەمبەری خوا ﷺ بەگشتیی فەرمانی بە مسوڵمانان کردوە،کە دەنگی خۆیان بە خوێندنی قورئان خۆش بکەن: ((حَسِّنوا القرآن بأصواتكم فأن الصَّوت الحَسَنَ

١) بڕوانە: (المعجم الوسيط)، ص٢٤١، (أَخْضَعَ فلانٌ: أَلانَ كلامَهُ للمرأة...).

یزیدُ القرآن حُسْناً)) أخرجه الدارمي والحاكم والبیهقي، وهو حسن، واتە: قورئان بەدەنگی خۆتان جوان بکەن، چونکە دەنگی خۆش قورئان جوانتر دەکات.

ئنجا شتی سەیر لێرەدا ئەوەیە،کە هەندێك،کەس دەڵێن: گۆرانیی گوتن‌و دەف لێدان، بەس هی ئافرەتانەو بۆ پیاوان ناشێن، پاشان دەشڵێن: دەنگی ئافرەت‌و ڕەنگ‌و ڕوویشی عەورەتن!! ئاخر مادام دەنگی ئافرەت‌و ڕەنگ‌و ڕووی (مەبەست دەم‌و چاویەتی) عەورەت بن، چۆن دەگونجێ گۆرانیی بڵێ‌و دەف لێبدات؟!

## دوو : گۆرانیی گوتن‌و مۆسیقا لێدان کردنە پیشەو کرێ لەسەر وەرگرتنیان، دروستن :

کە دیارە مەبەست لە گۆرانیی‌و مۆسیقا لێرەداو لەهەر شوێنێکی دیکەدا، کە باسی ڕەواییان دەکرێ، گۆرانیی‌و مۆسیقایەکن،کە مەرجەکانیان تێدا ڕەچاو کرابن، بەڵگەش لەسەر ڕەوایی کردنە پیشەی گۆرانیی گوتن‌و مۆسیقا لێدان (واتە: بەکارهێنانی ئامێرە دەنگییەکان)و کرێ (أُجْرة) لەسەر وەرگرتنیان، ئەوەیە،کە وەك پێشتر ڕوونمان کردۆتەوەو سەلماندوومانە، هەرکام لە گۆرانیی گوتن‌و مۆسیقا لێدان ڕەوا (مُباح)ن‌و، دیارە کردنی شتی ڕەواش ڕەوایەو کرێ وەرگرتن لەسەر شتی ڕەواش ڕەوایە، چونکە بنچینەیەکی شەرعییە، کە دەڵێ: (ماکان مُباحاً تعاطیه، جاز أخذ الأُجرة علیه) واتە: هەرشتێك دروست بێ بکرێ، دروستیشە کرێی لەسەر وەربگیرێ.

## سێ : بابای گۆرانیی بێژو مۆسیقارو ئەوەش کە گوێیان لێدەگرێ، بەو ڕەفتارەیان دادگەریی لەدەست نادەن:

بەڵێ کردنی شتی ڕەوا (مباح)، مرۆڤی مسوڵمانی پێ (فاسق) نابێ، چونکە شتی ڕەوا با (لهو)ش بێ، نەك هەر گوناهی گەورە، بەڵکو هی گچکەش نیەو، دیارە بەگوناهی گەورەش نەبێ ئینسان فاسیق نابێ‌و دادگەریی لەدەست نادات،

بەڵگەی ڕەوابوون‌و لەهووبوونی گۆرانیی‌و مۆسیقاش بەگشتیی، پێشتر خراوەتە ڕوو، لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە.

## چوار: لەم ڕۆژگارەدا مۆسیقا بۆ زۆر ئامانجی گرنگ بەکاردێ، بەتایبەت لە بواری تەندروستیی و لە بواری ئابووریدا[1]:

### ١- لە بواری تەندروستییدا:

لەم ڕۆژگارەدا جۆرێك لە مۆسیقا بەناوی (Music Therapy) لە بواری پزیشکییدا بۆ چارەسەری چەند نەخۆشیی‌و گرفتێکی تەندروستیی بەکاردێ، بۆ نموونە:

أ- حاڵەتی هەڵبەزو دابەزو دواکەوتوویێتی عەقڵیی، کە تووشی منداڵ‌و هەرزەکارو بەساڵدا چوان دەبێ.

ب- سووککردنی ئێش‌و ژانی نەخۆشییەکانی چوونە تەمەنەوە، بۆ نموونە: نەخۆشی زایمەر (Aizheimer، sdisease).

ج- سەرجەم حاڵەتەکانی گرفتی مێشك‌و هەندێك لەحاڵەتەکانی نەخۆشبوونی مێشك بەهۆی ماددە سڕکەرەکانەوە.

د- هەندێك ئازاری درێژخایەن، یاخوود توند.

هـ- ئاسانکردنی منداڵبوون‌و سووککردنی ئازاری ئافرەت لەکاتی منداڵبووندا.

و- چاککردنی حاڵەتەکانی دواکەوتوێتیی گەشەکردن‌و فێربوون.

---

١) بۆ نووسینی ئەم باسە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتوە:

أ- (الموسيقى والغناء في ميزان الاسلام) عبدالله بن يوسف الجديع، ص٢٣٢.

ب- (الموسيقى وأثرها في الطب) مجلة: (ثمرات المقاصد)، العدد٧، عام١٩٩٤، ص٢٧-٢٨.

ز- کاریگەریی ئیجابیی لەسەر کۆئەندامی هەرس، هەربۆیەش چێشتخانەکان مۆسیقا لێدەدەن بۆ جوولاندنی ئارەزووی خواردن.

ح- کاریگەریی ئیجابیی لەسەر کۆئەندامی دەمارو مێشك، هەربۆیەش خەستەخانەو فڕۆکەخانەو هوتێلەکان مۆسیقا لێدەدەن لە ساڵۆنو هۆڵەکانی چاوەڕوانییدا بۆ ئەوەی دڵو مێشکی ڕێبوارەکان ئارام بکاتەوە.

ط- گەشەپێدانی توانا هزرییەکانی منداڵان.

**٢- لە بـواری ئابووریـیدا:**

هەروەها لەم ڕۆژگارەدا لە چەند ڕوویێکەوە لە بواری ئابوورییدا سوود لە مۆسیقا وەردەگیرێ، بۆ نموونە:

أ- ڕاوی ماسی.

ب- بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەمی پەڕەورەکان (الدواجن).

ج- بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەمی شیردەرەکان.

## پێنج: هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەوەنیە، کە ئافرەتانی دەف لێدەری ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ کچی گچکەی نابالغ بووبن:

هەندێ کەس لە بەقەدەغەدانەرانی گۆرانییو مۆسیقا، دەڵێن:

ئەوانەی، کە لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ گۆرانییان گوتوەو دەفیان لێداوە، کچی بچووك بوونە، بۆیە دروست نیە ئەو فەرمایشتانە بکرێنە بەڵگەی ڕەوایی گۆرانیی گوتنو دەف لێدانی ئافرەتی باڵغ!

بەڵام لەڕاستیدا ئەو قسەیە هەڵەیە، چونکە:

١- وشەی (جواري)،کەکۆی (جارية)یە، یان (جاریتان)،کە(مُثَنَّی)یەتی، کە لە فەرموودەکاندا هاتوون، مەبەست پێیان کچۆڵە (صَبِيّة) نیە، بەڵکو وشەی (جارية) فەرهەنگی (المعجم الوسيط) گوتوویەتی‌و پێشتریش ئاماژەمان پێکرد بە دوو واتایاندا: یەکەم: کچی تازە پێگەیشتوو، دووەم: کەنیزەك ،ئەگەر پیرەژنییش بێ: (الجارية: الأمةُ وإن كانت عَجُوزاً، والفَتيَّةُ من النساءِ)[1].

٢- ئنجا وەك چۆن وشەی (جواري) بەکارهاتوە، بەهەمان شێوە هەرکام لە وشەی: ئافرەت‌و گۆرانیی بێژ (امرأة و قَيْنَـة)ش هەر بەکارهاتوون، بۆ نموونە: ((عن السائب بن يزيد أن امرأةً جاءت الى رسول الله ﷺ فقال: يا عائيشة! أتعرفين هذه؟! قالت: لا، يا نَبيَّ الله، قال: هذه قَيْنَـةُ بني فُلانٍ..))، أخرجه أحمد وغيره، کە پێشتریش هێناومانەو ماناشمان کردوە.

٣- پاشان،ئەگەر ئەو گۆرانیی بێژو دەف لێدەرانە کچی نابالغ‌و گچکە بوونایە، ئەوە نەدەگونجا ئەبوبکر -خوا لێی ڕازی بێ- سەرزەنشتیان بکات‌و ڕێگرییان لێ بکات لەسەر کردەوەکەیان، وەك لەو فەرمایشتەدا هاتوە، کە (بخاري و مسلم) لە عائیشەوە - خوا لێی ڕازی بێ- هێناویانەو، پێشتریش هێناومانەو سەرەتایەکەی ئاوایە:

((عن عائشة رضي الله عنها قالت: دخل عَليَّ أبوبكرٍ وعندي جاريتان من جواري الأنصار تلعبان بِدُفَّين تُغنِّيان...)).

## شەش : هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەوە نیە، کە دەف لێدان تایبەتە بە ئافرەتانەوەو پیاوی دەف لێدەر خۆی بە ئافرەتان شوبهاندوە :

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لَعَن الله المُتَشبّهين من الرّجال بالنساءِ، ولعن المتشبهات من النساء بالرجال)) رواه أحمد و الطبراني إسناده صحيح.

١) بڕوانە: ص١١٩.

واتە: خوا نەفرینی لە پیاوانی خۆ بە ئافرەتان چوێنەر کردوە، نەفرینیشی لە ئافرەتانی خۆ بە پیاوان چوێنەر کردوە.

جا هەندێك،کەس پێیان وایە لە سۆنگەی ئەوەوە،کە لە فەرمایشتەکاندا هاتوە،کە دەف لێدەرانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بە زۆری ئافرەت بوونە، کەواتە: هەر کەسێك دەف لێبدات، ئەوا وەبەر هەڕەشەی پێغەمبەر ﷺ دەکەوێ، بەهۆی خۆ چواندنی بە ژنانەوە!

بەلاّم لە ڕاستیدا ئەو قسەیە ڕاست نیە، چونکە خۆچواندن (تَشَبُّه)ی پیاوان بە ئافرەتان ئەوەیە، کە خەسڵەتو ڕەفتارێکی ئافرەتانەی وا بێننە دی، کە تایبەتمەندیی ڕەگەزی مێینە بێ و، وەك شتێکی سروشتی لێیان جیا نەبێتەوە، وەك مەکرو نازکردنو بەکارهێنانی زێڕو ئاوریشمو خەنەو...هتد.

ئنجا،ئەگەر لە ڕۆژگاری پێغەمبەریشدا ﷺ گۆرانیی گوتنو دەف لێدان تایبەت بووبن بەئافرەتانەوەو، هەر پیاوێك دەستی بۆ بردبن، بە سەر ژنانیی (مُخَنَّثْ) دانرابێ! ئەوە بێگومان ئەو مەسەلەیە بڕیارێکی شەرعیی نەبووە، بەڵکو باوێکی عورفیی بووە، هەرکاتێکیش عورفو باو گۆڕا، حوکمی ئەو شتەش بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەگۆڕێ، بەپێی بنچینەی: (لایُنکَرُ تغیُّر الأحکام بتغیُّر الأزمان والأعراف والأحوال): نکوڵیی لە گۆڕانی یاساکان ناکرێ بەگوێرەی گۆڕانی کاتو عورفو حاڵەتەکان، بەپێی بنچینەی: (المعروفُ عُرْفاً کالمشروع شرعاً): ئەوەی بەپێی عورف دادەنرێ، وەك ئەوەیە،کە بەشەرع دانراوە[1].

ئنجا شتێکی ئاشکراشە، کە عورفو باوی تێکگیراو لەگەڵ شەریعەتدا، هیچ ئیعتیبارێکی نیە، چونکە بنچینەیەکی شەرعییە: (لا إجتهاد في مَعْرِض النصِّ): لەکاتی هەبوونی دەقدا بواری ئیجتیهاد کردن نیە.

دیارە پێشتریش چەند جارێك دووپاتمان کردۆتەوە،کە بناغە لە خوا پەرستییەکان (العبادات)دا پابەندییە بە دەقەکانی شەریعەتەوە، بێ سەرنجدانی حیکمەتو

---

١) دیارە بەمەرجێك ئەو عورفە پێچەوانەی دەقێکی شەریعەت نەبێ.

ئامانجەکان،بـەلاّم بناغـە لـە هەڵس وکەوتـەکان (المعـاملات)دا هێنانـەدیی بەرژەوەندییەکانە، کە ئەمەش پەکی لەسەر سەرندان و لێوردبوونەوەی حیکمەت و ئامانجەکان، کەوتوە.

بۆیە ناگونجێ بڵێیـن:

مادام لە دەقەکانی سوننەتدا تەنیا باسی دەف لێدانی ئافرەتان کراوە، پێویستە هەر لەسەر ئەوان کورت هەڵبهێنرێ! چونکە خۆ دەف لێدان و گۆرانیی گوتن جۆرێك نین لە عیبادەت،تاکو ناچار بین تێیاندا لە دەقەکانی شەریعەت لانەدەین و، چ جۆرە چۆنیەتییەکیان هەبووە، هەر بەو شێوەیە بیانکەین!!

## حەوت : شیعر کەرەسەی خاوی گۆرانیی و سروودە، بەپێی نێوەڕۆکەکەی حوکمـی دەگـۆڕێ :

بەڵێ شیعر،کەکەرەسەی خاوی گۆرانیی و سروودو بگرە مۆسیقاشە، حوکمێکی گشتیی لەبارەوە نادرێ و، بەگوێرەی نێوەڕۆکەکەی حوکمەکەی دیاری دەکرێ.

خـوای کاربـەجێ لـەبارەی شـاعیرانەوە فەرموویـەتی: ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾ الشعراء﴾.

واتە: شاعیرەکان، سەرگەردانان شوێنیان دەکـەون، نـابینی چـۆن بـە هـەموو شیواندا دەڕۆن و لە هەموو ئاشان لێدەکەن، شتی وادەڵێن،کە ئەنجامی نادەن، جگە لەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکان دەکەن و،زۆر یادی خوا دەکـەن، پـاش سـتەم لێکـران تۆڵـە دەکەنـەوە، ئەوانـەی سـتەمکارن لەمـەودوا دەزانـن، چ هەڵگێڕانەوەیەك هەڵدەگێڕرێنەوە!

کەواتـــە:

شاعیرەكان هەموویان یەك حوكمیان نیە، بەڵكو بەگوێرەی بابەت و نێوەڕۆكی شیعرەكانیان حوكمیان دەگۆڕێ، دیارە نێوەڕۆك و بابەت و چۆنیەتی شیعرەكانیشیان هەڵقوڵاوی جۆرو چۆنیەتی كەسێیەتی هەركامێكیانە، چونكە وەك گوتراوە: (وكلّ إناءٍ بالّذي فيه ينْضَحُ).

پێغەمبەری خواش ﷺ لەبارەی شیعرەوە ئەم فەرمایشتەی لێوە گێڕراوەتەوە: ((عن عائشة رضي الله عنها قالت: سُئِلَ رسولُ الله ﷺ عن الشِّعر؟ فقال: هو كلامٌ فَحَسَنُه حَسَنٌ وقبيحُهُ قبيحٌ)) أخرجه البخاري في (الأدب المفرد) والطبراني والدار قطني وأبويعلى في مسنده، وإسنادُهُ حَسَنٌ، واتە: عائیشە -خوای لێ ڕازی بێ- گێڕاویەتەوە،كە لەبارەی شیعرەوە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرا؟ فەرمووی: شیعر قسەیە، چاكەكەی چاكەو، خراپەكەیشی خراپە.

لێرەشدا كۆتایی بەم باسی نۆیەمە دێنین،كەباسی كۆتایی بوو لەم بەشی سێیەمە، كە تەرخانمان كردبوو بۆ توێژینەوە لەبارەی گۆرانییو سروودو مۆسیقاوە.

# پوختــەی قسان لەبارەی حوکمی گۆرانیی و ســروودو مۆســیقاوە

خوێنەری بەڕێــز!

خوای کاربەجێ سبحانە وتعالی شتی حەڵاڵی بەدوو شێوە ڕوون کردۆتەوە:

١- بە کورتیی (إجمــالاً)، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە،کە نــاکرێ ســەرجەم جۆرو تاکەکانی شتە حەڵاڵەکان،کە یەکجار زۆرو زەوەندن، سەرژمێر بکرێن،بەڵام بە گشتی ڕایگەیاندوە،کە هەرچی لە ئاســمانەکانو زەویدایـــە بۆ بەندەکانی ڕام کردوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ... (١٣) الجاثية ﴾.

٢- بە درێژی (تفصیلاً)، کە بریتیە لە باسکردنی چەند نموونەیەك، تــاکو چــاکەو نیعمەتی خۆی بەسەربەندەکانییەوە دەربخات، بۆ نموونە:

﴿ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ (٥) المائدة ﴾،

واتــە: ئــەمڕۆ هەرچــی پــاكو چــاکە بۆتــان حــەڵاڵکراوە، هــەروەها خــواردن (سەربڕاو)ی ئەوانەی کتێبیان دراوەتێ بۆتــان حەڵاڵــەو خــواردن (ســەربڕاو)ی

ئێوەش بۆ ئەوان حەڵاڵە، وە ئافرەتانی داوێن پاك لە بڕواداران و ئافرەتانی داوێن پاك لە وانەی کە پێش ئێوە کتێبیان دراوەتێ..

،بەڵام خوای زاناو شارەزا تبارك وتعالى شتی حەرامی بە درێژیی خستۆتە ڕوو، بە سەرجەم تاکە (مفردة)کانییەوە، وەك فەرموویەتی:

﴿...وَقَدۡ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيۡكُمۡ إِلَّا مَا ٱضۡطُرِرۡتُمۡ إِلَيۡهِۗ... ﴿١١٩﴾ الأنعام﴾.

واتە: ... وەئەوەی لێی قەدەغەکردوون بەدرێژیی و بەڕوونیی بۆی باسکردوون،جگە لەوەی کە بۆی ناچاردەبن...

پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: ((ما أحلَّ الله في كتابه فهو حلالٌ، وما حرَّم فهو حرامٌ، وماسكت عنه عفوٌ، فاقبلوا من الله عافيته فإنَّ الله لم يكن لَينْسى شيئا ثم تلا: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ مريم﴾))، أخرجه البزّاز والطبراني والدارقطني والحاكم والبيهقي عن أبي الدرداء، وهوصحيح.

واتە: هەرشتێك،کە خوا لە کتێبی خۆیدا، حەڵاڵی کردبێ حەڵاڵە، هەرشتێك،کە قەدەغەی کردبێ قەدەغەیە، هەرشتێك لێی بێدەنگ بووبێ ئەوە ڕەوایە، دەجا ئەوەی، کە خوا بۆی ڕەواکردوون لێی وەربگرن، چونکە ناگونجێ خوا هیچ شتێکی لەیاد بچێ، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ( پەروەردگارت هەرگیز شتی لەیاد ناچێ).

ئنجا دیارە هەرکام لە گۆرانیی و ئامێرەکانی مۆسیقا پێش ئیسلام هەبوون، کاتێك ئیسلامیش هاتوەو شەریعەت هاتۆتە خوارێ، هەرچەندە بە ڕوونیی و بەدرێژییش باسی تێکڕای قەدەغەکراوەکانی کردوە،بەڵام باسی قەدەغە بوونی گۆرانیی و مۆسیقای نەکردوە!

## بۆیە دەڵێین:

بناغەو نێوەڕۆکی گۆرانیی و مۆسیقا دەنگی خۆشە،دەنگی خۆشیش نیعمەتێکی خواییەو، وەك سەرجەم شتە ڕەوا(مُباح)یەکان لە ئەسڵدا ڕەوایە،بەڵام دوایی

بەپێی ئەو چۆنیەتی‌یەی پێی بەکاردێ‌و، بەگوێرەی ئەو ئامانجەی بۆی بەکاردێ، حوکمی دیاری دەکرێ،ئەگەر بە چۆنیەتییەکی ڕەواو شەرعیی بەکاربێ، ئەوجار تەماشای ئەو ئامانج‌و مەبەستە دەکەین،کە بۆی بەکاردێ:

* ئەگەر پێویست بوو، وەك قورئان خوێندنی فەرزو هاندانی خەڵك بۆ جەنگ‌و جیهاد لەکاتی پێویست بوونیدا، ئەوە پێویست (واجب)ە.

* ئەگەر ئامانج‌و مەبەستەکە پەسندبوو، بۆ نموونە: خۆشحاڵیی دەربڕین لەڕۆژی جەژنداو، کاتی زەماوەندو، هاندانی خەڵك بۆ هەر کارێکی چاك، ئەوە سوننەت (مُسْتَحبٌّ)ە.

* ئەگەر ئامانج‌و مەبەستەکە شتێکی خراپ‌و قەدەغە بوو، بۆنموونە: هاندانی خەڵك بۆ فەسادو بێ بەندوبارییو، پێدا هەڵگوتن‌و مەدحکردنی خەڵکی ستەمکار، ئەوە قەدەغەیە.

* ئەگەر بۆ ئامانج‌و مەبەستێکی ناپەسند(مکروه) بەکاربێ، بۆ وێنە: گوتنی قسەو شیعری ناپەسندو، هاندانی خەڵکی بۆ شتی ناپەسند، ئەوە ناپەسندە.

* ئەگەر ئەو ئامانج‌و مەبەستە، کە دەنگی خۆشی گۆرانیی‌و مۆسیقای بۆ دەکرێتە هۆکارو ئامراز، هیچ کام لەو چوار حاڵەتەی نەبن،کە باسمان کردن‌و هیچ کام لەو چوار حوکمە شەرعییە (پێویست بوون، پەسندبوون، قەدەغەبوون، ناپەسند بوون)ی بەسەردا نەچەسپن، ئەوە هەر لەسەر حاڵەتی ئەسڵیی خۆی، کە ڕەوایی (إباحة)یە ماوەتەوە.

## کەواتــە:

گۆرانیی‌و سروودو مۆسیقا لە ئەسـڵدا، وەك دەنـگ‌و سـەدای خـۆش حـەڵاڵ‌و زوڵاڵن،بەڵام پاشان بەگوێرەی نێوەڕۆکیان‌و چۆنیەتی‌و ئامـانجی بـەکارهێنرانیان، حوکمەکەیان دەگۆڕێ، وەك (العِزّبن عبدالسّلام) لە کتـێبی: (قواعـد الأحکـام في مصالح الأنام)دا گوتوویەتی[1]: گوێڕاگرتن لە دەنگ‌و سەدایەکان بەگشـتیی،پێنج حوکمە شەرعییەکانی بەسەردا دەچەسپن.



١) بڕوانە: ج١، ص٣٤٣، لەژێر ناوونیشانی: (حاسة السَّمع وتتعلق بها الأحکام الخمسة)دا.

خوێنـــەری بەڕێـــز!

ئەم بەشی چوارەمە، کە تەرخان کـراوە بـۆ توێژینـەوە لـەبارەی: وێنـەگرتن‌و وێنەکێشان‌و پەیکەر تاشینەوە، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێداوە، لە پێنج باسان پێکـدێ، کە ئەمە ناوونیشانەکانیانە:

١- ڕوونکردنەوەی چەمك‌و واتای: تصویر، رسم، نحت.

٢- چەند دەقێکی قورئان‌و سوننەت لەبارەی وێنەکێشان‌و پەیکەرتاشینەوە.

٣- ئەنجامگیریی: حوکمی وێنەکێشـان‌و پەیکەرتاشـین‌و بـەکارهێنانی وێنـەو پەیکـــەر.

٤- وێنەی فۆتۆگرافی‌و سینەمایی‌و کاریکاتێر.

٥- وێنەی ئافرەت.

ئێستاش بە ڕیز پێیاندا دەچینە خوار:

## باسی یەکەم: ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای: تصویر، رَسمْ، نَحْت:

### ١- تَصْویرْ:

لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا گوتراوە: [(١)]:

(صوَّرهُ: جعل له صورةً مُجسَّمةً، وفي التنزيل العزيز: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ فِى ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦﴾ آل عمران ﴾، وصَوَّر الشَّيءَ أو الشَّخص: رَسَمَهُ على الورق أو الحائط ونحوهما بالقلم أو الفِرْجَوْنِ أو بآلة التصوير. والتصوير، نقش صورة الأشياء أو الأشخاص..)، واتە: (صَوَّرَهُ) یانی: وێنەیەکی پەیکەرداری بۆ دروستکرد، لە قورئانی زاڵ دا هاتوە: (خوا ئەو کەسەیە،کە هەر چۆنێك بیەوێ لە مندالْدانەکاندا وێنەتان دەکێشێ..).

دەگوترێ: وێنەی شتەکە، یان کەسەکەی کێشا، یانی: لەسەر کاغەزو دیوارو وێنەی وان، بە قەڵەم، یان فڵچە، یان ئامێری وێنەگرتن، وێنەی کێشا.

(تصویر) بریتیە لە دروستکردنی وێنەی شتان، یان کەسەکان.

### ٢- رَسْم:

لەبارەی وشەی (رسم)یشەوە لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا گووتوویانە[(٢)]:

(رَسَمَ على الوَرَق: خَطَّ، ورَسَمَ البناءَ، أعْلَمَ، وَرَسَمَ الكِتابَ: كَتَبَهُ.. والرسَّامُ من يَرْسُمُ بالقَلَم أشكالاً، أو صوراً، أو خُطوطاً).واتە: (رَسَمَ الورق) یانی: لەسەر کاغەز خەتی کێشا، (رَسَمَ البِناءَ) یانی: خانووەکەی نیشانەدار کرد، (رسَمَ

١) المعجم الوسيط، ص.٥٢٨

١) هەمان سەرچاوە، ٣٤٤-٣٤٥.

الکتـاب) یانی: کتێبەکەی نووسی... (رسّام) کەسێکە،کە بە قەڵەم، دیــمەنان، یان وێنان، یان هێڵان دروست دەکات.

### ٣- نَـــحْـــتْ:

لەبارەی (نَــحْـت)یشەوە گوتراوە[1]:

(نَحَتَ نَحْتاً و نحيْتاً: زَحَرَ، ونَحَت الشيئَ نَحْتاً: قَشَرَهُ وبرَاه، يقال: نَحَـتَ الخَشَبَ ونحت الحجر، ويقال: نحته السَّفَرُ: أنْضاهُ وَرَقَّهُ، ونُحِتَ فلانٌ على الكَرَم: طُبِعَ عليـه، ونَحَـت الجَبَـل: قَطَـعَ منــه، وفي التنزيــل العزيــز: ﴿ وَكَانُوا۟ يَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴿٨٢﴾ الحجر﴾.

والمِنْحـاتُ: مـا يُنْحَـتُ بـه كالقَـدوم ونحوهـا، ج: مَناحيـت... النِّحاتَـةُ حرفـة النحّات... والنحّات: مَن مِهنتُهُ النحّاتَةُ).

پوختەی مانای ئەو قسـانەش، کـە لـە بـارەی وشـەی (نَـحْـت) ەوە کـراون، ئەمەیە:

(نـحت) یانی: ڕووشاندی، یان بریینداری کرد، هەروەها (نحت) بە مانای توێکڵ لێکردنەوەو سپیکردنی درەختو تاشینی تەختەو بەردیشدا، هەروەها کەسێك،کە لە ئەنجامی سەفەرو بڕینی ڕێی دووردا کزولاواز دەبێ، دەڵێن (نَحَتَهُ السَّفَرُ)، لـە قورئاندا هاتوە: (( عادەتیان وابـوو لـە ژیـانێکی هـێمن دا خانوویـان لـە چـیا دادەتاشی)).

(مِنحات) هەرشـتێکە،کە بـۆ تاشـین بـەکاربێ وەك (تەشـوێ)و کۆیەکـەی (مَناحیت)ەو (نِحاتـةَ)ش پیشـەی تاشینەو، (نحّات)یش کەسـێکە، کـە پیشـەکەی داتاشین بێ.

---

١) هەمان سەرچاوە، ص٩٠٦.

ئنجا خوێنـــەری سەنگین!

بە سەرنجدانی مانای هەركام لە (تصویر و رَسْم و نَحْت) دەگەینە ئەم ئەنجامەی خـــواری:

یەكـــەم: وشەی (تصویر) مانای هەركام لە (رسم)و (نحت)یش دەگرێتەوە، چـونكە هەرجۆرە وێنە دروستكردنێك دەگرێتـــەوە، چ بەدەســت، چ بـــە ئـــامێر، وە چ لەسەر كاغەزو تەختەو دیوار بێ‌و سێبەری نەبێ، چ پەیكەرو سێبەرداربێ.

دووەم: وشەی (رسم) بەمانای هەرجۆرە خەت كێشانێك دێ، چ خەت‌و هێڵی سادە بێ، چ وێنەكێشان،بەڵام بەمەرجێك بەدەست بێ، جا چ بە فڵچە، یان تەباشیر، یان هەر ماددەو ئامرازێكی دیكە.

سـێیەم: وشەی (نَحَتَ) بەمانای داتاشینی شتێك دێ، وەك تەختەو دار، یان بەرد، گرنگ ئەوەیە ماددەیەكی وابێ، كە بگونجێ حاڵەتێكی بەرجەستەیی وەربگرێ، جا چ بتاشرێ، چ لە قاڵب بدرێ.

شایەنی باسیشە، كە لە قورئان‌و سوننەتدا زیاتر ماددەكانی وشــەی (تَصـویر) بەكارهاتوون، بۆ هەر جۆرە وێنە دروستكردنێك،كە بەدەست وێنە دەكێشرێ، جا چ پەیكەری سێبەردار بێ، چ تەنیا وێنەو نەخشی سەر كاغەزو لەوح‌و دیوارو بەرگ‌و پۆشاك بێت‌و سێبەری نەبێ.

ئاشكراشە، كە وێنەی بەئامێر دروستكراوی (فۆتۆگرافیی‌و ڤیدیۆیی) لــەكاتی دابەزینی شەریعەتدا نەبووەو دواتر داهێنراوە، لە ساڵی(١٨٣٩ز) لە لایەن (ولــیم هنری فۆكس)ی ئینگلزییەوەو، وشەی (فۆتۆگرافیی)یش لــە زمــانی یۆنــانی‌یــەوە هاتوەو لە هەردوو وشەی: (فۆتــۆس)و (گرافــۆ) پێكهــاتوە، كــە مانایــان ئاوایــە

(ڕووناکیی)، (من وێنە دەکێشم)، کە دیارە وێنەی فۆتۆگرافییش لە ئەنجامی بەهۆی تیشکەوە چەسپاندنی وێنەی شتێکەوە لەسەر شتێك، پەیدادەبێ[1].

ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ، کە ئێمە بۆیە هەرسێك وشەی:

(وێنەگرتن، وێنەکێشان، پەیکەرتاشین)مان بەکارهێناون، تاکو بتوانین تەعبیر لە هەموو ئەو وێنەو دیمەن دروستکردنانە بکەین،کە لەلایەن مرۆڤەوە پەیدا دەکرێن، چ بەدەست، چ بەئامێر، چ سێبەرداربێ، چ بێ سێبەر.

ئێمە وشەی (وێنەگرتن- تصویر) تەنیا بۆ ئەو وێنەو دیمەن دروستکردنە بەکاردێنین،کە بەئامێر دروست دەکرێن‌و بێ سێبەرن، واتە: فۆتۆگرافیی‌و سینەمایی.

وشەی (وێنەکێشان- رسم) تەنیا بۆئەو وێنە بەکاردێنین،کە بەدەست دروست دەکرێن‌و سێبەریان نیە.

وشەی (پەیکەرتاشین- نحت)یش تەنیا بۆئەو وێنە پەیکەریانە بەکاردێنین،کە بەدەست، یان ئامێر دروست دەکرێن، لە ماددەیەکی شیاو بۆ وەرگرتنی حاڵەتی بەرجەستەیی (مُجَسَّم).

هەڵبەتە ئەمەش وەك بەکارهێنانی ئێمەو، بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست‌و ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی شەریعەت - بە بۆچوونی بەندە - لە بەرامبەر هەرکام لەو سێ جۆرە وێنەو دیمەنانەدا،کە باسمان کردن،ئەگەرنا، وەك پێشتر باسمان کرد:

وشەی (تصْوير) لە بەکارهێنانی قورئان‌و سوننەتدا، هەرکام لەو سێ جۆرە وێنەو دیمەنە دەستکردانە دەگرێتەوە، بەلاّم چەمك‌و واتای باوی هەرکام لە: (تصوير و رَسْم و نَحْت) لەم ڕۆژگارەدا ئەوەیە،کە ئێمە بۆ هەر کامێکیانمان ڕوونکردەوەو، (مُصوِّر) بابایەکە،کە بە ئامێر وێنەی شتان دەگرێ‌و، (رَسّام)یش کەسێکە،کە بەدەست وێنەو دیمەنی شتان دەکێشێ بە ئارەزووی خۆی‌و،

---

١) بڕوانە: (الشريعة الأسلامية والفنون)، ص٦٧٠

(نَحّـات)یش کەسێکە،کە لە ماددەو کەرەسەیەکی ڕەق، یان شیاو بـۆ بەرجەستـە بوون، پەیکەران دروست دەکات.

ئێستاش، کە هەتا ڕاددەیەك چەمكو واتای ئەو سێ وشەیەمان بۆ ڕوونبـۆوە، دەچینە سەر باسی دووەمی ئەم بەشە:

## باسـی دووەم: چـەند دەقێکی قورئان و سوننـەت لەبارەی وێنە کێشـــان و پەیکـەرتاشـینەوە :

### یەکــەم: چـەند ئایەتێکـی قـورئان:

١- ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ فِى ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ ... ﴿٦﴾ آل عمران ﴾.

واتە: -خوا- ئەو کەسەیە،کە هەر چۆنێك بیەوێ، لەمنداڵدانانداا وێنـەتان دەکێشێ...

٢- ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٣﴾ التغابن ﴾.

واتە: -خوا- ئاسمانەکانو زەوی بەهەق دروستکردوونو وێنەتانی کێشاوە، چاك وێنـەکانتانی کێشاوە، گەڕانەوەش هەر بۆلای ویە.

٣-﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِى خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِىٓ أَىِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ الانفطار ﴾.

واتە: ئەی مرۆڤـ! چی تۆی لە پەروەردگاری بەخشندەت هەڵخەڵەتانـدوە؟! ئەوکەسەی،کە دروستی کردوویو ڕێکی خستوویو هاوسەنگی کـردووی، لــە هەر شێوەیەکدا،کە ویستوویەتی پێکیهێناوی!

٤- ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ... ﴿٢٤﴾ الحشر ﴾.

واتە: ئەو، خوایەکی بەدیهێنـەری پەیداکـەری وێنەکێشـە، تێکـڕای نـاوە هەرەچاکەکانی هەن...

٥- ﴿ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ الصافات ﴾.

واتە : - ئیبـڕاهیم- گوتی: ئایا ئەوە دەپەرستن،کە دەیتاشن! خوا خۆشتانی درووستکردوەو، ئەوەش کەدروستی دەکەن؟!

٦- ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ الأنبياء ﴾.

واتە: - بێگومـان ئێمە پێشتر سەر ڕاستیمان بـە ئیبـڕاهیمدابوو وە پێـی زانابووین. کاتێك بە بابیو گەلەکەی گوت: ئەو وێنە پەیکەرییانە چیـن،کە ئێوە خۆتان لەسەر (پەرستن)یان حەپس کردوە؟!

٧- ﴿ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ سبأ ﴾.

واتە: (شەیتانەکان) ئەوەی ویستبێی بۆ (سولەیمان)یان دروست دەکرد، لـە میحڕابەکانو پەیکەرەکانو دەفرەکان، وەك حەوزو مەنجەڵە چەسپاوەکان، ئەی نێـزیکانی داود! سوپاس ئەنجام بدەن، کەمێك لە بەندەکانم سوپاسگوزارن.

وشەی (محاریب) کۆی (میحراب)ە، کە دیارە چیـیەو، (تماثیـل)یـش کـۆی (تمثال)ە کە بە کوردی (پەیکەر)ە، واتـە: وێنەیەکی بەرجەسـتـە، (جفـان)یش کـۆی (جَفْنة)یە،کە بەو دەفرە زلە دەگوترێ چەند کەسێك تشریب، یان چێشتی دیکەی تێدا دەخۆنو، (قَصْعَة)شی پێدەگوترێ، (جَـواب)یـش حـەوزی ئـاوەو

(قدور)یش کۆی (قِدْر)ە، کە بەمانای مەنجەڵی چێشت تێدالێنانو گۆشت تێدا کوڵاندندا.

وەك بینیمان لەم حەوت دەقەی کتێبی خوادا، هەرکام لە وشەی (تصویر، نحت، تمثال) هاتوون:

أ- (صوَّرکم، یصوِّرکم، المصوِّر) واتە: وێنەتانی کێشا، وێنەتان دەکێشێ، وێنەکێش، کە هەرسێکیشیان بۆ خوای بەرزی بێ وێنە بەکارهێنراون، وێنەکێش (المصوِّر)یش یەکێکە لە ناوە هەرەچاکەکانی خوا -سبحانە وتعالی-.

ب- (تنحتون) واتە: دەتاشن، یان: دەکەنە پەیکەر، کە بۆ ئەو بتپەرستانە بەکارهاتوە،کە ئیبراهیم - سەلامی خوای لێ بێ- لەگەڵیان ڕووبەڕووبۆتەوەو بانگی کردوون بۆ خوا پەرستیی‌و خوا بەیەکگرتن (التوحید).

ج- (تماثیل) واتە: وێنە پەیکەرییەکان، کە مەبەست پێیان ئەو بتو صەنەمانەن،کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەیانپەرستن.

ئێستاش با لەوبارەوە، سەرنجێکی دەقەکانی سوننەتیش بدەین:

## دووەم : چەند دەقێکی سوننەت :

١- ((إنَّ أشدَّ الناس عذاباً یوم القیامة: المصوِّرون)) رواه البخاري ومسلم وأحمد والنسائي عن ابن مسعود ﷺ.

واتە: بێگومان وێنەکێشان لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا ،لە هەموو کەس لەلای خوا ئەشکەنجەیان سەختترە.

٢- ((ان الّذین یصنعون هذه الصُّور یُعَذّبون یوم القیامة، یُقال لهم: أَحْیُوا ما خَلَقْتُمْ)) متفق علیه عن ابن عمر رضي الله عنهما.

واتە: بەتەئکید ئەوانەی ئەم وێنانە دەکێشن، لە ڕۆژی قیامەتدا ئازار دەدرێن، پێیان دەگوترێ: ئەوەی دروستتان کردوە ژیانی بخەنەبەر.

٣- ((عن عائشة رضي الله عنها قالت: دَخَلَ عليَّ رسولُ الله ﷺ وأنا مُسْتَتِرَةٌ بِقِرامٍ فيه صورةٌ فتلَوَّن وجههُ، ثم تناول السِّتْرَ فهتكَهُ ثم قال: إنَّ من أشدِّ الناس عذاباً يوم القيامة الذين يُشبِّهون بخلق الله)) متفق عليه.

واتە: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لێم هاتە ژوور لەحاڵێکدا،کە پەردەیەکم هەڵواسیبوو وێنەی تێدابوو، ئیدی دەموچاوی گۆڕا، پاشان داهاتە پەردەکەو دڕاندی، ئنجا فەرمووی: لە ئازار سەختترینی خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانەن، کە شتێك دروست دەکەن وەك دروستکراوی خوا بچێ.

٤- ((عن أبي زرعة قال: دخلت مع أبي هريرة في دار مروان، فرأى فيها تصاوير، فقال: سمعت رسولَ الله ﷺ يقول: قال الله - عزّ وجلّ -: ومَن أظلم مِمَّنْ ذهبَ يخلق كخَلْقي! فَلْيخلقوا ذرةً، أو ليَخْلُقوا حَبَّةً، أو ليَخْلُقوا شعيرةً)) متفق عليه.

واتە: ئەبو زەرعە دەڵێ: لەگەڵ ئەبوو هورەیرە چوومە ماڵی مەڕوان-ی کوڕی حەکەم- چەند وێنەیەکی تێدا بینین، گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: خوا - عزّ وجلّ- فەرموویەتی: جا کێ لەو کەسە ستەمکارترە، کە دەچێ شتی وەك دروستکراوی من دروست دەکات! دەبا مێرووولەیەکی گچکە دروستبکەن! یان دەنکە گەنمێك دروست بکەن! یان با دەنکە جۆیەك دروست بکەن!، (واتە: ئەگەر ڕاست دەکەن لاسایی خوای بەدیهێنەر دەکەنەوە لە دروستکردندا).

٥- ((عن سعيد بن أبي الحسن قال: كنت عند ابن عباس إذْ أتاه رجلٌ فقال: يا أبا عباسٍ! إني إنسانٌ إنما معيشتي من صنعة يدي، وإنما أصنعُ هذه التصاوير! فقال ابن عباس: لا أُحدِّثُك الاّ ماسمعتُ رسول الله ﷺ، سَمِعته يقول: (مَنْ صوَّر صُورةً فأن الله مُعَذِّبُهُ حتى يَنْفَخَ فيها الروحَ ولَيْسَ بِنافخٍ فيها أبداً)، فَرَبا الرجلُ رَبْوَةً شديداً واصفَرَّ وجْهُهُ، فقال: ويحك إنْ أبيتَ الاّ أنْ تَصْنَع، فعليك بهذا الشجر، كلِّ شيءٍ ليْس فيه روحٌ)) متفق عليه.

واتە: سەعیدی کوڕی ئەبولحەسەن دەڵێ: لەلای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بووم، کە پیاوێك هاتە لای گوتی: ئەی ئەبو عەبباس! من،کەسێکم گوزەرانم بە پیشەی دەستمەوە بەندە، من ئەم وێنانە دروست دەکەم! عەبدوڵڵاش گوتی: تەنیا شتێکت لەبارەوە پێ دەڵێم، کە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستوە، گوێم لێی بوو دەیفەرموو: ( هەرکەسێك وێنەیەك بکێشێ، ئەوە خوا لەسەر ئەوە ئازاری دەدات ، هەتا ڕووحی بەبەردا دەکات، هەرگیزیش بۆی بەبەردا ناکرێ)، ئیدی کابرا، کە ئەوەی بیست زۆر پۆز (تووڕە)بوو،ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، ئەویش پێی گوت: بێبەڵابی! دە ئەگەر هەر سووری لەسەر دروستکردن، درەخت دروست بکە، هەرشتێك،کە ژیانی تێدانیە.

٦- ((عن عائشة رضي الله عنها أنه كان لها ثَوبٌ فيه تصاوير ممدودٌ الى سَهْوَة، فكان النبي ﷺ يصلِّي اليه، فقال: أخِّريه عَنِّي، قالت: فأخَّرتُهُ فَجَعلْتُهُ وَسائِدَ)) متفق عليه.

واتە: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- گێڕاویەتەوە،کە پۆشاکێکی هەبووە وێنەی تێدابوون‌و پێڕکێکی پێداپۆشیوە، پێغەمبەریش ﷺ ڕووەو ئەوێ نوێژی کردوە، جا فەرموویەتی: لێمی دوور بخەوە، دەڵێ: منیش لامداو کردمە -بەرگی- چەند سەرینێك.

وشەی (سَهْوَة)،کەمن بە (پێڕك) مانام کردوە، کە کاتی خۆی لەجیاتی دۆڵاب بەکاریان دەهێناو هەندێك،کەلوپەلی لەسەر دادەنراو، ئێستاش لە هەندێك گوندو لادێدا بەکاردێ، وێڕای ئەوە مانایەکی دیکەشی هەیە،کە بریتیە لەو نیوە دیوارەی،کە ژوورێکی گەورەی پێ دەکرێتە دووبەش، جا وادیارە دایکمان عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- ئەو بۆشاییەی سەر نیوە دیوارەکەی پێ داپۆشیوە، یان ئەو پێڕکەی،کەکەلوپەلی لەسەر دادەنرێ[1].

٧- ((عن عائشة أنَّ أُمَّ حَبيبة وأُمَّ سلمة رضي الله عنهنَّ جميعاً ذَكَرَتا كنيسةً رَأَيْنها بالحبشةِ فيها تصاوير، لرسول الله ﷺ، فقال: إنَّ أولئك اذا كان فيهم

١) بۆ مانای (سَهْوَة) بڕوانە: (المعجم الوسيط)، ص٤٥٩، كۆی (سَهْوَة)ش (سِهاءٌ)ە.

الرجل الصالح فماتَ بَنَوْا على قَبْرِهِ مَسْجِداً وَصَوَّروا فيه تلك الصُّور، أولئك شِرارُ الخلق عندالله يوم القيامة))، متفق عليه.

واتە: عائیشە دەگێڕێتەوە،کە ئومــمو حەبیبەو ئومــمو سەلەمە -خوا لێیان ڕازی بێ- باسی کڵێسەیەکیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە،کە لەحەبەشە دیتوویانە، وێنەی تێدابوونە، ئەویش فەرمووی: ئەوانە عادەتیان وابووە ،ئەگەر پیاوێکی باشیان لەنێودا بوویێو مردبێ، مزگەوتێکیان لەسەر گۆڕەکەی دروستکردوەو ئەو وێنانەیان تێدا کێشاون، ئەوانە خراپترین خەڵکن لەلای خوا لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا.

دیارە پێشتریش گوتمان،کە وشەی (صور و تصاوير) هەم وێنەی سەر پەردەو دەرو دیوارو، هەم وێنەی پەیکەرییش دەگرنەوەو بەپێی سیاقیش دەردەکەوێ کامیان مەبەستە.

٨- ((عن عائشة رضي الله عنها قالت: أنه عليه الصلاة والسلام خَرَجَ في غزاةٍ، قالت: فأخذتُ نَمطاً فَسَترتُهُ على الباب، فلما قدِمَ فرأى النَّمط فَجَذَبَهُ حتى هتكَهُ، ثم قال: إن الله لم يأمُرْنا أن نكسو الحجارة والطين، قالت: فقطعنا منه وِسادَتَيْنِ وَحَشوْتُهُما لِيفاً فلمْ يَعِبْ ذلك عليَّ)) متفق عليه.

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بۆ جەنگێك دەرچوو، دەڵێ: منیش پەردەیەکم هێنا دەرگاکەم پێ داپۆشی، کاتێك گەڕایەوەو پەردەکەی بینی ڕایکێشا،هەتا دڕاندی، ئنجا فەرمووی: بەتەئکید خوا فەرمانی پێنەکردووین،کە بەردو قوڕ داپۆشین! دەڵێ: دوایی دوو بەرگە

سەرینم لێ بڕین‌و پووشە دار خورمام تێكردن، ئیدی ئەوەی لێ بەڕەخنە نەگرتم.

(نَمَط)یش بە (پەردە)و بە (قوماشی) لە خوری چنراویی ڕەنگاو ڕەنگ دەگوترێ[1].

٩- ((عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان لنا سِتْرٌ فيه تِمْثالُ طائر، وكان الداخل اذا دَخَلَ استَقْبَلَهُ، فقال لي رسول الله ﷺ: حَوِّلي هذا فأني كلّما دَخَلْتُ فرأيته ذكرتُ الدنيا)) رواه مسلم.

واتە: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پەردەیەكمان هەبوو وێنەی باڵندەیەكی تێدابوو، بابای وەژوور كەوتوو، كە دەهاتە ژوور دەكەوتە بەرچاوی، جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ئەمە لابدە، چونكە هەرجارێك دێمە ژووری‌و دەیبینم دنیام دێتەوە یاد.

لەم فەرموودەیەشەوە دەزانین،كە وشەی (تِمْثال) هەرچەندە بەزۆریی بۆ وێنەی پەیكەریی بەكاردێ،بەڵام بۆ وێنەی سەر قوماش‌و پۆشاكیش بەكاردێ.

١٠- ((عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال: كان قِرامٌ لعائشة قد سَتَرَتْ به جانب بَيْتِها، فقال رسول الله ﷺ: أَميطي عَنَّا قِرامَكِ هذا، فأنه لاتزالُ تصاويرُهُ تَعرِضُ لي في صلاتي)) رواه أحمد.

واتە: عائیشە پەردەیەكی ڕەنگاو ڕەنگی هەبوو، لایەكی ژوورەكەی خۆی پێ داپۆشیبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم پەردەیەمان لەبەرچاو لابدە، چونكە بەردەوام وێنەكانی لە نوێژەكەمدا دێنە بەرچاوم.

١١- ((عن بِسْرِ بن سعيد عن زيد بن خالدٍ عن أبي طلحة الأنصاري أنه قال: إنَّ رسول الله ﷺ قال: "إن الملائكة لا تدخلُ بيْتاً فيه صورة"، قال بِسْرُ: ثم اشتكى زيدٌ بعد فَعُدناه فإذا على بابهِ سِترٌ فيه صورة، قال: فقلت لعبيدالله

[1] بڕوانە: (المعجم الوسيط)، وشەی (نَمَط).

الخولاني ربيبُ ميمونة زوج النبـي رضي الله عنها: ألم يُخْبِرُنا زيدٌ عن الصـور يوم الأول؟! فقال عُبَيدالله: أَلَـمْ تَسْـمَعْهُ حـين قـال: الاّ رَقْمـا في ثـوابٍ؟!)) رواه البخاري ومسلم وأبو داود.

واتە: بیسری کوڕی سەعید لە زەیدی کوڕی خالیدو ئەویش لە ئەبو طەڵحەی ئەنصارییەوە گێڕاویەتەوە، کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: "بێگومان فریشتە ناچنە ماڵێکەوە وێنەی تێدابێ"، بیسر دەڵێ: دوایی پاش ئەوە زەید نەخۆشکەوتو ئێمەش سەردانمان کرد، بینیمان پەردەیەکی وێنەدار لەسەر دەرگایەتی، دەڵێ: منیش بە عوبەیدوڵلای خەوەلانیی دەست پەروەردەی مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر -خوا لێی ڕازی بێ-م گوت: ئەدی زەید ئـەو ڕۆژەی پێشوو لەبارەی وێنانەوە هەواڵی پێنەداین؟! عوبەیدوڵلاش گوتی: ئەدی گوێت لێنەبوو گوتی: مەگەر نەخشو نیگاری پۆشاك؟!

وشەی (رَقْـم) هەرچەندە لە فەرهەنگەکانی زماندا زیـاتر بـەهێڵو نـەخشو نیشانە، لێکدراوەتەوە[1]، ،بەلاّم وەك لەسیاقی فەرمایشتەکەدا، دیارە لێرەدا مەبەست پێی وێنەو نەخشو نیگاری ژیاندارانە.

١٢- ((عن عبيدالله بن عبدالله بن عتبة بن مسعود أنه دَخَـلَ علـى أبـي طلحـة الأنصاري يَعودُهُ، قال: فَوَجَدَ عنده سهل بن حنيف، فـدعا أبـو طلحـة إنسـاناً فَنَزَعَ نَمَطاً مِنْ تَحْتِهِ، فقال لـه سَهْل بـن حنيـف: لِـمَ تَنْزَعُـهُ؟! قـال: لأن فيـه تصاوير، وقد قال فيها رسول الله ﷺ ما قد عَلِمتَ! فقال سَهْلٌ: ألم يَقُلْ رسول الله ﷺ: الاّ ما كان رقْماً في ثوبٍ؟! قال: بلى ولكِنَّهُ أطيبُ لنفسي)) رواه مالك والنسائي والترمذي وابن ماجه.

واتە: عوبەیدوڵلای کـوڕی عەبـدوڵلای کـوڕی عوتبـەی کـوڕی مەسـعوود دەگێڕێتەوە،کە چۆتە لای ئەبی طەڵحـەی ئەنصـاریی بـۆ لێپرسـینی بـەهۆی نەخۆشییەوە سەهلی کوڕی حەنیفی لەلابینی، ئنجا ئەبوطەڵحە کەسێکی بانگ

١) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن)، ص٣٢٦، (المعجم الوسيط) ص٣٦٦-٣٦٧.

کرد پەردەیەك - یان بەڕەیەك- کە لەژێریدا بوو لایبرد، سەهلی کوڕی حەنیفیش پێی گوت: بۆ لایدەبەی؟ گوتی: چونکە وێنەی تێدان، خۆیشت دەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ چی لەبارەیانەوە فەرمووە!، سەهلیش گوتی: ئەدی پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرموو: مەگەر نەخشو نیگاری سەرپۆشاك؟! گوتی: با،بەلاّم ئاوا ئاسوودەترم.

١٣- ((عن عائشة رضي الله عنها قالت: قَدِمَ رسول الله ﷺ من غزوة تبوك أو خَيْبَر وفي سَهْوَتها سِتْرٌ فَهَبَّتْ ريحٌ فكشفتْ ناحية السِّتْر عن بناتٍ لعائشة لُعَبٍ، فقال: ما هذا يا عائشة؟ قالت: بَناتي، ورأى بينهنَّ فَرَساً له جناحان من أرقاعٍ، فقال: ما هذا الذي أرى وَسَطَهُنَّ؟! قالت: فَرَسٌ، قال: وما هذا الذي عليه؟ قالت: جناحان، قال: فَرَسٌ له جناحان؟ قالت: أما سمعت أن لِسُلَيمان خيْلاً لها أجْنِحةٌ؟! قالت: فضحك حتى رأيتُ نَواجِذَهُ)) رواه إبو داواد.

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەجەنگی تەبووك، یان خەیبەر گەڕایەوەو لەسەر پێڕکەکەی پەردەیەك هەبوو، با هەڵیکردو لایەکی پەردەکەی هەڵدایەوەو چەند بووکەڵەیەك، کە عائیشە بۆ یاریی کردن کردبوونیە کچی خۆی، دەرکەوتن، ئەویش فەرمووی: ئەی عائیشە ئەمە چیە؟! گوتی: کچەکانمن، لەنێوەڕاستیاندا ئەسپێکی بینی دووباڵی بەپینە دروستکراوی هەبوون، فەرمووی: ئەدی ئەمە چییە لەنێویاندا دەیبینم؟ گوتی: ئەسپە، فەرمووی: ئەدی ئەمە چییە پێیەوەیە؟! گوتی: دووباڵن، فەرمووی: ئەسپ دووباڵی هەبن؟! گوتی: ئەدی نەتبیستوە،کە سولەیمان ئەسپی باڵداری هەبوو ون؟! دەڵێ: ئەویش پێکەنی، هەتا کەڵب (ناجِذ)ە کانیم بینی.

١٤- ((عن عائشة رضي الله عنها قالت: أن النبيَّ ﷺ كان يُقَرِّبُ اليَّ صواحبي يَلْعَبْنَ باللُّعَبِ)) رواه البخاري في الأدب المفرد و رواه أبوداود.

واتە: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستە خوشکەکانی دەهێنایە لام، بە بووکە شووشەکان گەمەیان دەکرد.

وشەی (لُعَب) کۆی (لُعْبَة)یەو ئـەمیش هەرشـتێکە،کە بـۆ گەمــەو یـاریی پێکردن بەکاربێت وەك زار (نَرْد)و شەترەنجو بووکە شووشە[1].

خوێنــەری بەڕێـز!

ئێستاش،کە زۆربەی ئەو دەقە شەرعییە سەرەکییانەمان هێنان، کـە لـەبارەی وێنەکێشانو پەیکەر تاشینەوە دەدوێن، بابچینە سەرباسی سێیەمو، بزانین لەبـەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا حـوکمی وێنەکێشـانو پەیکەرتاشـینو بـەکارهێنانی وێنەی کێشراوو پەیکەری تاشراو چۆنە؟!

## باسی سێیـەم: ئەنجامگیریی: حوکمـی وێنـەکێشـــان و پەیکـەرتاشین و بەکارهـێنانی وێنـەو پەیکـەر :

خوێنــەری خۆشەویسـت !

سەرەتا بەباشی دەزانم بۆ بەرچاو ڕوونبوونـەوەی زیـاترت، ئامـاژە بـەبیروڕای زانایان بکەین لەبارەی وێنەو پەیکەرەکانەوە:

زانایانی شەرعزان لە بەرانبەر مەسەلەی وێنەکێشان (تصویر)ەوە، بە هـەموو جۆرەکانییەوە - واتە: بە پەیکەریشەوە-، بوونەتە چوار بەشەوە:

یەکەم: بەشێکیان سەرجەم وێنەکان (الصُّور) بە ڕەواو، وێنەکێشانیش بەگشتیی بە حەڵاڵ دەزانن، بەمەرجێك بۆ پەرستنو بەگەورەو پیرۆز گیران (تعظیم وتقدیس)

---

١) بڕوانە: (المعجم الوسيط)، ص.٨٢٧

نەبێ، ئایەتی: ﴿ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ ...﴿١٣﴾ سبأ ﴾، بە بەڵگە دێننەوە[1].

یەکێك لە زانایانی دیارو بەرجەستەی هاوچەرخیش، کە ئەم ڕایەی هەیە: (الشیخ محمد رشید رضا)یە، کە لەوبارەوە گوتوویەتی: (... وقيل: إن المحرَّم هو مااتخِذَ بِهيئة التعظيم، وهذا أقوى الأقوال عندي)[2].

واتە: ... گوتراوە: قەدەغەکراو – لە وێنەو پەیکەران- ئەوەیە،کە بۆ بەگەورەگرتن بەکاربێ، ئەم ڕایەش، بەلامەوە بەهێزترین ڕایە.

یەکی دیکەش لە زانایانی دیاری هاوچەرخ، کە هەمان ڕای هەیە (د.محمد عمارة)یە، کە لەوبارەوە دەڵێ: (إذن فالسنَّة النبويَّة مثلها في ذلك مثل القرآن الكريم، لاتُحرِّمُ الصُّوَر والتماثيل على التعميم والاطلاق، وانما التحريم فيها كالتحريم في القرآن الكريم، خاص ورهن ومشروط بالمواطن التي تُصْبِحُ فيها الصور والتماثيل شِراكاً للشرك وحبالاً للوثنية وسُبُلاً لتعظيم غيرالله، أما اذا كانت للمنفعة وتجميل الحياة وزينتها المشروعة وتخليد القيم الفاضلة وتزكيتها وتنمية مشاعر الجمال الأنسانية، فأن موقف السنة النَّبَوية يُصبِحُ معها لاضِدَّها، لأنها بذلك تَنْتَقِلُ من الأمور الضارّة الى حيث تُصْبِحُ واحدة من نعم الله على الأنسان)[3].

واتە: ... کەواتە سوننەتی پێغەمبەریش لەوبارەوە وەك قورئانی بەڕێز وایە، بەگشتییو بەرەهایی، وێنەو پەیکەران قەدەغە ناکات، بەڵکو قەدەغەکرانی ئەو شتانە لە سوننەتیشدا وەك قەدەغەکرانی نێو قورئان تایبەتییەو پەیوەستە بەو

---

١) بڕوانە: (البحر المحيط) ج٧ ص٢٦٥، وە: (الأكليل في استنباط التنزيل) للسيوطي، ص١٨١، وە: (الجامع الأحكام القرآن) للقرطبي، ج١٤، ص٢٧٢، وە: (روح المعاني) للألوسي، ج٢٢، ص١١٠.
٢) بڕوانە (فتاوى محمد رشيد رضا)، ج٣ص ١٠٦.
١) بڕوانە: (الأسلام والفنون الجميلة)، ص١٢٦.

حاڵەتانەوە،کەوێنەو پەیکەرەکان دەبنە تەڵەی شیرك‌و داوی بت پەرستیی‌و ڕێچکەی بەگەورەگرتنی غەیری خوا، ،ئەگەرنا،ئەگەر بۆسوودو جوانکردنی ژیان‌و ڕازاندنەوەی شەرعییانەی بێ و، بۆ هێشتنەوەی بەها بەرزەکان‌و برەو پێدانیان‌و گەشەپێدانی هەست‌و نەستە جوانەکانی مرۆڤایەتی بێ، ئەوە هەڵوێستی سوننەتی پێغەمبەر، نەك هەردژی نابێ، بەڵکو پشتگیریشی دەکات، چونکە بەو مەرجانەوە لە حاڵەتی زیانبەخش بوونەوە دەگۆڕێ بۆئەوە،کەببێتە یەکێك لە نیعمەت‌و چاکەکانی خوا بەسەر مرۆڤەوە.

دووەم: بەشێکیشیان ڕاست بەپێچەوانەی ئەوانەی پێشوەوەیە، هەموو جۆرە وێنەکان‌و وێنەکێشان بەگشتی بە قەدەغە دەزانن، چ پەیکەری سێبەردار چ وێنەی بێ سێبەر، چ ژیاندارو چ بێ ژیان، کە یەکێك لە زانایانی هەڵگری ئەو ڕایە (موجاهد)ی قوتابی (إبن عبّاس)ە -خوا لێیان ڕازی بێت-، ئەوەندە هەیە بۆ دارودرەخت تایبەتی کردوە بەهی بەردار (مُثْمِر)ەوە، هەروەها (قرطبي)و هەندێك حەنبەلییەکانیش ئەم ڕایەیان هەیە[1].

ئەوانیش چەندبەڵگەیەك بۆ ئیسپاتی ڕاستی ڕایەکەیان دێننەوە، کە یەکێکیان ئەم فەرموودەیە: ((عن أبي هريرة رضي الله عنه أنَّ رسول الله ﷺ قال: قال الله - عزّو جلّ-: ومن أظْلَمُ مَن ذهب يخلق كخلقي! فليخلقوا ذرة أو لِيَخْلُقوا حبّةً أو لِيَخْلُقوا شعيرةً)) متفق عليه، کە پێشتر مانامان کردوە.

سێیەم: بەشێکیشیان،کە زۆرێك لە توێژەرەوەو فەرموودەناس‌و شەرعزانانیان لەنێودان، ڕایان وایە،کە تەنیا وێنەکێشانی گیاندارو ژیانداران قەدەغەیە، جا چ وێنەی سێبەردار بێ، چ بێ سێبەر، ،بەڵام غەیری ژیانداران ڕەوایە وێنەی بکێشرێ‌و وێنەکانیشیان بەکاربهێنرێن.

---

١) بڕوانە: (الجامع الأحكام القرآن) للقرطبي، ج١٣ ص٢٢٢، وە: (شرح صحيح مسلم) للنووي، ج١٤، ص٩١، وە: (فتح الباري)، ج١٠، ص٣٩٥.

(نووي)،كەیەكێكە لەو زانایانەی ڕایان وایە، لەوبارەوە گوتوویەتی[١] :

(قال أصحابُنا وغيرهم من العلماء: تصوير صورة الحيوان حرامٌ شديد التحريم ... ولا فرق في هذا كلّه بين ما لَهُ ظِلٌّ وما لا ظِلَّ لَهُ، هذا تلخيص مذهبنا في المسألة وَبِمعْناه قال جماهير العلماء من الصحابة والتابعين ومَن بعدهم وهو مذهب الثوري ومالك وأبي حنيفة وغيرهم).

واتە: هاوەلآنمان (مەبەستی پێ زانایانی شافیعی مەزهەبە)و زانایانی دیكەش گووتویانە: وێنەكێشانی ژیاندار زۆر قەدەغەیە... لەوەشدا جیاوازیی لەنێوان سێبەردارو، بێ سێبەر نیە، ئەمە پوختەی مەزهەبی ئێمەیە لەو مەسەلەیەداو، جەماوەری زانایانیش لە هاوەڵانو شوێنكەوتوانو، ئەوانەی دوای وانیش هەمان ڕایان هەیە، هەروەها ئەمە مەزهەبی ثەوریی‌و مالیك‌و ئەبوحەنیفەو غەیری وانیشە.

دیارە ئەمانیش زۆر فەرموودان لەوبارەوە بەبەڵگە دێننەوە لەوانەی،كە لە باسی دووەمدا هێنامانانن، كە ئەمەش یەكی دیكەیە لەوجۆرە فەرموودانەو لێرەدا وەك نموونەیەك دەیهێنینەوە:

((عن عائشة رضي الله عنها قالت: قَدِمَ رسول الله ﷺ من سفر وقد سَتَرْتُ على بابي درنوكاً فيه الخَيْلُ ذوات الأجْنِحَة فأمرني فَنَزعْتُهُ)) متفق عليه.

واتە: عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەرێك هاتەوەو، منیش قوماشێكی ئەستوورم بەسەر دەرگاكەمدا دابوو، كە وێنەی ئەسپانی باڵداری تێدابوو، ئەویش فەرمانی پێكردم‌و منیش لام برد.

(الدرنوك)یش بەم جۆرە پێناسە كراوە[٢] : (هو ثوب غليظ إذافُرِشَ بِساط وإذا عُلِّق فهوسِتْرٌ) واتە: جۆرە قوماشێكی ئەستوورە ،ئەگەر ڕاخرا بەڕەیەو ،ئەگەر هەڵیش واسرا پەردەیە.

---

١) بڕوانە: (شرح صحيح مسلم)، ج١٤، ص٨١.

٢) بڕوانە: (الشريعة الأسلامية والفنون)، ص٩٢.

چـــوارەم: بەشێکیشـیان،کە هـەم ژمارەیـەك لـە زانایـانی پێشـینو، هـەم هـی هاوچەرخیشیان تێدان، ڕایان وایە،کە تەنیا وێنەی ژیانداران (أحياء) قەدەغەیە، ئەویش، ئەگەر بەرجەستەو سێبەردار بێت، ،ئەگەرنا وێنەکانی دیکە -واتە: هی بێژیان هەموو جۆرەکانیو هی ژیاندارانیش، ئەگەر سێبەری نەبێ- هەموویان ڕەوا (مُباح)ن.

(نووي) لەوبارەوە گوتوویەتی[1]: (وقال بعض السَلف: إنّما ينهى عما كان له ظلٌ ولابأس بالصورة التي ليس لها ظل... وهذا مذهب القاسم بن محمد).

واتە: هەندێك لە زانایانی پێشین گوتوویانە: تەنیا ئەوجۆرە وێنەیـە قەدەغـە دەکرێ، کە سێبەری هەبێ، ،بەڵام ئەو وێنەیەی سێبەری نـەبێ قـەیناکات... ئەمـەش ڕای قاسـمی کوڕی موحەمــمەدە.

یەکێك لە زانایانی هاوچەرخیش، کە ئەم ڕایەی هەیە (عبدالرحمن الجزيري)یـە خاوەنی کتێبی: (الفقه على المذاهب الأربعة) وەك لەوبارەوە گوتوویەتی[2]: (إنّمـا يحرم التصوير بشروط أربعة: أن تكون الصورة لِحَيَوانٍ، وأن تكون مُجَسَّدةً، كاملـة الأعضاء، وأن يكون لها ظلٌ).

واتە: وێنـەکێشـان بە چوار مـەرجان قەدەغـەیە:

کە هی ژیاندار بێ، بەرجەستەکراو بێو، ئەندامـەکانی تـەواو بـنو، سـێبەری هەبێ، دیارە ئەمـانیش چەند فەرموودەیەك بە بەڵگە دێننەوە،کە دوانیان ئەو دوو فەرمایشتەن،کە: (بِسْر بن سعيد عن يزيد بن خالـد)و (عُبيـدالله بـن عبـدالله بـن عتبـة بـن مسـعود) دەیانگێڕنەوە،کـە لـە باسـی دووەمدا بـە ژمـارە (١١،١٢) هێناومانو ماناشمان کردوون، لە هەردووکیاندا ڕستەی (إلاّ رقْماً في ثَوْبٍ) هاتوە.

ئنجا وەك پێشتریش گوتمان: وشەی (رَقْـم) وێڕای نەخشو نیگار، مانـای وێنـە

---

١) بڕوانە: (شرح صحيح مسلم)، ج١٤، ص٨٢.

٢) بڕوانە: ج٢، ص٤٠.

(صورة)ش دەگەیەنێ، وەك (إبن حجرالعسقلاني) گوتوویەتی[1]: (قال النووي: بأن المُراد بإستثناء الرَّقْمْ في الثوب ماكانت الصورة فيه من غير ذوات الأرواح... وقال

ابن العربي: حاصل مافي اتّخاذ الصُّوَرِ: أنّها إنْ كانت ذات آجْسام حَرُمَ بالأجماع وإن كانت رَقْماً فأربعة أقوالٍ).

واتە: نەوەوی گوتوویەتی: کە مەبەست لە هەڵاواردنی نەخش‌و نیگاری قوماش ئەوەیە،کە وێنەکە هی گیانداران نەبێ... ئیبنولعەرەبیش گوتوویەتی: کورتەی قسان لەبارەی هەڵگرتنی وێنانەوە ئەوەیە،کە: ئەگەر پەیکەریی بن، ئەوە بە کۆڕا قەدەغەیە،بەڵام ئەگەر لەسەر پۆشاك دروستکرابێ، ئەوە چوار قسەی لەبارەوە هەن.

وەك دەبینین قسەکەی هەرکام لە (نووي)و، (إبن العربي)،کە(إبن حجر) لێیانەوە نەقلْ دەکات، خوا لە هەموو لایەکیان خۆشبێ، بەزەقی لێی دەفامرێتەوە،کە وشەی ( رَقْمْ) هەم مانای نەخش‌و نیگارو هەم وێنەی ژیاندارانیش دەگەیەنێ.

شایانی باسیشە من بۆیە هەرکام لەوشەی (ژیانداران)و (گیانداران) بەکاردێنم، چونکە مەبەستم لە (گیانداران) مرۆڤ‌و هەر دروستکراوێکی دیکەی خوایە،کە گیان (روح)ی هەبێ‌و، مەبەستیشم لە ژیانداران (حیوانات) هەموو ئەو ئاژەڵ‌و پەلەوەرو زیندەوەرانەن، کە لەسەر زەوی دەژین، بەکورتی: من پێم وایە ،جگە لە مرۆڤ هیچ شتێکی دیکە لە ژیانداران، گیان (روح)ی نیەو (رووح) تایبەتە بە مرۆڤەوە، بۆیە وشەی ژیانداران (أحیاء) مرۆڤیش دەگرێتەوە، چونکە مرۆڤ وێڕای گیان، ژیان (حیاة)یشی هەیە، ،بەڵام گیاندار(ذو روح)بەس مرۆڤە، بۆ فریشتەو جند (الملائکة والجن)یش، هەر چەندە دەگونجێ وەك مرۆڤ (روح)یان هەبێ،بەڵام دڵنیانیم، چونکە بەپێی شارەزاییم لەقورئان‌و سوننەت، ئەو مەسەلەیە بەتەواوی نوختەی نەخراوەتە سەر پیت‌و ئەوەی،کە دەتوانین بە دڵنیاییەوە لەوبارەوە بیلێین،

---

١) بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري)، ج١٠، ص٣٩١.

هەر ئەوەیە،کە هەرکام لە فریشتەو جند جۆرە ژیان (حیاة)ێکی تایبەتو جیا لەوەی ئێمەیان هەیە.

خوێنەری بەڕێز!

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە،کە ڕای خۆمو ئەوەی بەڕاست، یان بەڕاستری دەزانم، لەبارەی وێنە کێشانەوە بەهەردوو جۆری سێبەردارو بێ سێبەرەوە بخەمەڕوو:

## ڕاو بۆچوونم لەبارەی وێنە کێشانەوە :

پاش سەرنجدانی ئایەتەکانی قورئانو سوننەتو، قسەو بیروڕای زانایانی پێشینو هاوچەرخ گەیشتمە ئەو قەناعەتەی، کە لەم چەند خاڵەدا بەگوشراویی دەیخەمەڕوو:

**یەکەم: هەر جۆرە وێنەیەك مەبەست پێی پەرستنو بەبەرزو پیرۆزگرتن بێ، چ هی ژیانداران بێ، چ هی بێ ژیانو، سێبەرداربێ یان بێ سێبەر، دروست کردنو هەڵگرتنی قەدەغەیە:**

بەڵگەشمان لەوبارەوە زۆرن، بۆ نموونە:

١- (إبن عبّاس) خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، وەك (بخاري) هێناویەتی[1] پاش ئەوەی ڕوونی دەکاتەوە،کە بتو صەنەمەکانی گەلی (نوح) علیە السلام، وەك: (ودّ، سواع، یغوث، یعوق، نسر)،کەلە ئایەتی ژمارە (٢٣)ی سوورەتی (نوح)دا باسکراون، لەنێو گەلی عەرەبدا پەرستراون،ناوی هەرکام لەو تیرانە دێنێ، کە هەرکام لەو بتانەیان پەرستوە، دەڵێ:

---

١) بڕوانە: (صحيح البخاري)، برقم ٤٩٢٠، وە بڕوانە: (المصباح المُنير في تهذيب تفسير ابن كثير) ص١٤٤٧، ١٤٤٨.

( أسماءُ رجالٍ صالحين من قومِ نوحٍ، فلما هلكوا، أوحى الشيطان الى قومهم أن أنْصِبوا الى مجالِسهم، التي كانوا يجلسون، أنْصاباً وسمُّوها بأسمائهم، ففعلوا فَلَمْ تُعْبَدْ، حتى إذا هلك أولئِك وَتنسَّخ العِلمُ عُبِدَتْ).

واته: ئەو ناوانە هی پیاوانێکی باش بوون لەگەلی نووح، جا کاتێك مردن، شەیطان خوتخوتەی بۆ گەلەکەیان کرد، کە سەرو پەیکەریان بەناوەوە دروستبکەن‌و لەوشوێنانەدا،کە تێیاندا دادەنیشتن، دایانبنێن، ئەوانیش وایانکردو لەسەرەتاوە نەپەرستران، ،بەلاّم دوای ئەوەی ئەوانەی پێشوو نەمان‌و زانیاریی (واتە زانیاریی وەحی) لەبیرچۆوە، پەرستران.

٢- ((عن عائشه رضي الله عنها قالت: لما اشتكى النبيُّ ﷺ ذكر بعض نِسائِه كنيسةً يقالُ لها (مارية)، وكانت أُمُّ سلمة وأُمُّ حبيبة أتَتا أرضَ الحَبَشة، فذكرتا من حُسْنها وتصاوير فيها، فرفع رأسه، فقال: أولئك اذا مات فيهم الرجل الصالح بَنوا على قَبره مَسْجداً، ثم صوَّروا فيه تلك الصور أولئك شِرارُ خلق الله)) متفق عليه.

کە پێشتر بە بێژە (لفظ)یەکی دیکە لە ژمارە (٧)ی باسی دووەمدا هێناومانەو ماناشمان کردوە.

٣- (نووي) لە شەرحی فەرموودەی: ((إنَّ أشدَّ الناس عذاباً يوم القيامة: المصوِّرون)) متفق عليه، دا گوتوویەتی[1]:

(قيل هي محمولة على مَنْ فعل الصورة لِتُعْبَدَ وهو صانعُ الأصنام ونحوها، فهذا كافرٌ وهو أشدُّ عذاباً) واتە: گوتراوە: ئەمە مەبەست پێی کەسێکە،کە وێنە دروست دەکات،تاکو بپەرستریّ، کە بریتیە لەو کەسەی بت‌و شتی وا دروست دەکات، کە دیارە ئەوە کافرەو سەختترین سزای هەیە.

ئاشکراشە، کە ئەو شەرح‌و لێکدانەوەیەی،کە (نەوەوی) بە گوترا (قیل) هێناویەتی، زۆر بەهێزو ڕاستەو قیلێکی وەك فیلە! چونکە بەپێی پێوەرو

١) بڕوانە: (شرح صحيح مسلم)، ج١٤، ص٩١.

تەرازووی دادگەرانەی عەقڵ‌و نەقڵ‌و بەپێی ڕیز بەندیی (ترتیب)ی ئامانجە شەرعییەکان (المقاصد الشرعیة) ناگونجێ وێنەکێشێکی سادە، سزاو تۆڵەی لە هی کافرو مونافیق‌و کوژەرو زیناکەرو...هتد، سەختتر بێت!

٤- ئاشکرایە،کە پەرستن‌و بە بەرزو پیرۆزگرتنی غەیری خوا -وەك خوا (عزّ وجلّ)- شیرك‌و بتپەرستییە، جا ئەو غەیرە هەرچی‌یەك بێ‌و لە هەر قاڵب‌و شێوەیەکدابێ، وەك خوای بەرزو بێ‌وێنە فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ... ﴿٦٤﴾ آل عمران﴾، واتە: بڵێ: ئەی خاوەن کتێبەکان، وەرن بۆ شتێك،کە ئێمەو ئێوە تێیدا یەکسانین: کە جگە لە خوا نەپەرستین‌و، هیچ شتێك نەکەینە هاوبەشی‌و هەندێکمان هەندێکمان لەجیاتی خوا نەکەینە پەروەردگارو سەروەر...

شایانی باسیشە:

بۆیە گوتوومانە: هەر وێنەیەك،کە مەبەست پێی پەرستن‌و بەرزو گەورە گرتن بێ، قەدەغەیە، جا چ سێبەرداربێ، چ بێ سێبەرو، چ هی ژیاندار بێ، چ بێ ژیان، چونکە:

أ- بتپەرستەکان تەنیا وێنەو پەیکەری ژیاندارانیان نەپەرستوە، بەڵکو هی زۆر شتی دیکەیان پەرستوەو، ئێستاش دەپەرستن، وەك: خۆرو مانگ‌و ئەستێرەو درەخت‌و...هتد، خوای پەنهانبینیش فەرموویەتی: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فصلت﴾.

واتە: لە نیشانەکانی خوا، شەو و ڕۆژو خۆرو مانگن، دەجا سەجدە بۆ خۆرو مانگ مەبەن، سەجدە بۆ ئەو خوایە بەرن،کە دروستی کردوون،ئەگەر دەتانەوێ ئەو بپەرستن.

ب- پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کەلوپەلێك وێنەی خاچ (صلیب)ی لەسەر بوایە، لە ماڵەکەیدا دەیکرِاندو لایدەبرد، وەك عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- گێڕاویەتەوە: ((أنَّ النبيَّ ﷺ لم يكن يترك في بيته شيئاً فيه تصاليبُ الاّ نَقَضَهُ)) رواه البخاري.

واتە: پێغەمبەر ﷺ هەرشتێك لەماڵەکەیدا وێنەی خاچی لەسەر بوایە لێی لادەبرد.

## دووەم: هەر وێنەیەك مەبەست پێی: شتی وەك هی خوا دروستکردن بێ دروستکردن و بەکارهێنانی قەدەغەیە:

بەڵگەش لەسەر ئەوە،کە هەر وێنەیەك - هەر جۆرو شێوەیەکی هەبێ- هاندەرو ئامانجی دروستکرانەکەی لاساییکردنەوەی خوا - عزّ وجلّ - بێ، لە شت دروستکردندا، هەم دروستکردنیو هەم بەکارهێنانیشی حەرامە، ڕواڵەتی چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەرە ﷺ، بۆ نموونە:

١- ئەو فەرموودەیەی،کە لە ژمارە (٣)ی باسی دووەمدا هێنامانو ماناشمان کرد، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّ من أشدِّ الناس عذاباً يوم القيامة: الذين يُشبِّهون بخلق الله)) متفق عليه، لە ڕیوایەتێکی دیکەی (بخاري و مسلم)دا لەجیاتی ڕستەی: (الذين يُشبِّهون بخلق الله)، (الذين يضاهون بخلق الله) هاتوە، کە هەمان واتا دەگەیەنێ، واتە: دروستکردنی شتی وەك هی خوا - عزّ وجل -.

٢- ئەو فەرموودەیەی،کە لەژمارە (٤)ی باسی دووەمدا هێنامانو ماناشمان کرد، کە پێغەمبەر ﷺ لەخوای بەرزو مەزنەوە دەگێڕێتەوە،کە فەرموویەتی: ((ومن أظلم مَن ذهب يخلق كخلقي! فليخلقوا ذرة، أو لِيَخْلُقوا حبّةَ، أو لِيَخْلُقوا شعيرةً)) متفق عليه.

٣- ئەو فەرموودەیەی،کە لە ژمارە (٥)ی باسی دووەمدا هێنامانو ماناشمان کرد، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ صوَّر صُورةً فإن الله مُعَذِّبُهُ حتى يَنْفَخَ فيها الروحَ ولَيْسَ بِنافخٍ فيها أبداً)) متفق عليه.

دیارە دەلالەتی هەرکام لەم سێ فەرمایشتەش لەسەر ئەوە،کە گوتمان، لەوە ڕوونترە، کە پێویستی بە ڕوونکردنەوەبێ!

## سێیەم: وێنەی ژیانداران (أحياء)،کەلەسەر بەرگو پۆشاكو پەردەو سەرینو ڕایەخو قاپو قاچاغ دروست دەکرێ، مەگەر لەبەر زێدەڕۆیی، ئەگەرنا قەدەغە نیە:

بەڵگەی ئەوەش، کە وێنەی سەرشمەكو كەلو پەلی بەکارهێنراو، مەگەر لەڕووی زێدەڕۆیی (إسراف) تێدا کرانەوە،ئەگەرنا ڕەوایەو قەدەغەنیە، واتە: نە وێنە دروستکردنەکە قەدەغەیەو، نەبەکارهێنانی كەلو پەلە وێنەدارەکانیش، ئەم فەرموودانەن:

١- ((عن عائشة رضي الله عنها أنه كان لها ثوبٌ فيه تصاوير ممدودٌ الى سَهْوة، فكان النبي ﷺ يصلِّي اليه، فقال: أخِّريه عَنِّي، قالت: فأخَّرتُهُ فَجَعلْتُهُ وَسائِدَ)) متفق عليه. کە پێشتر لە باسی دووەمدا بەژمارە (٦) هێناومانەو ماناشمان کردوە.

٢- ((عن عائشة رضي الله عنها قالت: أنه عليه الصلاة والسلام خَرَجَ في غزاةٍ، قالت: فأخذتُ نَمَطاً فَسَترتُهُ على الباب، فلما قدِمَ فرأى النَّمط فَجَذَبَهُ حتى هتكَهُ، ثم قال: إن الله لم يأمُرْنا أن نكسو الحجارة والطين، قالت: فقطعنا منه

وِسادَتَيْنِ وَحَشوْتُهُما لِيفاً فلمْ يَعِبْ ذلك عليٌّ)) متفق عليه، کە لە باسی دووەمدا بەژمارە (٨) هێناومانەو ماناشمان کردوە.

٣- ((عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان لنا سِتْرٌ فيه تِمْثالُ طائرٍ، وكان الداخل اذا دَخَلَ استَقْبَلَهُ، فقال لي رسول الله ﷺ: حَوِّلي هذا فأني كلّما دَخَلْتُ فرأيته ذكرتُ الدنيا)). رواه مسلم، کە لە باسی دووەمدا بەژمارە (٩) هێناومانەو ڕاڤەشمان کردوە.

٤- ((عن أنس بن مالك ﷺ قال: كان قِرامٌ لعائيشة قد سَتَرَتْ به جانب بَيْتِها، فقال رسول الله ﷺ: أَميطي عَنَّا قِرامكِ هذا، فأنه لاتزالُ تصاويرُهُ تَعرِضُ لي في صلاتي)) رواه أحمد.
کە لە باسی دووەمدا بە ژمارە (١٠) هێناومانەو ڕاڤەشمان کردوە.

٥- ئەو دەقەی،کە (بخاري ومسلم وأبو داود) لە (بِسْر بن سعيد...)وە هێناومانەو لە باسی دووەمدا بەژمارە (١١) هێناومانەو ماناشمان کردوە.

لەم پێنج فەرموودەیەو هاووێنەکانیشیانەوە لەبارەی ئەو بابەتەوە،کە خەریکی قسە لێوەکردنینی ئەم سێ ڕاستییەمان دەستگیر دەبن:

یەك: بە بەڵگەی ئەوە،کە پێغەمبەر ﷺ بەس فەرمانی کردوە بە لادران و دوور خستنەوەی ئەو پەردانە، کە وێنەیان تێدابوونە، بەپاساوی ئەوە،کە دنیای دەخەنە بیرو سەرقاڵی دەکەن، یان لەکاتی نوێژدا دێنە بەرچاوی، کەواتە: هەبوونی ئەو پەردە وێنەدارانە قەدەغەنیە، ،ئەگەرنا بەڕاشکاویی دەیفەرموو: قەدەغەیە.

دیارە هەرکام لە ڕستەکانی: (أَخِّريه عَنّي)و (حَوِّلي هذا)و (أَميطي عَنَّا قِرامكِ)،کەلە فەرموودەکانی یەکەم و سێیەم و چوارەمدا هاتوون، مانایان لەیەك نێزیکە.

دوو: بەبەڵگەی ڕستەی: (إن الله لم يأمُرْنا أن نكسو الحجارة والطِّين)،کەلە فەرموودەی دوومدا - بەپێی ڕیزبەندیی ئەم باسە - هاتوە، بۆمان دەردەکەوێ، کە هۆکارێکی دیکەی ناڕازیی بوونی پێغەمبەر ﷺ لە هەڵواسرانی ئەو پەردە وێنەدارو بە نەخش‌و نیگارانە، ئەوەبووە،کە بەزێدەڕۆیی (إسراف) زانیوە.

سێ: بە بەڵگەی قسەی عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ -: (فأخَّرته فجعلتُهُ وسائد)وە: (فَقَطَعْنا منه وِسادتين وحشوتُهما لِيفاً فَلَمْ يَعِبْ ذلك عَليَّ)، هەرکات پەردەی وێنەدار کرا بە بەرگی سەرین‌و پشتیی‌وکەل‌وپەلی بەکارهاتووی نێوماڵ، ئەوە ئەو ئەندازە ناپەسندیی (کراهية)یەش، کە هەیەتی نایمێنێ.

ئنجا قسەکەی (أبو طلحة)ش - خوا لێی ڕازی بێ- لە وەڵامی پرسیارەکەی (سهل بن حنيف)دا،کە پێی دەڵێ: ئەدی پێغەمبەر ﷺ نەیفەرمووە: (الاّ ما كان رَقماً في ثوبٍ؟!) واتە: مەگەر وێنەکە نەخشی سەر پۆشاک‌و قوماش بێ، ئەوکاتە قەیناکات؟! (بلى ولكنّه أطيبُ لِنَفسي) واتە: با،بەلاّم ئاوا دڵم ئاسوودەترە، بەڵێ ئەم قسەیەی ئەو هاوەڵە بەڕێزەش، هەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئێمە دەیڵێین: چونکە ئەویش نکوولێی لەوە ناکات، کە وێنەی سەر پۆشاك ڕێ پێدراوەو ئیشکالی تێدا نیە، بەڵکو دەڵێ: ئاوا دڵم موڕتاح ترە!

ئنجا حیکمەتی ئەوەش، کە هەرکات قوماش‌و چنراوی وێنەدار کرایە،کەل‌وپەل‌و شمەك، هیچ ئیشکالی تێدا نامێنێ، ئەوەیە،کە لەوحاڵەتەدا:

أ: بەهۆی بەکارهێنران‌و کەوتنە بەردەست‌و پێی ئەو کەل‌وپەل‌و شمەکانەوە، وێنە کێشراوەکانی سەریان لەئەگەری پەرستران‌و بەگەورەو بەرزو پیرۆز ڕاگیران دوور دەکەونەوە، بەزاراوی شەرعزانان (فقهاء)، بێ ڕێز (مُمتهن) دەبن!

ب: بەهۆی سوود لێوەرگیرانی ئەو جۆرە پۆشاك‌و قوماشانەوە بۆ کەل‌وپەلی پێویستی نێوماڵ،ئەگەری زێدەڕۆیی (إسراف)یش دوور دەکەوێتەوە.

جا لێرەدا ڕەنگە یەکێك ئەم فەرمایشتە بە بەڵگەی ڕای دژی ڕایەکەی ئێمە بێنێتەوە:

((عن عائشة رضي الله عنها قالت: دَخَلَ عليَّ رسولُ الله ﷺ وأنا مُسْتَتِرَةٌ بِقِرامٍ فيه صورةٌ فتلَوَّن وجههُ، ثم تناول السِّتْرَ فهتكَهُ ثم قال: إنَّ من أشدِّ الناس عذاباً يوم القيامة الذين يُشبِّهون بخلق الله)) متفق عليه.

کە لە باسی دووەمدا بە ژمارە (٣) هێناومانەو ڕاڤەشمان کردوە، ،بەلاّم لەڕاستیدا ئەو جۆرە بە بەڵگە هێنانەوەیە هەڵەیە، چونکە:

بەپێی ڕستەی: ((إنَّ من أشدِّ الناس عذاباً يوم القيامة: الذين يُشبِّهون بخلق الله)) وا دیارە ئەو وێنەیەی لەسەر ئەو پەردەیە بووە شیرك‌و بەگەورەو بەرزو پیرۆز گرتنی غەیری خوای - سبحانه وتعالى- لێ فامراوەتەوە، چونکە بۆ فەرمان کردن بەلادان‌و دوور خستنەوەی پەردەکانی دیکە، ئەو ڕستەیەی نە فەرمووە، بەڵکو، یان فەرموویەتی: دنیام دێننە یاد ((...فإني كلّما دَخَلْتُ فرأيته ذكرتُ الدنيا))- فەرموودەی ژمارە (٩)-.

یان فەرموویەتی: وێنەکانی لەکاتی نوێژدا دێنە بەرچاوم: ((...فأنه لاتزالُ تصاويرُهُ تَعرِضُ لي في صلاتي))- فەرموودەی ژمارە (١٠)-.

یان فەرموویەتی: فەرمانمان پێنەکراوە،کە بەردو قوڕ بپۆشین: ((..إن الله لم يأمُرْنا أن نكسوالحجارة والطين..)) -فەرموودەی ژمارە (٨)-.

هیچ گومانیشی تێدانیە،کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەپێی پێویست قسەی فەرمووەو، بۆ هەر حاڵەتە تەعبیرو وشەی پڕ بەپێستی بەکارهێناوە.

## چوارەم: ئەو بووکەشووشەو کەل‌وپەلانەی منداڵان گەمەو یارییان پێدەکەن،ئەگەر وێنەو پەیکەری مرۆڤ و ژیاندارانیش بن، هەر دروست‌و ڕەوان:

بە بەڵگەی هەرکام لەو دوو فەرمایشتەی،کە لە (عائيشة)ەوە - خوا لێی ڕازی بێ - هاتوون، کە یەکەمیان (أبو داود)و دووەمیشیان (بخاري في الأدب

المفـرد)و (أبو داود) گێڕاویانەتەوەو، لە باسی دووەمدا بـە ژمـارە (١٣و ١٤) هێناومانن‌و ماناشمان کردن.

شایانی باسیشە، کە زانایانیش لەسەر ئەو مەسەلەیە یەکـدەنگن، ئەوەنـدە هەیە هەنـدێکیان چـەند شـتێکیان بەمــەرج گرتوە،بـەلاّم بەڕاسـتی بەمــەرج گرتنەکەیان هیچ بەلگەیەکی لەسەر نیە، مادام لە فەرمایشتەکاندا بەگشتیی‌و بەڕەهایی باسکراوە[1].

**پێنجەم: مادام وێنە کێشان لەبابەتی هەڵس‌وکەوتەکان (المعاملات)ەو ئەمیش ئەسلّ تێیدا دەستکراوەیی‌و ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیی (مصلحة)یە، بۆیە: هەرکات پەکمان لەسەر دروستکردنی هەرجۆرە وێنەیـەك کـەوت بـۆ هێنانـەدی بەرژەوەندییـەك، وەك: پەیکـەری مرۆڤـ بۆ مەبەستی پزیشکیی، ئەوە هیچ کۆسپێك لەبەردەمدا نیە:**

چونکە وەك لە فەرمایشتەکاندا بینیمان هۆی بنەڕەتیی بەخراپ دانانی وێنەکان بەگشتیی، بیرۆکەی شیرك‌و بەگـەورەو پیرۆزدانـانی غـەیری خوایـە، کەواتـە: هەرکات لەلایەکەوە ئەو مەترسییە لـەئارادا نـەبوو، لەلایـەکی دیکەشـەوە بەرژەوەندییەك پەکی لەسەر ئەو وێنەکێشانە کەوتبوو، ئەوە بێگومان حوکمی مەسەلەکە گۆڕاوە، بەپێی حوکمی ئەو بەرژەوەندییە،کـە لەسـەری وەسـتاوە، دیاری دەکرێ.

وە ئەوە،کـە ئەسـلّ لـە هەڵس‌وکەوتەکانـدا دەسـتکراوەیی‌و هێنانـەدی بەرژەوەندییە لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا، تیشـکمان خسـتۆتە سـەری لـە بنچینەی دووەم: (بناغە لە هەڵس‌وکەوتەکاندا دەستکراوەیی‌یە)داو لە بنچینەی چوارەمدا: (بناغە لە هەڵس‌وکەوتەکاندا بەدوای هۆکـارو حیکمەتـدا گەڕانـە، بەلاّم بناغە لە خواپەرستیەکاندا گەردنکەچییە).

---

١) بڕوانە: (الشريعة الأسلامية والفنون)، ص ١٢٢-١٢٥، (حكم اتخاذ لُعَب الأطفال).

**شەشەم : هەر وێنەیەك سێبەردارو بێ سێبەر، لە خودی خۆیدا ناشەرعیی بێ، بۆ وێنە: جوانیی و عەوڕەتی ئافرەت بخاتە ڕوو، لەبەر نێوەڕۆکە ناشەرعییەکەی قەدەغەیە:**

بە بەڵگەی ئەوە،کە هەرشتێك ئەنجامدانی بەکردەوە حەڕام بێ، باسکردنو تەعبیر لێکردنیشی هەر حەڕامە، کە بێگومان وێنەکانیش شێوازێکی گرنگی تەعبیر لێکردنو دەربڕینی مەبەستانە.

با بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست نموونەیەك بێنینەوە:

خوای کار بەجێ سبحانە وتعالى لە ئافرەتانی قەدەغە کردوە،کە جوانیی خۆیان بۆ پیاوان دەربخەنو، وەك عادەتی ڕۆژگاری نەفامیی خۆیان بڕازێننەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ...(٣١) النور﴾، واتە: بە ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: با لەسەرنجەکانی چاوانیان بگرنەوەو داوێنیان بپارێزن ،جگە لەوەی بەناچاریی دەردەکەوێ (کە مەبەست دەمو چاوو هەردووك دەستە،هەتا مەچەك) با لەجوانیی خۆیان وەدەرنەخەن...

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ...وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ ...(٣٣) الأحزاب﴾، واتە: وە وەك جوانیی خۆ دەرخستنی (ئافرەتان) لەڕۆژگاری نەفامێتی یەکەم، جوانیی خۆتان پیشان مەدەن...

دەجا وەك چۆن جوانییو عەوڕەتی خۆ دەرخستنی ئافرەتان بۆ پیاوان بەکردەوە قەدەغەیە، بەهەمان شێوە بەوێنەش هەر قەدەغەیە، هەرجۆرە وێنەیەك بێ.

دیارە ئەوەی ڕابرد هەمووی تایبەت بوو بەو وێنەو پەیکەرانەوە،کە بەدەستو لەلایەن وێنەکێشو پەیکەرتاشەوە دروست دەکرێن، ،بەلاّم ئایا وێنەی

فۆتۆگـرافیی‌و سینەمایی حوکمیان چۆنە؟ ئەوە لە باسی چـوارەمدا دەیخەینـە ڕوو:

## باسـی چـوارەم: وێنـەی فۆتۆگرافیی و سینەمایی و کاریکاتێریی :

خوێنــەری بەڕێــز!

وەك پێشتریش باسمان کرد: وێنەی فۆتۆگرافیی لە ساڵی (١٨٣٩)ی زایینیی‌یەوە دۆزراوەتەوەو جیاوازی نێوان وێنەی (فۆتۆگرافیی)و (سینەمایی)یان (ڤیدیۆیی)یش ئەوەیە،کە یەکەمیان چەسپاوو، دووەمیان جووڵاوە.

ئنجا وەك چۆن لەبارەی وێنەکێشان‌و ئەو وێنانەوە،کە بەدەست دروست دەکرێن بەهەموو جۆرو شێوەکانیانەوە، ڕاجیایی (إختلاف) لەنێوان زانایاندا هەیە، لەبارەی وێنەگرتن‌و ئەو وێنانەشەوە،کە بەئامێر دەگیرێن، چ لەجۆری فۆتۆگرافیی‌و، چ لــە جۆری سینەمایی‌و ڤیدیۆیی، دیسان ڕاجیایی لەنێوان زانایاندا هەیە.

### یەکـەم: وێنـەی سینەمایی و ڤیـدیۆیی :

ئــەجۆرە وێنەگرتنــەو وێنەکانیشــی، کێشــەیەکی وای لەســەر نیــەو، زانایــان بەگشتیی بەڕەوای دەزانن، مەگەر خودی وێنەکە ناشەرعیی بێ.

### دووەم: وێنـەی فۆتۆگـرافیـی :

شــەرعزانان هــەر لەســەرەتای ســەرهەڵدانی ئــەجۆرە وێنــەگرتن‌و وێنەیــەوە، ڕاجیایی‌و مشت‌ومڕیان بووە،بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەوەیە،کە بەتێپەڕبوونی کات ڕاجیاییەکە،کەم بۆتەوە بە قازانجی ڕای بەڕەوادانەری ئەجۆرە وێنەیە.

جا ئێمە لە سەرەتا ئاماژە بەڕای زانایان‌و بەڵگەکانیان دەکەین، پاشان ئەوەی بەڕاست‌و شەرعیی دەزانین ڕایدەگەیەنین:

ڕای یەکەم: بەقەدەغە دانانی وێنەی فۆتۆگرافیی :

لەوانەی،کە وێنەگرتنی فۆتۆگرافیی بەحەڕام دەزانن، ئەم سێ زانایەن:

١- الشيخ عبدالعزيز بن باز[1].

٢- الشيخ محمد علي الصابوني[2].

٣- الشيخ محمد ناصرالدين الألباني[3].

لایەنگرانیی ئەم ڕایە، چەند شتێکیان بەبەڵگە هێناوەتەوە،کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- ئەمجۆرە وێنەیەش هەر وێنە (صُورة)یەو چەمکی فەرمایشتەکان دەیگرێتەوە، بۆیە هەمان حوکمی وێنەی بەدەست دروستکراویی هەیە، (دیارە ئەمان وێنەی دەستکردیش بەگشتیی بەقەدەغە دەزانن).

٢- بتپەرستیی (وثنيَّة) لەڕێی وێنەکانەوە لەنێو گەلانی ڕابردوودا بڵاوبۆتەوە، وەك قورئانو سوننەت ئاماژەی پێدەکەن.

٣- دووربینی (إحتياط) وا دەخوازێ، کە هەموو جۆرە وێنەیەك قەدەغە بکرێ.

ڕای دووەم: بەڕەوا دانانی وێنەی فۆتۆگرافیی:

زۆربەی زۆری زانایان، وێنەگرتنی فۆتۆگرافیی بەڕەوا دادەنێن،کە ئەمە ناوی بەشێکیانە:

١- الشيخ منصور علي ناصف[4].

٢- الشيخ محمد بخيت/ مفتي الديار المصرية سابقاً[5].

٣- الشيخ حسنين مخلوف/ مفتي الديار المصرية سابقاً[6].

---

١) بڕوانە: (الجواب المفيد في حكم التصوير).

٢) بڕوانە: (تفسير آيات الأحكام)، ج٢، ص٤١٥.

٣) بڕوانە: (آداب الزفاف)، ص١٠٤.

٤) (التاج الجامع للأصول)، ج٣، ص١٨٥.

٥) (الجواب الشافي في إباحة التصوير الفتوگرافي).

٦) (فتاوى شرعية وبحوث إسلامية)، ج١، ص١٦٢.

٤- الشيخ محمد رشيد رضا[١].

٥- الشيخ عبدالرحمن الجزيري[٢].

٦- الشيخ محمد علي السّايس[٣].

٧- الشيخ محمد الخضر حسين[٤].

٨- الشيخ محمد متولّي الشعراوي[٥].

٩- الشيخ الدكتور يوسف القرضاوي[٦].

١٠- الأستاذ سيد سابق[٧].

١١- الأستاذ سعيد جندول[٨].

١٢- لجنة الفتوى بالأزهر الشريف[٩].

لایەنگرانی ئەم ڕایەش چەند شتێکیان بەبەڵگە هێناوەتەوە، کەئەمانە گرنگترینیانن:

١- وێنەگرتنی ئامێریی (التصوير الآلي)، لەوێنەکێشانی دەستیی جیایەو، فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خواش ﷺ هەموویان لەبارەی وێنەکێشانی دەستییەوەن!

٢- بەقیاس کردنە سەر وێنەو نەخشو نیگاری پۆشاك (رَقْماً في الثوب)،کەبەدەقی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ لە حوکمی قەدەغەبوون هەڵاوێرراوە، دەبێ ئەمجۆرە وێنەیە حەڵاڵ بێ.

---

١) (فتاوى محمد رشيد رضا)، ج٣، ص١١٤٢.
٢) (الفقه على المذاهب الأربعة)، ج٢، ص٤١.
٣) (أحكام القرآن).
٤) (الشريعة الأسلامية صالحة لكل زمان ومكان)، ص١٦٠.
٥) (فتاوى محمد متولّي الشعراوي)، رقم٣، ص٤٤.
٦) (الحلال والحرام في الأسلام)، ص١١٢.
٧) (فقه السنة)، ج٣، ص٥٠١.
٨) (الدرّ النضيد شرح كتاب التوحيد)، ص٢٧٧.
٩) (الشريعة الأسلامية والفنون)، ص١٠٥.

٣- هۆکار (عِلّة) سەرەکیی قەدەغەبوونی وێنەکێشان، پەرستن‌و بەبەرزو پیرۆز گرتن‌و شتی وەك هی خوا دروستکردنە، بەلاّم بابای وێنەگر (مصوِّر، عکّاس) هیچ کام لەو مەبەستانەی نین‌و، هیچکەسیش پێی سەرسام (مُعْجَبْ) نابێ، بەپێچەوانەی بابای وێنەکێش (رسّام)ەوە.

٤- وێنەگرتنی فۆتۆگرافیی‌و سینەمایی، هێنانەدی هیچ شتێکی تازەی تێدانییە، چونکە بەس بریتییە لە هێشتنەوەی سێبەرو خەیالّی دروستکراوەکان.

٥- وێنەی فۆتۆگرافیی‌و سینەمایی، وەك ئەو وێنانە وایە،کە لەئاوێنەو ئاودا دەردەکەون، بۆیە پێویستە هەمان حوکمی وانی هەبێ، چونکە تەنیا جیاوازییان ئەوەیە،کە وێنەی ئاوێنەو ئاو، بەلاچوونی وێنەدارەکە نامێنێ،بەلاّم هی فۆتۆگرافیی‌و سینەمایی دەمێننەوە.

## ڕاوبۆچوونم لەبارەی وێنەی فۆتۆگرافیی و سینەماییەوە:

بە کورتی دەلّێم:

مادام ئەسلّ لە هەلّس‌وکەوتەکاندا ڕەواییە (الأصل في المعاملات الإباحة)، لەبواری هەلّس‌و کەوتەکاندا بەرژەوەندیی (مصلحة) سەنگی مەحەکە، کەئەمیش بریتیە لە: وەدەستهێنانی قازانجەکان‌و دوور خستنەوەی زیانەکان (جلب المنافع ودفع المضارّ)،کەئاشکرایە وێنەگرتنیش بە هەردوو جۆری وەستاوو جوولاّوییەوە، لە بابەتی هەلّس‌وکەوتەکانە، ئەمە لە لایەك‌و، لە لایەکی دیکەشەوە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا، هەموویان لەبارەی وێنەکێشان‌و پەیکەرتاشین (رَسْم ونحت)ەوە هاتوون‌و، کەم‌و زۆر پەیوەندییان بە وێنەگرتن (تصویر)ەوە نیە بەهەردوو جۆری جوولاّوو وەستاویەوە، پاشان فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش، کە لەبارەی وێنەکێشان‌و پەیکەرتاشییەوە هاتوون، بەڕوونیی تێیاندا خراوەتەڕوو، کە هۆکاری

قەڵسبوونی پێغەمبەر ﷺ لە وێنەی دروستکراو بەگشتیی‌و، هی سێبەردار بەتایبەت، بریتیە لە:

پەرستن‌و بەگەورەو پیرۆز دانان‌و، کاری خۆ شوبهاندن بە کاری خوا - سبحانە وتعالی- و، زێدەڕۆیی، کەدیارە هیچ کام لەم سێیانەش لە وێنەگرتنی فۆتۆگرافیی‌و سینەمایی دانین، بۆیە بەڕاشکاویی‌و دڵنیاییی‌یەوە دەڵێین:

وێنەگرتنی ئامێریی (التصویر الآلي) شتێکی ڕەوایەو وەك گوتراویشە: ئەم جۆرە وێنەیە کتومت وەك وێنەی دەرکەوتووی نێو ئاوێنەو ئاو وایە، تەنیا جیاوازییان ئەوەیە،کە وێنەی ئامێریی دەمێنێتەوەو، وەك هی نێو ئاوێنەو ئاو بە لاچوونی شتە وێنەگیراو (مُصَوَّر)ەکە ناڕوات.

ئنجا،ئەگەر وێنەی بەدەست کێشراوی سەر بەرگ‌و پۆشاك‌و کەل‌وپەل، لە حوکمی گشتیی، قەدەغە، یان ناپەسند بوون، هەڵاوێررابێ، وەك بەدەقی پێغەمبەری خوا ﷺو بە تەعبیری (الاّ رَقْماً في الثوب) هەڵاوێرڕاوە، ئەوە،ئەگەر گریمان دەقەکانی سوننەت، چەمك‌و واتایەکەیان وێنەی ئامێرییش بگرێتەوە، هەر ناچارین - بەهۆی قیاسەوە- کە بڵێین:

ئەگەر وێنەی بەدەست کێشراوی سەر بەرگ‌و پۆشاك‌و کەل‌وپەل لە حوکمی گشتیی، قەدەغە، یان ناپەسندبوونی وێنەکێشان هەڵاوێررابێ، پێویستە چاکترو (بطریق الأولی) وێنەی بەئامێر گیراویی سەر کاغەز، هەڵاوێرڕاوو جیاکراوە بێ.

بەڵام بێگومان،ئەگەر خودی وێنەکەو نێوەڕۆکەکەی قەدەغەو ناشەرعیی بێ، بۆ نموونە: تەعبیر لە کوفرو ئیلحادو بتپەرستیی بکات، یان عەوڕەت‌و عەیب‌و عار بخاتەڕوو، بەرەو خراپەو گوناه وورووژێنەر بێ، ئەوە لەبەر ئەو خراپەو ناشەرعییە،کە گرتوویەتە خۆی، بە قەدەغەو خراپ دادەنرێ.

## سێیەم: وێنەی کاریکاتێریی :

ئەم جۆرە وێنەیەش، کە بریتیە لە: وێنەی گاڵتە پێکەر (الصورة السّاخرة)و لەم ڕۆژگارەدا ڕەواج‌و کاریگەرییەکی زۆری هەیە لە بواری ڕاگەیاندندا بەگشتیی، هیچ

بەڵگەیەك لەسەر قەدەغەکرانی نیە، چونکە هیچ کام لە هۆکارەکانی بەقەدەغەدانانی وێنەکێشانی تێدانین، وەك: پەرستن‌و بەگەورەو پیرۆزگرتن‌و دروستکراوی وەك هی خوا دروستکردن‌و زێدە مەسرەف کردن، بۆیە حوکمەکەی لەبنەڕەتدا ڕەوایی (إباحة)یەو، پاشان سەرنجی ئامانجی بۆ بەکارهێنرانی دەدرێ‌و، بەگوێرەی ئەوە حوکمی خۆی وەردەگرێ،ئەگەر بۆ چاکسازیی‌و ڕەخنەی بنیاتنەر گرتن‌و دژایەتیکردنی ستەم‌و خراپە بێت، ئەوە نەك هەر ڕەوا، بگرە پەسندو جاری واش هەیە پێویستیش دەبێ، چونکە لەوحاڵەتەدا بۆتە ئامرازو شێوازێکی فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لە خراپە، کە دیارە ئەمیش بەگشتیی لەسەر مسوڵمانان پێویستە: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ... ﴿٧١﴾ التوبة﴾،بەلام بێگومان،ئەگەر نێوەڕۆکی ئەم جۆرە وێنەیەو ئامانجی بۆ بەکارهێنرانی ناشەرعیی‌و خراپ بێ، ئەوە ڕەوانیە، بۆ نموونە:

ئەگەر بۆ گاڵتەو سووکایەتیی بەخەڵك کردن بێ، ئەوە ڕەوا نیەو قەدەغەیە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ ... ﴿١١﴾ الحجرات﴾، هەروەها،ئەگەر بۆ برەو پێدانی دزیی‌و خراپەو خیانەت‌و هەرکردەوەو ڕەفتارێکی دیکەی خراپ بێ دیسان ناڕەوایە، وەك خوای بەرزو بێ وێنە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿١٩﴾ النور﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی حەزدەکەن قسەو ڕەفتاری ناشیرین لەنێو برواداندا بڵاوبێتەوە، ئازارێکی بەئێشیان لەدنیاو دوارۆژدا هەیە،خوا دەزانێ‌و ئێوە نازانن.

ئنجا بەڵگە هێنانەوەی،کەسانێکیش بەرستەی: ﴿ ...فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلۡقَ ٱللَّهِۚ ... ﴿١١٩﴾ النساء﴾، واتە: جا بەتەئکید دروستکراوی خوا دەگۆڕن...، لەسەر ئەوە،کە وێنەی کاریکاتێریی قەدەغەیە قسەیەکی بێهێزە، چونکە:

وێنەی کاریکاتێریی شتێکی جیددیی نیە، بەڵکو گاڵتە ئامێزەو، هیچ دروستکراوێکی خواش ناگۆڕێو بەهیچ جۆرێك ئایەتەکە نایگرێتەوە.

ئێستاش دەگوازینەوە بۆ باسی پێنجەمو کۆتایی ئەم بەشی چوارەمە:

## باسی پێنجەم: وێنەی ئافرەت:

خوێنەری سەنگین! لەبارەی دەرکەوتنی وێنەی ئافرەتەوە، چ وێنەی فۆتۆگرافیو، چ هی سینەماییو ڤیدیۆیی، لەنێو شەرعزاناندا مشتومڕ هەیەو، هەندێکیان بە ناڕەواو زۆربەشیان بە ڕەوای دەزانن، مادام دەرکەوتنەکە بە شێوەیەکی ئاساییو بە پۆشاکی شەرعییەوە بێ.

ئاشکراشە، کە ئەم ڕا جیاییە پەیوەستە بەڕاجیاییەکی دیکەوە،کە بریتیە لەوەی:

ئایا جەستەی ئافرەت چەندەی بە عەورەت دادەنرێو پێویستە لەئاست پیاواندا بپۆشرێو، چەندەیشی دروستە دەربکەوێ؟!

چونکە بێگومان ئەوەی،کە دروست (جائز)بێ لەدنیای واقیعدا ببینرێ، چاکتر دروستە، کە لە وێنەدا ببینرێ!

شایانی باسیشە، کە ئێمە ستایش بۆخوا لە کتێبی: ( ئافرەتو خێزان لەسایەی شەریعەتدا ) بەدرێژیی باسی ئەم مەسەلەیەمان کردوەو چەندان بەڵگەمان لەسەر ئەوە هێناونەوە،کە ئافرەت،جگە لە ڕوویو هەردوو دەستی، تامەچەکی، هەموو جەستەی لەئاست پیاوانی نامەحرەمدا عەورەتەو لەسەری پێویستە دایپۆشێ[1].

جا ئێمە لێرەدا وەك نموونە، ئاماژە بە پێنج لەوبەڵگانە دەکەین:

---

١- بڕوانە: چاپی دووەم/ نووسینگەی تەفسیر-٢٠٠٥-، (چۆنیەتی پۆشاکی ئافرەتو سنووری عەورەتی لە شەریعەتدا) لاپەڕە ٢١٨-٢٣٩.

یەك: خوای بەبەزەیی فەرموویەتی: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ...﴿٣١﴾ النور﴾، واتە: بە ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: لە نیگای چاوەکانیان بگرنەوەو داوێنیان بپارێزن، جوانیی خۆیان،جگە لەوەی،کە لێیان دەردەکەوێ (بە ناچاریی لەکاتی عیبادەت‌و ئیش‌و کاردا) دەرنەخەن ...

جا ئەم ڕستە قورئانییە: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوانی قورئان بەوجۆرە تەفسیریان کردوە،کە مەبەست لە ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ دەم‌وچاوو هەردووك دەستە،هەتا مەچەك ( الوجه واليدان الى الرّسغ)، واتە: ئافرەتی مسوڵمان لەسەری پێویست نیە، کە ڕووی‌و هەردووك دەستی،هەتا مەچەکی داپۆشێ، لەئاست پیاوانی نامەحرەمدا، چونکە عەورەت نین.

بۆ نموونە: (إبن جرير الطّبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا لە تەفسیری ئەو ڕستە قورئانییەدا گوتوویەتی:

(وقوله: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ يقول تعالى ذكره: ولايُظْهِرْنَ للناس الذين ليسوا لهنَّ بِمَحْرَم، زينَتَهُنَّ، وهما زينَتان: إحداهُما ماخَفِيَ، وذلك كالخَلْخال والسِّوارَيْن والقرطَيْن والقلائد، والأخرى: ماظهر منها، وذلك مختلف في المَعْنيِّ منه بهذه الآية، فكان بعضهم يقول: زينة الثياب الظاهرة.

وقال آخرون: الظاهر من الزينة التي أُبِيحَ لهاأن تُبْدِيَهُ: الكحل والخاتم والسواران والوجه ... وقيل الوجه والثياب ... وأولى الأقوال في ذلك بالصَّواب: قَول مَن قال: عُنيَ بذلك الوجه والكفان، يَدخُلُ في ذلك، اذا كان كذلك: الكحل والخاتم والسُّوارُ والخِضابُ..)[1].

---

١) جامع البيان، ج١، ص١٥٦-١٥٩.

واتــە: وە فەرمایشــتەکەی: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ خــوا یــادی بــەرزبێ دەفەرموێ: با ئافرەتان جوانیی خۆیان بۆ ئەو خەڵکــە، کــە مــەحرەمیان نــین دەرنەخەن، جوانییش دوو جۆرە: یەکیان پەنهانە، ئەویش وەك خڕخاڵو بــازنو گوارەو ملوانکە، ئەوی دیکەشیان ئەوەیە، کە لێــی دیــار دەبــێ ﴿مَا ظَهَــرَ مِنْهَا﴾، جا لەوبارەوە،کە ئایا مەبەستی پێی لەم ئایەتەدا چیــە؟ ڕاجیــایی هەیە، هەندێکیان گوتوویانە: جوانیی بــەرگو پۆشــاکی دیــارە، کەســانێکی دیکەش گوتوویانە: جوانیی ئاشکرا، کە بۆ ئافرەت دروستە پیشــانی بــدات: کلو ئەنگوستیلەو بازنو دەموچاوە... وەگوتراوە: دەمو چاوو پۆشاکە... ،بەڵام نێزیکترین قسە لــە ڕاســتییەوە لــەوبارەوە قســەی ئەوانەیە،کــە گوتوویانــە: مەبەست لەوە: ڕووو هەردووك دەستن، ئینجا،ئەگەر واشبێ، هەرکام لــەکلو ئەنگوستیلە بازنو خەنەش دەچنە نێو بازنەی ئەوەوە،کە -دروستە دەربخرێ-.

ئنجا،جگە لە (الطبري) زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوانی دیکەی قورئــانیش هەمان ڕایان لەبارەی تەفسیری ئەو ڕستە قورئانییەوە هەیە، بۆ نــموونە:

الــزمخشــري[1]، ابــن كثيــر[2]، فخرالــدين الــرازي[3]، ابــن العربــي[4]، القرطبــي[5]، الجصّــاص[6]، الشــوكاني[7]، القاســمي[8]، الآلوســـــي[1]،

---

١) تفسير الكشاف، ج٣، ص٢٣٠-٢٣١.
٢) مختصرتفسيرابن كثير، ج٢، ص٦١٥، محمد علي الصابوني.
٣) مفاتيح الغيب، ج٢٣، ص٢٠٥-٢٠٦.
٤) أحكام القرآن، ج٣، ص٣٨١-٣٨٢.
٥) الجامع لأحكام القرآن، ج٦، ص٣٥-٥٤.
٦) أحكام القرآن، ج٦، ص٣١٥.
٧) فتح القدير، ج٢، ص.٢٩
٨) محاسن التأويل، ج٧، ص١٩٥.

سيد قطب[٢]، سعيد حوّى[٣]، الطباطبائي[٤]، محمد حسن الحمصي[٥]، حسنين محمد مخلوف[٦]، ناصر مكارم شرازي[٧].

دوو: ((عن عائشة رضي الله عنها أن أسماءَ بنت أَبي بكرٍ رضي الله عنهما دخلت على رسول الله ﷺ وعليها ثيابٌ رقاقٌ فأعرض عنها رسول الله وقال: يا أسماءُ! ان المرأة اذا بلغت الحيض لم تَصْلُح أن يُرى منها الاّهذا وهذا وأشار الى وجهه وكفّيه)) رواه أبوداود.

واته: ئەسمائی کچی ئەبوبەکر - خوا لێیان ڕازی بێ- چووە لای پێغەمبەری خواﷺ وە پۆشاکێکی تەنکی لەبەر دابوو، پێغەمبەری خواش ڕووی لێوەرگێڕاو فەرمووی: ئەی ئەسماء ! ئافرەت، کە بالّغ بوو، ناگونجێ هیچ شوێنێکی دیاربێ ،جگە لە ئەمەی‌و ئەمەی، ئاماژەی بۆ ڕووی‌و هەردووك دەستەکانی کرد.

سێ: ((عن سهل بن سعد ﷺ ان امرأة جاءت الى رسول الله ﷺ وهو في المسجد، فقالت: يارسول الله جِئت لأهَبَ لك نفسي، فَصَمَتَ، فلقد رأيتها قائمة مَلياً أوقال هويناً، فنظر اليها رسول الله ﷺ فَصَعَّد النظر اليها وصَوَّبهُ، ثم طأْطَأَ رأْسَهُ، فلما رأت المرأة أنه لم يَقْصِدْ فيها شيأً جَلَسَت..)) رواه البخاري ومسلم والنسائي وأحمد والبيهقي والروياني وأبويعلى.

واته: ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەمزگەوتێ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! هاتووم خۆمت پێشکەش بکەم! ئەویش بێ دەنگ بوو، ئیدی

---

٩) روح المعاني، ج ١٨، ص١٤٠.
١) في ظلال القرآن، ج٦ ص٩٥.
٢) الأساس في التفسير، ج٧، ص٣٧٥٨.
٣) (الميزان)، ج١٥ ص١١٠-١١١.
٤) مفردات القرآن، ص٤٥١.
٦) صفوة البيان لمعاني القرآن، ص٣٥٣.
٧) تفسيرنمونه ، ج١٤، ص٤٣٩-٤٤٠.

من ئافرەتەکەم بینی ماوەیەکی زۆر- یان گوتی ماوەیەك - ڕاوەستا، پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێداگێڕاو سەرنجی‌دا، پاشان سەری دانەواند، جا کاتێك ئافرەتەکە بینی،کە پێغەمبەر هیچی لەبارەوە نەدرکاند دانیشت..

چوار: ((عن عائشة رضي الله عنها قالت : كُنَّ نساءَ المؤمنات يشْهَدْن مع النبي ﷺ صلاة الفجر مُتَلَفِّعاتٍ بِمُروطِهِنَّ ثم ينقلبْنَ الى بيوتِهِنَّ حين يقضين الصلاة لايُعرَفْنَ من الغَلَس[١]) متفق عليه، وفي رواية أبي يعلى بِسَنَدٍ صحيح: (وما يعرِف بَعْضُنا وجوهَ بعضٍ).

واتە: ئافرەتانی بڕوادار لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەشداری نوێژی بەیانییان دەکرد لە حاڵێکدا،کە پۆشاکەکانییان لەخۆیان وەرپێچابوو، پاشان دوای ئەوەی نوێژیان تەواوکرد، دەگەڕانەوە ماڵەکانیان‌و لەبەر تاریکیی بووڵێڵ نەدەناسرانەوە، لە ڕیوایەتێکی (أبو يعلى)دا،کە سەنەدەکەی ڕاستە: هەندێکمان دەم‌وچاوی هەندێکمان نەدەناسییەوە.

پێنج: ((عن جابر بن عبدالله رضي الله عنهما قال: شهدت مع رسول الله ﷺ الصلاة يوم العيد، فبدأ بالصلاة قبل الخطبة بغير أذانٍ ولا إقامةٍ ثم قام متوكِّئاً على بلالٍ فأمر بتقوى الله وَحثَّ على طاعته وَوَعظ الناس وذكَّرهم، ثم قضى حتى أتى النساءَ فَوَعَظَهُنَّ وذكَّرهُنَّ، فقال: تَصدَّقنَ فأن أكثركن حَطَبُ جهنَّم، فقامت امرأة من سِطَةِ النساءِ سَفعاءُ الخَدَّين، فقالت: لِمَ يارسولَ الله؟ قال: لأنكُنَّ تُكْثِرْنَ الشَّكاة وتكْفُرْنَ العشير)) رواه مسلم والنسائي وأحمد والبيهقي والدارمي وابن خزيمة.

واتە: ڕۆژێکی جەژن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادەی نوێژ بووم، سەرەتا پێش وتار بەبێ بانگ‌و قامەت نوێژەکەی کرد، پاشان خۆیدایە سەر

---

١) (الغَلَس: ظلمة آخر الليل اذا اختلطت بضوء الصباح)، المعجم الوسيط، ص٦٥٨. کە بە کوردی دەڵێین: تاریك‌و ڕوونیی بەیانی، یان بووڵێڵی بەیانی.

بیلال و هەستا، فەرمانی کرد بە پارێز لە خواکردنو هانی خەڵکیدا بۆ فەرمانبەرییو ئامۆژگاریی کردنو بیری هێنانەوە، دوایی چووە لای ئافرەتانو ئامۆژگاریی کردنو بیری هێنانەوە، جا فەرمووی: خێروچاکە بکەن، چونکە زۆربەتان سووتەمەنیی دۆزەخن! ئنجا ئافرەتێك لەنێوەڕاستی ئافرەتەکان هەڵسا، کە ڕوومەتەکانی ڕەشی تێکەڵ بەسوور[1] بوون، گووتی: جا ئەوە بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا؟! فەرمووی: چونکە زۆر سکاڵاو نازونووز دەکەنو بەرانبەر بە مێردیش سپڵەن!

دیارە هەر کەسێکیش بەوردیی سەرنجی ئەم فەرمایشتانە بدات، دڵنیا دەبێ کە هەموویان بەڕوونیی ئەوە دەگەیەنن،کە لە ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانیدا ئافرەتان دەموچاویان دیاربووەو داپۆشینیان بەپێویست و، بگرە بە سوننەتیش نەزانیوە. ئنجا شایانی باسیشە، کە بە عەورەت نەزانرانی ڕووو دوو دەستی ئافرەت، وەك چۆن ڕای زۆربەی هەرەزۆری توێژەرەوانی قورئانە، هی زۆربەی هەرەزۆری فەرموودەناسانو هی زۆربەی هەرەزۆری نزیك لە یەکدەنگیی شەرعزانانیشە، وەك: (إبن رشد[2])و (النووي[3]) گوتوویانە: هەرکام لە (أبوحنيفة)و (مالك)و (شافعي)و (أحمد) لە یەکێك لە دوو قسەکانیدا، ئەو ڕایەیان هەیە، وە (الطّحاوي[4]) توویەتی: (محمدبن الحسن)و (أبو يوسف)یش هەمان ڕایان هەیە، هەروەها (ابن حزم الأندلسي[5])یش بەهەمان شێوە.

---

١) بڕوانە: (المعجم الوسيط)، ص٤٣٤، (سَفِع سَفَعاً وسُفْعةً: كان لَونُهُ أسود مُشْرَباً حُمرةً).
٢) (بداية المجتهد)، ج١، ص٨٩.
٣) (المجموع شرح المهذّب)، ج١٧، ص٢٩٠.
٤) (شرح المعاني)، ج٢، ص١٠٩.
٥) (المحلى شرح المجلى)، ج٣، ص١٢٦.

دیسان زۆربەی هەرەزۆری زانایانی هاوچەرخیشمان هەمان ڕایان هەیە - واتە ئەو ڕایە،کە دەڵێ: دەموچاوو هەردوو دەستی ئافرەت،هەتا مەچەکی عەورەت نین-

بۆ نموونە:

١ - الشيخ ناصرالدين الألباني[١].

٢- الدكتور عبدالكريم زيدان[٢].

٣- الأستاذ سيد سابق[٣].

٤- الشيخ يوسف القرضاوي[٤].

٥- الدكتور وهبة الزحيلي[٥].

٦- الدكتور محمد سعيد رمضان البوطي[٦].

## پوختەی مەبەست :

مادام دەموچاوو هەردوو دەستی ئافرەت عەورەت نەبن‌و، لەسەری پێویست نەبێ دایانپۆشێ، کەواتە: بۆی هەیە،کەوێنەشی بگیرێ، چ هی فۆتۆگرافیی، چ هی سینەمایی، بەمەرجێك بۆ مەبەستی خراپ بەکارنەهێنرێ‌و بێجگە لەڕووو هەردووك دەستیشی،هەتا مەچەکی، هیچ شوێنێکی دیکەی دیار نەبێ‌و زێدەڕۆیی‌و (تَكَلُّف)یشی لە خۆڕازاندنەوەدا نەکردبێ، بەشێوەیەك،کە لە بازنەی شەریعەت بەدەربێ.

---

١) جِلْبابُ المرأة المسلمة.

٢) المفصّل في أحكام المرأةو البيت المسلم، ج٣، ص١٩٠-١٩١.

٣) فقه السنّة، ج١، ص١٤٠.

٤) فتاوى معاصرة.

٥) الفقه الأسلامي وأدلّته، ج٩، ص٦٥٠١.

٦) المرأة بين طغيان النظام الغربي ولطائف التشريع الرّباني، ص. ١٦٥

# بەشی پێنجەم

## نـــــوانـــــدن

## [الـتـمـثـيـل][1]



١- بۆ نوسینی ئەم بەشە بەپلەی یەکەم سوودم لە کتێبی: (الشريعة الأسلامية والفنون) وەرگرتـوە، بڕوانە: ص٣٤٩ تا ٣٥٧.

خوێنــەری بەڕێــز!

ئەم بەشی پێنجەمە لە دووباسی سەرەکی پێکدێ،کە ئەمە ناوونیشانەکانیانە:

باسی یەکەم: پێناسەی نواندن .
باسی دووەم: حوکمی نواندن .

## باســی یەکـەم: پێناســەی نوانـدن (التمثیل):

### ١- پێناســەی نواندن لەڕووی زمانەوانییــەوە :

دیارە وشەی نواندن تەرجەمەی وشەی (تمثیل)ە، کەواتە بابزانین وشەی نـاوبراو لە زمانی عەرەبییدا مانای چییە؟!

(التمثیل: التصویر والتشبیه والتسویة والتشکیل، یقال: في ثوبـه تماثیــل، أي: تصاویر وَمَثَّل التّماثیل: صَوَّرها بالنحّتِ، والمَثّال: صانع التماثیل، والمُمَثِّلُ: الـذي یقوم بعملیة التمثیل، أوالمصوِّر، وَمَثَّلَ الشيئَ: تَصوَّر مِثالَهُ.
وأصل کلمة التَّمْثال أوالتِّمثال من: مَثَّلتُ الشيء بالشيء، اذا قَدَّرته عی قدْرِهِ ویکون تمثیل الشيء بالشيء تشبیهاً به، أو تسویته به)[1].

پوختـــەی مانـــا:

وشەی (تمثیل) بەمانای وێنە کێشانو وێچواندنو ڕێکخستنو پێکهێنان دێ، وە وشەی (تماثیل) بەمانای وێنەکانـدا، (مثّـل التماثیــل) واتــە: وێنــەکانی بــەهۆی

١) بڕوانە: (لسان العرب) ج١١ ص٦١٣، وە: (القاموس المعیط) ج٤ ص٥٠، وە: (مختار الصّحاح) ج٥ ص١٨١٦، وە: ( المعجم الوسیط) ص٨٥٣، وە: (مفردات ألفاظ القرآن) ص٧٥٨-٧٦٠.

داتاشینەوە بەرجەستە کردن،(مثّال) پەیکەرتاشە،(مُمَثِّل) هەم بەمانای ئەکتەرو هەم وێنەکێشیشدا، ڕیشەی وشەی (تمثال) لە: (مَثَّلت الشيء بالشيء)یەوە هاتوە کاتێك،کە شتێك بە شتێك ئەندازەگیریی دەکەی، دەگوترێ: (مثلت الشيء بالشيء) واتە: بەوم چواندو لەگەڵیدا یەکسانم کرد.

## ٢- پێناسەی نواندن لەڕووی زاراوەییەوە :

نواندن (تمثیل) لەلایەن پسپۆرو شارەزایانییەوە، بەزۆر شێوە پێناسە کراوە،کە لە نێوەڕۆکدا یەکدەگرنەوە، بۆ نموونە :

١- (التمثيلية: عَمَلٌ فَنِّيٌ مَنْثورٌ أومنظومٌ يُؤَلّفُ على قواعد خاصة لِيُمَثِّلَ حادِثاً حَقيقياً أومختلقاً قصداً للعبرة)[١].

واتە: نواندن کارێکی هونەریی پەخشان، یان هەڵبەستە، بەپێی چەند بنەمایەك ڕێك دەخرێ،تاکو ڕووداوێکی ڕاستەقینە، یان هەڵبەستراو بنوێنێ، بەمەبەستی پەندو عیبرەت لێوەرگرتن.

٢- (إنه تَقَمُّصُ دورالآخرين وحالتهم، أو إستحضارصورة من شخصٍ أو حادِثٍ والأِتيان بمثيلٍ أو شبيهٍ له دون إستحضارالشخص نفسه وإعادة الحادث بكل تفصيلاتِهِ)[٢].

واتە: بریتیە لە چوونە نێوحاڵەتو ڕۆڵی ئەوانی دیکە، یان هێنانە بەرچاوی وێنەیەك لە کەسێك، یان ڕووداوێكو وەك ئەو، یان وێنەی ئەو کردن، بێ ئامادەکردنی کەسەکەو دووبارەکردنەوەی ڕووداوەکە بە هەموو وردەکارییەکانییەوە.

٣- (التمثيلية عبارة عن إبراز الشخصيّات والفعل إبرازاً حيّاً مُشاهَداً)[١].

---

١) المعجم الوسيط، ص٨٥٤.

٢) فن الممثِّل العربي، زكي طليمات، ص١٧، لە: (الشريعة الأسلامية والفنون)، ص٣٣٥.

واتە: نواندن بریتیە لە دەرخستنی کردەوەو کەسێیەتییەکان بەشێوەیەکی زیندووی بینراو.

٤- (ئەرِەسطـــۆ)ش بە: (لاسایی کردنەوەی کردەوەی مرۆڤــ) (مُحاكـاة الفعـل البشري) پێناسەی کردوە[٢].

کەواتـــە:

نواندن بریتیە لەوە،کەکەسێك، یان زیاتر، قسە، یان ڕەفتارو قسـەو حاڵـەتو هەڵوێستو بەسەرهاتی،کەسێك، یـان زیـاتر بـەزمانی وتـارو کـردار بگێڕنـەوەو بیخەنەڕوو،تاکو ئەو بەسەرهاتە ڕاستەقینەیە، یان خەیاڵییە بەشێوەیەکی زیندووو بەرهەست بخرێتە بەرچاوو، لەجیاتی وشەو قسەی نووسـراوو بیسـتراو، بـە قسـەو کردارو ڕەفتار تەعبیری لـێبکرێ،کە تەعبیرکردنەکە حاڵەتێکی زیندووو واقیعـی پێ ببەخشرێ.

ئێستاش، کەهەتا ڕاددەیەك پێناسـەی نواندن (التمثيـل)مـان کـردو زانیمـان چییە! دەگوازینەوە بۆ باسی دووەمی ئەم بەشە، تاکوبزانین حوکمی هونەری نواندن، کە هونەری شانۆ (فن المسرح)شی پێ دەڵێن، چییە؟!



١) مبادیء الأخراج المسرحي، بدري حسّون وسامي عبدالحميـد، ص٧٩، لـه: (الشـريعة الأسـلامية الفنون)، ص٣٣٥.

٢) الشريعة الأسلامية والفنون، ص٣٣٥.

## باسی دووەم: حوكمی نواندن (التمثيل):

خوێنەری بەڕێز!

هیچ گومان لەكاریگەریی نواندنو شانۆگەرییدا نیە، چ بەباری خێرو، چ بەباری شەڕدا، بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا،كە بۆتە كەرەسەو ماددەیەكی بەپێزی ڕاگەیاندن، بۆیە پێویستە مسوڵمانان وەك هۆكارو ئامڕازێكی كاریگەری كاری ئیسلامییو گەشەپێدانی كۆمەڵگا تەماشای بكەن.

دیارە شەرعزانانیش كەمو زۆر، لەبارەی نواندنو شانۆگەرییەوە مشتومڕو ڕاجیاییان هەیە، كە ئایا ڕەوایە، یان نا؟ ئەگەر ڕەوایە مەرجەكانی ڕەوابوونی چین؟!

بەندەش پاش لێوردبوونەوەی ئەم بابەتەو، سەرنجدانی قسەو بیروڕای ژمارەیەك لە زانایانی هاوچەرخ لە بەڕەوادانەرانو بەقەدەغەدانەرانی[1] ئەم جۆرە هونەرەو، سەرنجدانی واقیعی ئێستای كۆمەڵگاو كاریگەریی هونەری نواندنو شانۆ، لەسەری چ بەباری خێرو چاكەو چ بەباری شەڕو خراپەدا، گەیشتمە ئەو قەناعەتەی،كە هیچ بەڵگەیەكی شەرعیی ڕوونو بێ چەندوچوون نیە، لەسەر ڕێگریی كردن لەم جۆرە هونەرەو بەقەدەغەدانانی، بەمەرجێك:

أ- ئەو نواندنە ئامانج لێی، هێنانەدی بەرژەوەندیی (مصلحة)بێ، كە وەك پێشتریش گوتمان: لە دابینكردنی قازانجەكانو لابردنی زیانەكان (جَلبُ المنافع ودفع المضار)دا خۆی دەبینێتەوە.

ب- لە سنوورو شێرازەی شەریعەتی بەرجەستە لە قورئانو سوننەتدا، دەرنەچێ، شتێكی ئاشكراشە - بۆ شارەزایانی شەریعەت- كە هەركام لە: (هێنانەدی بەرژەوەندییو لە سنوورو شێرازەی شەریعەت دەرنەچوون) دوو ڕووی دراوێكن،

---

١) بۆ ڕای لایەنگران سەرنجی: (الشريعة الأسلامية والفنون) ص٣٤٩-٣٧٢و، بۆهی نەیارانیش سەرنجی: (البيان المفيد عن حكم التمثيل والأناشيد)ی (عبدالله بن عبدالرحمن السليماني) بدە.

چونکە: هەموو بەرژەوەندییەکی دنیاو دوا ڕۆژی تاکو خێزانو کۆمەڵگا لە پابەندیی بە شەریعەتەوە دایەو، هەموو لە شەریعەت دەرچوونێکیش،جگە لە خراپە (مفسدة) هیچ بەرهەمێکی دیکەی نیە.

بەڵێ:

بەبۆچوونی بەندە: هونەری نواندنو شانۆش، وەك هەر هەڵسوکەوتێکی دیکە،کە ئەسڵ تێیدارەوایی (إباحة)و دەستکراوەیی (عفو)یە ، ئەگەر بێتو هەردوو مەرجی: (بەرژەوەندیی تێدا هەبوون)و (لە بازنەی شەریعەت دەرنەچوون)ی تێدا بێنەدی، ئەوە هەر لەسەر حاڵەتی ئەسڵیی خۆی،کە ڕەوایی یە، ماوەتەوە.

بەڵام بە پێچەوانەوە:

بەئەندازەی ئەوە،کەیەکێك لەم دوو مەرجە،یان هەردووکیان کز دەبن، یان نامێنن، ئەو جۆرە هونەرەش وەك هەر هەڵسوکەوتێکی دیکەی زیانگەیێن (مُضِرّ)و لەجوغزی شەریعەت چووە دەر، حوکمەکەی بەرەو ناپەسندیی‌و قەدەغەیی دەگۆڕێ.

ئێستاش باچەند بەڵگەیەك لەسەر ڕاستیی ئەم ڕاو بۆچوونانەمان بێنینەوە، کە بەپێی زانیاری بەندە ڕاوبۆچوونی زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئیسلامە:

## چەند بەڵگەیەك لەسەر ڕەوایی هونەری نواندن و شانۆ

١- وەك پێشتر چەند جارێك باسمانکرد: بناغە لە هەڵسوکەوتەکاندا ڕەواییە (الأصل في المعاملات الأباحة)، جادیارە نواندنیش جۆرێکە لە هەڵسوکەوت و لە ئەسڵدا ڕەوایە، پاشان بەگوێرەی نێوەڕۆك و چۆنیەتی و ئامانجەکەی، حوکمەکەی دیاریی دەکرێ، واتە: ئەگەر باسی شتێکی ڕەوابێ ڕەوایەو،ئەگەر شتێکی فەرز، یان سوننەت یەکی لەسەری بکەوێ، سوننەت، یان فەرزەو،ئەگەر نێوەڕۆکەکەیشی ناپەسند، یان قەدەغەش بێ، ئەوە ناپەسند، یان قەدەغەیە.

٢- هیچکەس گومانی لەوەدانیە،کەشتێکی ڕەوایە، باب و دایك، یان مامۆستا، هەڵسن بە دەستنوێژگرتن، یان تەیەمموم، یان سەجدەو ڕکووع بردن، بێ ئەوەی پێویستیان بێ، تاکو منداڵ، یان قوتابی فێری ئەوکردەوانە بکەن، پێغەمبەری خواش ﷺ، دوای ئەوەی لەبەرچاوی هاوەڵانی نوێژی کردوە، فەرموویەتی: ((صَلّوا كما رأيتموني أُصلّي)) رواه البخاري، واتە: وەك چۆن بینیتانم نوێژم کرد، ئاوا نوێژبکەن.

(بخاري)یش لە کتێبەکەی خۆیدا بە ژمارە (٤٥) ئەم ناوونیشانەی هێناوە[1]:

( بابُ مَنْ صلّى بالناس وهو لايريدُ إلاّ أن يُعلّمهم صلاةَ النبي ﷺ وسنّتَهُ)

واتە: باسێك، کەسێك نوێژ بە خەڵکی بکات و، تەنیا مەبەستیشی ئەوەبێ فێری نوێژی پێغەمبەر ﷺ و سوننەتەکەیان بکات.

پاشان لەژێر ناوونیشانی ناوبراودا ئەم قسەیەی لە (مالك بن الحويرث)ەوە هێناوە: (إني لأُصلّي بكم وما أُريد الصلاة، أُصلّي كيف رأيت النبيَّ ﷺ يُصلّي!)، واتە: من جاری وایە نوێژتان پێدەکەم - پێش نوێژییتان بۆ دەکەم-

---

١) (صحيح البخاري)، برقم: ٦٧٧.

بێئەوەی مەبەستم نوێژکردن بێ، بەڵکو وەك پێغەمبەرم ﷺ بینیوە نوێژی کردوە، ئاوا دەیکەم.

٣- فریشتەکان بەگشتیی‌و (جیبریل) بەتایبەتی - سەلامی خوای لێبێ-، حاڵەتی نواندنیان ئەنجامداوە، وەك خوا - عزّ وجلّ- فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ۖ قَالَ سَلَٰمٌ ۖ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۚ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾ هـود ﴾، واتە: ڕەوانەکراوانمان چوونەلای ئیبراهیم بۆ موژدە پێدانی، گوتیان: سەلامت لێ دەکەین، گوتی: سەلامتان لێبێ، ئیدی زۆری نەبرد گۆلکێکی برژێنراوی بۆ هێنان.

بەڵام کاتێك بینینی دەستی بۆ ڕاناکێشن، بە نامۆی دانان‌و ترسی لێیان ڕێنیشت، گوتیان: مەترسە ئێمە بۆلای گەلی لووط ڕەوانەکراوین.

هەروەها لەبارەی خۆنواندنی (جیبریل)ەوە بۆ مریەم، لە شێوەی پیاوێکی ڕێك‌و تەواودا، فەرموویەتی: ﴿ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَرْيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴿١٧﴾ مريم ﴾، واتە: لەکتێبدا یادی مەریەم بکەوە،کە لەشوێنێکی ڕۆژهەڵاتیی لە کەسوکاری،کەناری گرت. جا پەردەیەکی لێیان گرتەوە (بۆخۆشۆردن)، ئێمەش ڕووحی خۆمان (جیبریل)مان ناردە لای‌و بۆی چووە سەرشێوەی مرۆڤێکی تێروتەواو...

جا دیارە،ئەگەر نواندن شتێکی خراپ بوایە، فریشتەکان نەیاندەکرد.

٤- نواندن وەك پێشتر پێناسەمان کرد، بریتیە لە جۆرێك دەربڕین‌و شێوازێك لە شێوازەکانی تێگەیاندنی خەڵك، بەهۆی ئەوەوە،کە بیرۆکەیەك دەخرێتە نێو قاڵبی حاڵەت‌و کردارێکی واقیعی‌و بەرجەستەوە، ،تاکو لەجیاتی وشەو تەعبیری سەرزارەکیی، یان نووسراو، لە قاڵبێکی زیندووو بەرهەستدا بۆیان

ڕابنوێنریێو بەرجەستە بکرێ، ئنجا بێگومان هەڵبژاردنی شێوازو چۆنیەتی کاریگەرتر بۆ تەعبیرو دەربڕین، نەك هەر خراپ نیە، بگرە پەسندیشە!

٥- لەڕاستیدا نیوەڕۆکی نواندن بریتیە لە: وێچواندن (تشبیه)و لاسایی کردنەوە (تقلید)و وەك ئەوکردن (محاکاة).

دەجا قورئانو سوننەتیش شێوازی وێچواندنیان بەکارهێناوە، بۆتێگەیاندنی خەڵكو فەرمانیان کردوە بەلاسایی کردنەوەی هۆشیارانەی چاکە کارانو چاولێکردنیانو وەك ئەوان کردن، بۆ نموونە:

أ- خوای کاربەجێ ژیانی دنیا بەو ڕووەكو شینایی یە دەچوێنی،کە پاش باران بارین دەڕوێو، پاشان هەرزوو زەرد هەڵدەگەڕێو دەبێتە پووشو پەلاشو، با ڕایدەماڵێ: ﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمًا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ مُّقۡتَدِرًا (٤٥) الكهف ﴾.

ب- پێغەمبەریش ﷺ ئافرەتان بە شووشەی ناسك دەشوبهێنێ، وەك فەرموویەتی: ((رويدك يا أنجشة ،لاتكسِرِ القوارير)) متفق عليه، واتە: ئەی ئەنجەشە! لەسەرخۆبە شوشەکان نەشکێنی!

ج- خوای کاربەجێ دوای ئەوەی باسی ژمارەیەك لە پێغەمبەرانی خۆی (عليهم السلام) دەکات، پێغەمبەری کۆتایی (محمد) دەدوێنێو فەرمانی پێدەکات شوێنپێیان هەڵبگرێو چاویان لێ بکات: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ ...(٩٠) الأنعام ﴾.

د- پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی بەئوممەتەکەی کردوە،کە چاوی لێبکەنو وەك ئەو خوا پەرستیی بکەن، وەك فەرموویەتی:

* ((صلّوا كما رأيتموني أُصَلِّي)) رواه البخـاري: واتە: وەك بینیتانم نوێـژم کرد، نوێژبکەن.

* ((لتأخذوا مناسككم فإني لا أدري، لَعليِّ لا أَحُجُّ بعد حَجَّتي هذه)) رواه مسلم، برقم١٢٩٨، واتە: ئەرکەکانی حەجم لێوە فێربن، چونکە مـن نـازانم، ڕەنگە دوای ئەم حەجەم، حەجی دیکە نەکەم.

٦- هەرکام لە: (محمد بن مَسْلَمة)و (نُعَيْم بن مسعود الثقفي)و (حذيفة بن اليمان) -خوا لێیان ڕازی بێ-، بەجۆرێك لە نواندنو شانۆگەریی هەڵساون، ئەویش بە فەرمانی ڕاسـتەوخۆی پێغەمبەر ﷺ، یان بە مۆڵەتدانیو پشتگیریی کردنی، بـابزانیـن چـۆن؟!

أ- (محمـد بن مَسْلَمة).

(جابربن عبدالله) - خوا لێی ڕازی بێ- دەگێڕێتەوە،کە ڕۆژێك پێغەمبـەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ لِكَعبِ بن الأشرف؟ فأنه قـد آذى الله ورسـولَهُ))، واتە: کێ هەیە بۆ کەعبی کوڕی ئەشرەف، چونکە ئـازاری خـواو پێغەمبـەری خوای داوە؟! (محمدبن مَسْلَمة)ش گوتوویەتی: (یارسول الله أتُحِـبُّ أن أقْتُلَـهُ؟!) واتە: ئەی پێغەمبەری خوا حەز دەکەی بیکوژم؟! ئەویش دەفەرمووێ: بـەڵێ، ئەویش دەڵێ: ( إئْذَنْ لي فل اقُلْ) واتە: کەواتە مۆڵەتم بدە، کـە قسـە بکـەم! ئەویش فەرمووی: (قُلْ) بڵێ.

دیارە مەبەستی (محمدبن مَسْلمة)ش لەوەدا،کە پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی بدات قسەبکات، ئەوەبووە هەندێ قسەی وابکات، کەعبی کوڕی ئەشرەف متمانەی پێ بکاتو لێی دڵنیابێ، تاکو زەفەری پێبەرێ، وەك لەدرێـژەی بەسـەرهاتو وتووێژی نێوان (محمدبن مَسْلمة)و (كعب بن الأشرف)دا دیارە[1].

---

١) بڕوانە: (صحيح مسلم)، (٤٢) باب: قتل كعب بن الأشرف طاغوت اليهود، برقم:١٨٠١، هەروەها بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام) ج٢ص٥٤.

هیچ گومانیشی تێدانیە،کە ئەگەر موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ئەوشێوازەی بەکار نەهێنابایەو، خۆی نەخستبایە غەیری ئەو قاڵبەوە،کە هەیبووەو، بە کوردی خۆی واڕانەنواندبایە،کە لە ئیسلامو پێغەمبەر ﷺ نارازییو بێزارە، نەیدەتوانی لەکارەکەیدا سەرکەوتووبێ.

ب- نُعَيم بن مسعود الثقفي:

ئەمیش دیسان بەهۆی نواندنێکی زۆر کارامەو هونەرمەندانەوە، توانیویەتی لە جەنگی ئەحزابدا ڕۆڵێکی گرنگو کاریگەر بگێڕێ، لە لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی هاوپەیمانیەتی نێوان تیرەی جوولەکەی (بنوقريظة)دا لەلایەكو، هەردوو تیرەی بتپەرستی (قريش)و (غَطَفان) لەلایەکی دیکەوە.

ئێستاش بۆئەوەی چۆنیەتی ئەو ڕۆڵەی (نُعَيم) بزانین با گوێ بۆ (ابن هشام) بگرین، دیارە من دەقی قسەکەی (ابن هشام) وەردەگێڕم[1]:

(نوعەیمی کوڕی مەسعوود هاتە لێی پێغەمبەر ﷺو گوتی:

ئەی پێغەمبەری خوا! من مسوڵمان بووم‌و گەلەکەشم بە مسوڵمان بوونمیان نەزانیوە، جاچیت حەز لێیە فەرمانم پێ بکە!

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: تۆ تەنیا یەك پیاوی لەنێوماندا،بەلاّم ئەگەر دەتوانی دوژمنانمان لەدەور پەرتەوازە بکە، چونکە: جەنگ فێڵە.

ئیدی نوعەیمی کوڕی مەسعوود هەڵسا چووەلای بەنی قورەیظە، کە لە سەردەمی نەفامییدا هاوکۆڕیان بوو، گوتی: هۆ بەنی قورەیظە! خۆشەویستی من بۆخۆتانو پەیوەندیی تایبەتیم لەگەڵتان دەزانن! گوتیان: ڕاست دەکەی، تۆ لەلای ئێمە تۆمەتبارنی، گوتی: قورەیشو غەطەفان حاڵیان وەك هی ئێوە نیە، وڵات وڵاتی خۆتانە، ماڵو سامان و کوڕانتانو هاوسەرانتانی لێیەو، ناشتوانن بەجێی بهێڵنو بۆشوێنێکی دیکە بچن، قورەیشو غەطەفانیش بۆجەنگی

---

١) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هاشم)، ج٢، ص٢٢٩-٢٣٢.

موحەممەدو هاوەڵانی هاتوونو، ئێوەش پشتگیرییتان کردوون لەدژی وی،بەلاَم وڵاتوماڵو سامانو خێزانیان لە شوێنێکی دیکەیەو، وەك ئێوەنین، بەڵکو، ئەگەر هەلێکیان دەستکەوت، دەیقۆزنەوەو، ئەگەر شتێکی دیکەش بوو دەگەڕێنەوە وڵاتی خۆیانو، ئێوەو ئەو پیاوەش پێکەوە بەجێ دەهێڵن، دیارە،ئەگەر هەر ئێوەو ئەویش بن، پێی ناوێرن، بۆیە بەشداریی جەنگیان لەگەڵ مەکەن، هەتا هەندێك لە سەرانیان بە بارمتە لێوەرنەگرن،کە لەبەردەستتان بن،تاکو متمانەتان هەبێ، کە لەگەڵیان بن لە جەنگی دژی موحەممەددا!

گوتیان: بەڕاستی ڕایەکەت ڕاستە!

پاشان دەرچوو، هەتا هاتەلای قوڕەیشو بە ئەبووسوفیانی کوڕی حەڕبو، ئەوانەی لەگەڵیبوون لە پیاوانی قوڕەیش، گوتی: خۆتان ئاگاداری خۆشەویستی من بۆخۆتانو وازهێنانم لە موحەممەد هەن، ئێستاش هەواڵێکم پێگەیشتوە بەپێویستم زانی وەك دڵسۆزییەك پێتان ڕابگەیەنم،بەلاَم، با پەنهان بێ!

گوتیان: وادەکەین!

گوتی: بزانن،کە کۆمەڵی جوولەکە لەنێوان خۆیانو موحەممەددا لەوە پەشیمان بوونەتەوە،کە کردوویانەو ئاگاداریشیان کردۆتەوە: کە ئێمە پەشیمانین لەوەی کردوومانە، جا ئایا بەوە ڕازی دەبی،کە لە هەردووك تیرەی قوڕەیشو غەطەفان چەند پیاوێك لە ناودارانیانت بۆ وەربگرینو تەسلیمت بکەینو لە گەردنیان بدەی، پاشان لەگەڵت یەکدەست بین لەسەر ئەوانەی دیکەیان،هەتا لەبنیان دێنین؟!

ئەویش ئاگاداری کردوونەوە،کە بەڵێ ڕازیم!

جا،ئەگەر هاتوو جوولەکە ناردیانەلاتان بۆ بارمتەیەك لە پیاوانتان، ئەوە یەك پیاویشیان تەسلیم مەکەن.

ئنجا دەرچوو،هەتا چووەلای غەطەفانو گوتی: ئەی کۆمەڵی غەطەفان! ئێوە ڕیشەو تیرەی منن،و، خۆشەویستترین خەڵکن لەلام، پێشم وانیە لێم بە گومان

بن! گوتیان: ڕاست دەکەی گومانمان لێت نیە، گوتی: دەجا با پەنهان بێ، گوتیان، باشە وادەکەین، چیت پێیە؟! ئەویش ئەوەی بە قورەیشی گوتبوو پێی گوتن‌و، زۆریش ترساندنی‌و وریای کردنەوە.

ئنجا هەرسێك لایەن بەوجۆرەیان کرد، کە نوعەیمی کوڕی مسعوود بۆی پێشنیارکردن‌و، خوا بەهۆیەوە دوژمنانی موسڵمانانی پەرتەوازە کرد و، ئاژاوەیان،کەوتە نێوان، خواش بەشەوێ بایەکی نارده سەریان، ئیدی سوپێیەکانیان پرژوبڵاو بوون).

هیچ کەسیش ناتوانێ نکوولّیی لەوە بکات، کە نوعەیمی تازە مسولّمان -خوا لێی ڕازی بێ-، وەك ئەکتەرێکی زۆر کارامە، گرینگترین ڕۆڵی گێڕا لەوکاتە دژوارو هەستیارەی جەنگی خەندەکدا، ئەویش بەهۆی ئەوەوە،کە خۆی بردۆتە سەر فۆرم‌و شێوەی مەعنەویی،کەسێیەتییەکی دیکەی جیا لەوەی خۆی،تاکو لەو جەنگە دەروونیەدا،کە پێغەمبەر ﷺ بە جەنگ فێڵە (فإنَ الحرب خُدْعة)ی ناوبردوە، سەرکەوتووبێ !

ج- حُذَیفــة بن الیمـان :

ئەمیش کاتێ پێغەمبەر ﷺ دەینێرێ بۆ زانینی هەواڵی قورەیش، لە جەنگی ئەحزابدا ئاوا هەڵوێستەکەی خۆی دەگێڕێتەوە[1]:

(فَذَهبتُ فَدخَلْتُ في القوم والريحُ وجنود الله تفعل بهم ماتفعلُ، لاتُقِرُّهم قِدْراً ولا ناراً ولا بناءً، فقام أبو سفيان، فقال يامعشر قريشٍ، لِيَنْظُرْ اُمروٌ مَنْ جَليْسُهُ - صاحبه-؟، قال حذيفة: فأخذت بيد الرجل الذي كان الى جنْبـي، فقلت: مَنْ أنت؟! قال، فُلان بن فلانٍ)، واتە: جا ڕۆیشتم ،هەتا چوومە نێوخەڵکەکە لەحاڵێکدا،کە (با)و سەربازەکانی خوا ئەوەیان پێدەکردن،کەپێیان دەکردن، کە نەیدەهێشت نە مەنجەڵ ڕابوەستێ، نە ئاگر بئایسێ، نە چادر دابمەزرێ، ئنجا ئەبوسوفیان هەڵساو گوتی: ئەی خەڵکی قورەیش، با هەرکەسە هاوەڵەکەی

---

١) (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٢ ص٢٢٨-٢٣٢.

بناسێ، حوذەیفە دەڵێ: منیش یەکسەر دەستی ئەو پیاوەی تەنیشتمم گرتو گوتم: تۆ کێی؟! گوتی: فلاَنکەسی کوڕی فلاَنکەس!

کەواتـــــە:

حوذەیفەش وەك هەرکام لە موحەممەدی کوڕی مەسـلەمەو نوعـەیمی کـوڕی مەسعود، واخۆی پیشانی دوژمنەکانی داوە،کەیەکێکە لەوان، نەك هەر دۆستو دڵسۆزیان!

## پوختـەی مەبەسـت:

هیچ ڕێگرێکی شەرعیی لەبەردەم نواندنـدا نیە ،جگە لە ڕەچاوکردنی ئەوە،کە پێویستە نێوەڕۆكو چۆنیەتیو ئامانجەکەی دژو پێچەوانەی شەریعەت نـەبێ، کـە دیارە ئەمەش مەرجی سەرجەم هەڵسوکەوتەکانە.

پێویستە ئەوەش بگوترێ، کە لە حاڵەتی بینرانی ڕۆڵی بابایـەکی کـافر، یـان ستەمکار، یان گوناهبـاردا، لەلایـەن ئەکتـەر (ممثِّل)ەوە، دەبـێ ئاگـاداری دڵو دەروونی بێ، کە قەناعەتی پێچەوانەی شەریعەتی تێدا پەیـدا نـەبێ، ئنجـا وەك کـردەوەش، نابـێ هـیچ ڕەفتـارێکی ناشـەرعییو گونـاه ئـەنجام بـدات، وەك: مەیخواردنەوەو زیناو...هتـد، بـەڵام لـە قسـەکردندا مۆڵـەت هەیـە، بـەگوێرەی پێویستو بەومەرجانەی خستماننەڕوو.

خوێنــەری ســـەنگین!

ئەم بەشە، لە سێ باسان پێکدێ، کە ئەمە ناوونیشانەکانیانە:

باسی یەکەم: پێناسەو جۆرەکانی وەرزش و یاریی.

باسی دووەم: حوکمی وەرزش و یاریی بەگشتیی.

باسی سێیەم: حوکمی جۆرەکانی وەرزش و یاریی.

## باسی یەکەم: پێناسەو جۆرەکانی وەرزش و یاریی:

### یەك: پێناسەی وەرزش و یاریی :

دیارە هەرکام لە وەرزش‌و یاریی، پێکەوە پەیوەستبوون‌و تێکەڵییەکی زۆریان هەیەو دەتوانین بڵێین: هەمووجۆرەکانی یاریی وەرزشن‌و، زۆربەی هەرەزۆری جۆرەکانی وەرزشیش یاریین.

وشەی وەرزشیش، کە بەرانبەرەکەی لە زمانی عەرەبییدا (ریاضة)یە، واتایەکەی ڕوونەو بریتیە لە هەر جموجۆڵێکی ڕێك‌و پێك، کە ببێتە مایەی بەهێزبوون‌و ڕاهاتنی جەستە، وەك یەکێك لە پسپۆڕانی زمان لەوبارەوە گوتوویەتی:

(الرِّياضة البدنيـة، القيام بحركاتٍ خاصةٍ تُكْسِبُ البَدَن قُوَّةً ومُرونَـةً)[1].

وشەی (یاریی)یش، کە بەرانبەرەکەی لە زمانی عەرەبییدا (لَعِب)ەو وشەی (گەمە)شی بۆ بەکاردێ، دەتوانین لە پێناسەکەیدا بڵێین: بریتییە لە هەرجۆرە خۆخافڵاندن‌و کات بەسەربردنێك، هەربۆیەش خوای کاربەجێ وشەی (لعب‌و لهو)ی لە قورئانێدا چەندان جار پێکەوە هێناون‌و، ڕەنگە جیاوازیشیان زیاتر ئەوەبێ، کە یاریی (لعب) بەپێچەوانەی خافڵان (لهو)ەوە، بەبێ ئامڕاز (وسیلة) ناکرێ.

یەکێك لە پسپۆڕانی زمانیش لە پێناسەی (یاریی)دا گوتوویەتی:

(لَعِبَ، عَمِلَ عَمَلاً لايُجْدي عليه نَفْعاً، ضِدُّ جَدَّ)[2].

ئنجا شتێکی ئاشکراشە، کە مانای هەرکام لە وەرزش‌و یاریی لەم ڕۆژگارەمانداو لە عورف‌و باوی ئێستاماندا، زۆر ڕۆشنەو ڕەنگە لە هیچ چاخ‌و

---

١) المعجم الوسيط، ص٣٨٢.

٢) هەمان سەرچاوە، ص٨٢٧.

سەردەمێکیشدا وەرزش‌و یارییەکان، بەهەموو جۆرو شێوەکانییانەوە، هێندەی ئەم ڕۆژگارەمان پەرەیان نەستاندبێ‌و ڕمێنیان پەیدانەکردبێ، کە دیارە سەرگەرمبوونی ژیانی ماددیی‌و بێئاگابوون لە دوارۆژو کەمبوونەوەی جیددێتی، هۆکاری گرنگی ئەو دیاردەیەن.

## دووەم: جۆرەکانی وەرزش و یاریی :

لەڕاستیدا لەم ڕۆژگارەماندا جۆرەکانی یاریی‌و وەرزش هێندە زۆر بوون، زەحمەتە ناوی هەموویان بهێنرێ، بەتایبەتیش، کە زۆربەی گەل‌و کۆمەڵگایەکان زۆر یاریی‌و وەرزشی تایبەت بەخۆیان هەیەو، بەردەوامیش لە گۆڕان‌و زیادبووندان، بەڵام دەتوانین ئاماژەیەکی خێرا بە سەرەکییەکانیان بکەین:

١- سوارچاکیی، کە جاران بە ئەسپ‌و حوشترو ئێستر بوو، ئێستا بە سەیارەو ماتۆڕو پایسکل‌و بەلەم‌و....هتد.

٢- مەلەوانیی .

٣- ڕاکردن‌و بازدان .

٤- زۆرانبازیی (مصارعة).

٥- شەڕە مست (ملاكمة).

٦- شەڕە شمشێر.

٧- تیراندازیی.

٨- گوریس پچڕکێنە.

٩- خلیسکان لەسەر بەفر.

١٠- یارییەکانی تۆپ: تۆپی پێ، باڵە، باسکە، بلیارد، تێنس..

١١- جومناستیك .

١٢- یارییە جەنگییەکان: جۆدۆ، کاراتە، کۆنفۆ، کیك بۆکسینگ...

١٣- شتی قورس هەڵهێنان (رفع الأثقال).

١٤- لەشجوانیی (كمال الأجسام).
١٥- یارییەکانی هزر: شەترەنج، دامە، دۆمینە، قومار، تاوڵە..
١٦- یاریی کردن بە ئاژەڵو پەرەوەرەکان: وەك: ورچ، مەیموون، فیل، شێر، پڵنگ، دۆلفین، شەڕە کەڵەباب، شەڕە سەگ، شەڕە بەران، شەڕە گا، شەڕە کەو...
١٧- یارییە کۆمپیوتەرییەکان .
١٨- یارییە جادووییەکان (الألعاب السحرية)و نیمچە جادووییەکان.

## باسی دووەم: حوکمی وەرزش و یاریی بەگشتیی:

بینا لەسەر ئەو بنەماشەرعییەی،کە زانایانی ئیسلام لەسەری ڕێککەوتوون و، چەند جارێکیش ئاماژەمان پێکرد، کە دەڵێ: (بناغە لە هەڵسوکەوتەکاندا ڕەوایی و دەست کراوەیی یە) (الأصل في المعاملات الأباحة والعفو)، دەڵێین: وەرزش و یاریی بەگشتیی، لە بابەتی عادەت و هەڵسوکەوتن، بۆیە ئەسڵ تێیاندا ڕەوایی و دەستکراوەیی یە، مەگەر شتێك لەگەڵ دەقێکی ڕوون و بێ چەندو چوونی قورئان و سوننەتدا تێك بگیرێ، بۆ نموونە:

یاریی و وەرزشێك،کە ئەگەری زۆری هەبێ ببێتە مایەی تێداچوونی مرۆڤ، یان سەقەت بوونی، یارییە جادووییەکان و، یاری قومارو یانسیب ...

ئنجا وێڕای ئەم بنەما شەرعییەی خستمانەڕوو، چەندان دەقی قورئان و سوننەتیش بەڕوونیی و ڕاشکاویی ڕەوایی یاریی و وەرزش دەگەیەنن، جا ئێمە هەوڵدەدەین ژمارەیەك لەو دەقانەی قورئان و سوننەت بە نموونە بێنینەوە، هەم وەك بەڵگەیەك لەسەر ڕەوایی وەرزش و یاریی بەگشتیی و، هەم بۆزیاتر بەرچاو ڕوونبوونەوەشمان لەبارەی حوکمی تایبەتی هەندێك لە جۆرەکانی وەرزش و یاریی:

١- ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ ...﴿٦٠﴾ الأنفال﴾، واتە: ئەوەندەی دەتوانن لە هێز بۆیان

ئامادە بکەن، هەروەها لە ئەسپانی مەشق پێکراوو ئامادە، کە دوژمنی خواو دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن...

٢- ﴿ قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۫نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَـٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ يوسف ﴾، واتە: گوتیان ئەی بابی خۆمان! بۆچی سەبارەت بە یوسف لێمان دڵنیانی، هەرچەندە زۆریش بۆی دڵسۆزین؟ بەیانی لەگەڵمانی بنێرە خۆشبگوزەرێنێو یاریی بکات، ئێمەش بێگومان پارێزەرینی..

٣- ﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ ...﴿٢٠﴾ الحديد ﴾، واتە: بزانن،کە ژیانی دنیا -لەڕووە مادديیەکەیەوە -تەنیا یاریی‌و خافڵانو جوانییو، لەنێو خۆتاندا شانازیی بەسەرێکداکردنو خۆیەسەریەکدا هەڵکێشانە لە سامانو منداڵاندا، وەك بارانێك،کە ڕووەکەکەی، جوتیاران سەرسام دەکات، پاشان پێدەگاتو وشك هەڵدێو دەیبینی زەرد هەڵگەڕاوەو، دواییش دەبێتە پووشو پەڵاش...

٤- ((... فإن لجسدك عليك حقاً وان لعينك عليك حقاً وان لزورك عليك حقاً وإن لزوجك عليك حقاً)) متفق عليه من عبدالله بن عمرو بن العاص، واتە: چونکە بێگومان جەستەت مافی لەسەرتە، چاوت مافی لەسەرتە،میوانت مافی لەسەرتە، هاوسەریشت مافی لەسەرتە.

٥- ((المؤمن القوي، خير وأحبُّ الى الله من المؤمن الضَّعيف، وفي كل خيرٌ)) رواه مسلم، واتە: بڕواداری بەهێز چاکترەو لەلای خوا خۆشەویسترە لە بڕواداری بێهێز، هەردووکیشیان هەرباشن.

٦- ((كل شئ لَيْس من ذكر الله - عزّ وجلّ- فهو لَهوٌ أو سهْوٌ الاّ أربع خِصالٍ: مَشْيُ الرجل بين الغَرضَيْنِ، وتأديبه فَرَسَهُ، وملاعبَته أهله، وتعليمه السِّباحة)) رواه الطبراني في الأوسط والكبير، والبزار ورجال الطبراني رجال الصحيح، واته: هەرشتێك لەیادی خوای زاڵو شكۆدار نەبێ، ئەوە خافلان، یان بێئاگاییە، جگە لە چوار سیفەتان: هاتنو چوونی كابرا لەنێوان دوو نیشانەكاندا، مەشقكردنی بە ئەسپەكەی، یارییو گەمەكردنی لەگەڵ خێزانیدا، مەلەوانی فێركردنی - بۆ غەیری خۆی-.

٧- ((عن عائشة رضي الله عنها قالت: خرجت مع النبي ﷺ في بَعض أسفاره وأنا جاريةٌ لَمْ أَحْمِلِ اللَّحْمَ، ولَمْ أَبْدُنْ، فقال للناس: تقدّموا، فتقَدَّموا، ثم قال لي: تعالي أُسابِقُكِ، فسابَقْتُهُ فَسَبَقْتُهُ فسَكتَ عَنيٍّ، حتى اذاحَمَلْتُ اللَّحْمَ وَبدُنْتُ و نَسيْتُ، خرجْتُ مَعَه في بعض أسْفاره، فقال للناس: تقدَّموا، فتقدَّموا، ثم قال لي، تَعالي أُسابِقُكِ، فَسابَقْتُهُ فَسَبقَني، فَجَعل يَضْحَك وهو يقول: هذه بِتلك)) رواه أبوداود وأحمد وابن ماجه، واته: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: بۆ سەفەرێك لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچووم، ئەوكاتە كچێك بووم، گۆشتم نەگرتبوو و قەڵەو نەبوو بووم، جا بە خەڵكەكەی فەرموو: پێش بكەون، ئەوانیش بەرەو پێش ڕۆیشتن، ئنجا پێی فەرمووم: وەرە، با پێشبڕكە بكەین! ئیدی پێشبڕكەم لەگەڵ كردو پێشی كەوتمەوە، ئەویش ماوەیەك لێم بێدەنگ بوو،هەتا كاتێك،كە گۆشتم گرتو قەڵەوبووم، منیش ئەوەی ڕابردووم لەبیر نەمابوو، بۆ سەفەرێك لەگەڵی چووم، بە خەڵكەكەی فەرموو: بڕۆن، ئەوانیش بەرەو پێش ڕۆیشتن، ئنجا پێی فەرمووم: وەرە با پێشبڕكە بكەین، ئیدی پێشبڕكەمان كردو پێشم كەوتەوە، ئەویش پێكەنیو فەرمووی: ئەمەیان بەو جارەی دیكە!

٨- ((مرَّ رسول الله ﷺ على نفرٍ مِنْ أَسْلَمِ يَنْتَضِلون، فقال: إرموا بني إسماعيل فأن أباكم كان رامياً، إرمُوا وأنا مع بني فُلانٍ -لأحد الفريقين- فأمسكوا أيديهم، فقال: مالكم لا ترمون؟! قالوا: وكيف نَرْمي وأنت معهم! قال: إرْمُوا

وأنا معكم كلكم)) رواه أحمد والبخاري، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای چەند کەسێك لە - تیرەی- ئەسلەمدا ڕەتبوو تیراندازییان دەکرد، فەرمووی: بهاوێن ئەی وەچەی ئیسماعیل! باپیشتان تیرهاوێژ بووە، بهاوێن‌و منیش لەگەڵ فلان دەستەیەم - بە یەکێك لە دوودەستەکانی فەرمووـ، ئەوانی دیکەش دەستیان گرتەوە، فەرمووی: ئەوە بۆچی ناهاوێن؟! گوتیان: جاچۆن باوێین،کە تۆ لەگەڵ ئەوان بی! ئنجا فەرمووی: بهاوێن‌و منیش لەگەڵ هەردووك لاتانم.

٩- ((عن أنس رضي الله عنه قال: كان للنبي ﷺ ناقَةٌ تُسَمّى العَضْباءَ، لا تُسْبَقُ -قال حُمَيْد: أولا تكاد تُسْبَقُ-، فجاءَ أعرابي على قعودٍ فَسَبَقها، فَشَقَّ ذلك على المسلمين، حتى عَرَفَهُ: فقال ﷺ: حق على الله أن لايَرتَفِعَ شيءٌ في الدنيا الاّ وَضَعَهُ)) رواه البخاري والنسائي، واتە: پێغەمبەر ﷺ حوشترێکی هەبوو (عەضباء)ی پێ دەگوترا، پێشی لێ نەدەستێنرا -حومەید گوتوویەتی: یان نزیك بوو پێشی لێ نەستێنرێ- جارێك ئەعرابیەك بە سواری حوشترێکی چوار پێنج ساڵە هات‌و پێشی کەوتەوە، مسوڵمانانیش زۆریان پێناخۆش بوو،هەتا هەستی پێکرد، ئەوجار ﷺ فەرمووی: خوا لەسەر خۆی پێویست کردوە،کە هیچ شتێکی دنیا بەرز نەبێتەوە مەگەر نزمی بکاتەوە!

١٠- ((عن أبي هريرة رضي الله عنه: بَيْنا الحَبَشة يَلْعبون عند النبي ﷺ بِحِرابِهِمْ دَخَلَ عُمَرُ فأهْوى الى الحصى فَحَصَبَهُمْ بها، فقال ﷺ: دَعْهُمْ ياعُمَرُ!)) متفق عليه، واتە: لەکاتێکدا،کە حەبەشەییەکان لەلای پێغەمبەر ﷺ بەنێزەکانیان یارییان دەکرد، عومەرهات‌و داهاتەوە دەنکە چەوان،کە پێیاندا بدات، ئەویش ﷺ فەرمووی: عومەر وازیان لێبێنە!

١١- ((مرّ رسولُ الله ﷺ بقومٍ يَربَعُون حَجَراً لهم، فقال: ما هذا الحجر؟! قالوا: هذا حَجَرُ الأشِداّء، فقال لهم: ألا أقول لكم ماهو أشَدُّ منه؟ قالوا: بلى، قال: الذي يمتلِيءُ غضباً ثم يَصْبِرُ)) رواه مالك، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای کۆمەڵێکدا ڕەتبوو، کە بەردێکیان بڵند دەکرد، فەرمووی: ئەم بەردە چی‌یە؟!

گوتیان: ئەوە بەردی پاڵەوانانە! ئەویش پێی فەرموون: ئایا شتێکتان پێ بڵێم لەوە قورسترِبێ؟ گوتیان: با، فەرمووی: ئەوکەسەی،کە پڕ دەبێ لە تووڕەیی و ئارامیش دەگرێ -واتە: ئەوکەسە پاڵەوانترو بەهێزترە لە بڵندکەری ئەوبەردە-.

١٢- ((عن سعيد بن جبير رحمه الله: أن رسول الله ﷺ كان بالبَطْحاء، فأتى عليه رُكانَةُ بن يزيد ومَعَه قطيعٌ من الغَنَم فقال له: يامحمد! هل لك أن تُصارِعَني؟ فقال: ماتُسَبِّقُني[1]؟! قال: شاةً من غَنمي، فَصارعَهُ فَصرعَهُ النبي ﷺ، فأخذ شاةً من غَنَمِه، قال ركانة: هل لك في العود؟ قال: ماتُسَبِّقُني؟! قال: أخرى، ذكر ذلك مِراراً وفي كل مَرَّةٍ كان رسولُ الله ﷺ يَصْرعُهُ، فقال رُكانة: يامحمد! والله ماوضَعَ أحدٌ جَنبي الى الأرض، وما أنت بالذي تَصْرَعُني، فأسلم رُكانة، فَردَّ عليه رسول الله ﷺ غَنَمَهُ)) رواه أبوداود والحاكم، واته: جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لە - دەشتی- بەطحاء بوو، ڕوکانەی کوڕی یەزید بە ڕانە مەڕێکەوە بەلایدا ڕەتبوو، پێی گوت: هۆ موحەممەد! زۆرانبازییم لەگەڵ ناکەی؟ ئەویش فەرمووی: جا ئەگەر لێم بردیەوە، چیم دەدەیە؟ گوتی: مەڕێك لە ڕانەکەم! ئیدی زۆرانی لەگەڵ کردو، پێغەمبەر ﷺ خستیو مەڕێکی لە ڕانەکەی وەرگرت، ڕوکانە پێی گوت: دووبارەی ناکەیەوە؟ ئەویش فەرمووی: چیم دەدەیە؟ گوتی: مەڕێکی دیکە، ئیدی چەند جارێك ئەو داوایەی کردو هەموو جارێکیش پێغەمبەری خوا ﷺ دەیخست! ئنجا ڕوکانە گوتی: ئەی موحەممەد! بەخوا هیچکەس پشتی لە زەوی نەداوم، تۆش بەهێزی خۆت نیە دەمخەی! ئیدی ڕوکانە مسوڵمان بووو، پێغەمبەری خواش ﷺ مەڕەکانی دایەوە.

دیارە ڕەوایی وەرزش و یاریی لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەت و فەرمایشتانەدا، وەك ڕۆژی ڕوون دیارە، بگرە جاری وایە هەندێك لە جۆرەکانیان سنووری ڕەوایی

---

١) السَّبَقُ: مايتراهَنُ عليه المتسابقون، سَبَّقَ: أخَذَ السَّبَقَ.. (المعجم الوسيط)، ص٤١٤-٤١٥.

هەڵدەبوێرن‌و دەچنە ئاستی فەرزو سوننەتیشەوە، ئەویش لەکاتێکدا جێبەجێ‌کردنی فەرزێك، یان سوننەتێك پەکی لەسەریان دەکەوێ.

ئێستاش بابچینە سەر باسی سێیەم، تاکو حوکمی هەرکام لە جۆرەکانی وەرزش‌و یارییمان باشتر بۆ ڕوون بێتەوە:

## باسی سێیەم: حوکمی جۆرەکانی وەرزش و یاریی:

خوێنەری بەڕێز!

ئێمە بۆ ئاسانکاریی خستنەڕووی هەڵوێستی شەرع - بەڕای بەندە- لە بەرانبەر جۆرەکانی یاریی‌و وەرزشدا، پۆلێنمان کردوون بۆ هەشت جۆر، بەم شێوەیەی خوارێ:

**جۆری یەکەم : ئەوانەی،کە لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا کراون‌و ڕەخنەی لێ نەگرتوون : وەك :**

١- (سوارچاکیی)،کەپێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی بەشداریی تێدا کردوە وەك لەدەقی ژمارە(٩)دا هاتوە.

٢- (ڕاکردن)،کەئەمیش پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ عائیشەی هاوسەریدا کردوویەتی، وەك لە دەقی ژمارە (٧)دا هاتوە.

٣- (تیراندازیی)،کەپێغەمبەر ﷺ مسوڵمانانی بۆ هانداوە، وەك لە دەقی ژمارە (٨)دا هاتوە، بەڵکو جاری وایە مەشقکردن لەسەر تیراندازیی سوننەتە‌و، بگرە فەرزیش دەبێ، چونکە (عقبة بن عامر) -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ، بوو لەسەر مینبەر دەیفەرموو: ((وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ ألاَ إنَّ القوة الرَّميُ، ألا ان القوة الرمي، ألا إنَّ القوة الرمي)) رواه مسلم، کەواتە: پێغەمبەر ﷺ ئەو هێز ئامادەکردنەی،کە خوا- عزّو جلّ- لە ئایەتی ژمارە (٦٠)ی (الأنفال)دا فەرمانی پێدەکات بە

(تیراندازیی) تەفسیر کردوە، کە دیارە ئەویش بەکارهێنانی سەرجەم چەکە قورس و سووکەکان دەگرێتەوەو دیارە بەبێ مەشق و ڕاهێنانیش، بەکارهێنانی چەك ئامانجی خۆی ناپێکێ، ئاشکراشە، کە هەرشتێك فەرزێك پەکی لەسەر بکەوێ، ئەویش فەرز دەبێ، وەك بنچینەی شەرعیی دەڵێ: (ما لا يتم الواجب إلا به فهو واجب).

٤- (زۆرانبازیی)،کەئەمیش لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ زۆربووەو خۆیشی لەگەڵ (ركانه بن يزيد)دا زۆرانی گرتوە، وەك لە دەقی ژمارە (١٢) هاتوە.

٥- (شەڕە نێزە) ئەمیش لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ بووە، وەك لە دەقی ژمارە (١٠)دا هاتوە، دیارە شەڕە شمشێریش لەگەڵ شەڕەنێزەدا یەکن.

٦- (شتی قورس هەڵهێنان)، کە ئەمیش وەك لە دەقی ژمارە (١١)دا هاتوە پێغەمبەری خوا ﷺ دانی پێدا هێناوە لەکاتێکدا، کە لەبەرچاوی ئەنجامدراوە، بەڵام خەڵکەکەشی هانداوە بۆ بەهێز کردنی لایەنی مەعنەویی و ئەخلاقیی.

٧- (مەلەوانیی) ئەمیش پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕیزی ئەو یاریی و وەرزشانەی حیساب کردوە،کە پەسندو باشن و پاداشتیان لە بەرامبەردا هەیە، وەك لەدەقی ژمارە (٦)دا هاتوە[1].

## جۆری دووەم: ئەوانەی،کە سروشتێکی جەنگاوەرانەیان هەیەو چەمکی هێز ئامادەکردن دەیانگرێتەوە : وەك :

١- (شەڕەمست (ملاكمة)).

٢- جۆدۆ .

٣-(کاراتە) .

١) الشوكاني لە (نيل الأوطار)داو لەژێر ناوونیشانی (أبواب السَّبق والرمي)دا ژمارەیەکی زۆر دەقی سوننەتی هێناون لەویارەوە، بڕوانە ج٨، ص٨١-٩٨.

٤- (کۆنفۆ) .

٥- (کیك بۆکسینگ) .

ئەمجۆرە یاریی‌و وەرزشانە، هەرچەندە لە دەقەکانی سوننەتدا ناویان نەهاتوە لە سۆنگەی ئەوەوە،کە لە ڕۆژگارو کۆمەڵگای پێغەمبەردا نەبوون،بەلاّم بێگومان چەمکی: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ ﴿٦٠﴾ الأنفال﴾، چەمکی: ((المؤمن القوي خير وأحب الى الله من المؤمن الضَّعيفٌ))،کەلە دەقی ژمارە (٥)دا هاتوە، دەیگرنەوە.

ئەوەندە هەیە پێویستە لەوجۆرە یاریی‌و وەرزشانەدا، وریایی هەبێ‌و پارێز لەوە بکرێ، ببنە مایەی تێداچون، یان سەقەت بوونی بابای وەرزشوان‌و یاریی چی، چونکە ئەوکاتە بەئەندازەی هەبوونی مەترسیی، ئەو جۆرە یاریی‌و وەرزشانە حوکمیان‌لە ڕەوایی‌یەوە بەرەو ناپەسندیی‌و قەدەغەیی دەچێ، بە زۆر بەڵگان، بۆ نموونە:

أ- ﴿...وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ النساء﴾، واتە: ... خۆتان مەکوژن، بێگومان خوا لەگەڵتان میهرەبانە.

ب- ((لاضَرَرَ ولاضِرارَ، وَمَنْ ضارَّ، ضارَّه الله، ومَنْ شاقَّ، شاقَّ الله عليه)) رواه الحاكم عن أبي سعيد الخدري وقال هذا حديث الصحيح الأسناد على شرط الشيخين، واتە: دەستپێشخەربوون لە زیانگەیاندنداو لە بەرانبەر زیاندا، زیان بە خەڵك گەیاندن دروست نیە، هەرکەسێ خەڵکی تووشی زیان بکات، خوا زیانی لێدەداتو، هەرکەسێك خەڵك تووشی نارەحەتیی بکات، خوا نارەحەتی دەکات.

**جۆری سێیەم: ئەوانەی،کە لە شێوەی ئەو یاریی‌و وەرزشانەدان،کە لە سوننەتدا باسکراون، وەك :**

١- (گوریس پچڕکێنە).
٢- ( خلیسکان لەسەر بەفر).
٣- ( جومناستیك).
٤- ( لەشجوانیی).

ئەوەندە هەیە بۆ جومناستیك‌و لەشجوانیی -وەك هەر یاریی‌و وەرزشێکی دیکە- پێویستە ڕەچاوی داپۆشینی عەوڕەت بکرێ، دوایش باسی سنووری عەوڕەتی پیاوو ئافرەت دەکەین.

## جۆری چوارەم: یارییەکانی تۆپ بە هەموو جۆرەکانییەوە :

یارییەکانی تۆپ (ألعاب الكرة) لەم ڕۆژگارەدا زۆر جۆرن، بۆ نموونە:
١- (تۆپی پێ).
٢- (بالە).
٣- (باسکە).
٤- (بلیارد).
٥- (تێنس).

ئەم یارییانەش لەخودی خۆیاندا، هیچ ناشەرعییەکیان تێدانیە، ،بەلاّم گرنگ ئەوەیە لەلایەکی دیکەوە ناشەرعییان تاوێتە نەبێ، وەك:

زۆر پێوە سەرگەرم بوونیان‌و ئەرکی شەرعیی لەسەرچواندنیان‌و، دەمارگیریی هەبوون بۆتیپێك، یان ولاّتێك‌و بنیاتنانی دۆستایەتی‌و دوژمنایەتی لەسەری!

## جۆری پێنجەم: یارییە هزرییەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە، وەك :

١- (شەترەنج) .
٢- (دامە).

٣- (دۆمینـــه).
٤- (پرســیارو وەڵام).
٥- (تاوڵـــه).
٦- (قومـــار).
٧- (یانســـیب).

زانایان لەبارەی ئەم جۆرە یارییانەوە بەگشتیی، مشتومڕیان هەیە، بەڵام من بینا لەسەر ئەسڵی: (بناغە لە هەڵس‌وکەوتەکاندا ڕەواییە)و نەبوونی هیچ دەقێکی قورئانو سوننەت لەسەر قەدەغەبوونی ئەو شتانە، وەك (ابن كثير) لـەبارەی ئـەو دەقانەوە،کە دەربارەی شەترەنج هاتوون، گوتوویەتی: (والأحاديث المروية فيه لايصحّ منها شيء)[1]، پێم وایە،کە (شەترەنج)و (دامە)و (دۆمینە)و هاووێنەکانیان مادام لەسەر پارەو شت نەبن، ڕەوان، یان ئەوپەڕی ناپەسند (مكروه)ن، دیارە بەمەرجێك ئەرکە شەرعییەکانیان لەسەر نەچوێنرێن. زانایـان هـەموویان لەسـەر ڕەوایـی (پرسیارو وەڵام) ڕێککەوتوون، زۆربەیان تاوڵە (نَرْد) ،ئەگەر لەسەرشتیش نـەبێ، هەر بە حەرام دەزانن، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((مَن لَعِبَ بالنردشير فكأنّما صَبَغَ يَدَهُ في لحم الخنْزيرِ ودَمِهِ)) رواه مسلم، واتە: هەرکەسێك یاریی بە تاوڵە بکات، وەك ئەوە وایە دەستی خستبێتە نێو گۆشتو خوێنی بەرازەوە[2].

هەرچەندە واپێدەچێ حەرامبوونەکەی تایبەت بێ بـە حاڵەتێکەوە،کـە لەسـەر پارەو شت بکرێ. (قومار)و (یانسیب)یش هەموو لایەك لەسەر قەدەغـەبوونیان یەکدەنگن، چونکە:

أ- خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ المائدة﴾، واتە: ئەی

١) بڕوانە: (نيل الأوطار)، ج٨، ص١٠٠.
٢) بڕوانە: (نيل الأوطار)، ج٨، ص٩٩.

ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بێگومان مەیو قومارو صەنەمەکانو یانسیب پیسن لە کردەوەی شەیطانن، دەجا لێیان دووربکەونەوە بەڵکو سەرفرازبن.

بۆیەش وشەی (الأنصاب)م بە صەنەمەکانو (الأزلام)م بە یانسیب لێکداوەتەوە، چونکە (ابن کثیر) لە (ابن عباسو مجاهدو عطاءو سعید بن جُبَیرو حسن البصري)یەوە هێناویەتی،کە گوتوویانە: (الأنصاب: هي حجارة کانوا یذبحون قرابینهم عندها، والأزلام: هي قِداحٌ کانوا یستَقْسِمون بها)[1]، واتە: (الأنصاب) چەند بەردێك بوون،کە قوربانییەکانیان لەلا سەردەبڕین، (الأزلام) چەند تیرێکی بێ نووكو پەڕ بوون بۆ یانسیب بەکاریان دێنان.

دیارە (أنصاب) کۆی (نَصْب)ە کە بەمانای بتو صەنەمداو، (أزلام)یش کۆی (زَلَمْ)ە و(قِداح)یش کۆی (قِدْح)ە، کە بەمانای تیری بێ نووكو پەڕ دێ.

ب- پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّ رِجالاً یَتَخوَّضون في مال الغَیْر بغیر حَقٍّ، فلهم النار یوم القیامة)) رواه البخاري، واتە: پیاوانێك هەن،کە بەناهەق ماڵو سامانی خەڵکی لرف دەکەن، ئەوانە ڕۆژی قیامەتێ سزایان ئاگرە.

## جۆری شەشەم: یارییە کۆمپیۆتەرییەکان :

ئەمانیش، کە زیاتر منداڵو هەرزەکارەکان بەکاریان دێنن، ئەگەر لە خودی خۆیاندا شتی خراپو قەدەغەیان تێدانەبێ، قەدەغەنین، بەمەرجێك زێدەڕۆییان تێدانەکرێو ئەرکە شەرعییەکانیان بۆ نەچوێنرێن - بۆ کەسانی باڵغ -.

## جۆری حەوتەم: یاریی کردن بە ئاژەڵو پەڕەورو ژیاندارانی دیکە :

لەم ڕۆژگارەدا گەلێك جۆرە ئاژەڵو دڕندەو پەڕەوەر بۆ یاریی پێکردنو کات پێ بەسەربردن بەکاردەهێنرێن، کە سەرژمێرکردنیان زەحمەتە، بۆ نموونە:

---

١) بڕوانە: (المصباح المنیر في تهذیب تفسیر ابن کثیر)، ص.٣٩٨

ئەسپ، گــا، فیل، ورچ، مــەیموون، شـێر، پڵـنگ، دۆلفـین، ســەگو تــاژی، کەڵەشێر، باز، کەو، بولبول، کۆتــر...

جا ئێمە بۆ تیشك خستنە سەر حوکمی یاریی کردنو، خافڵان بەو ژیاندارانــەو ڕاستو چەوتی ئەو مامەڵە جۆراوجۆرانەی،کە لەگەڵیان دەکرێن، بـیرو بۆچـوونی خۆمـان - کە دیارە لە دەقەکانی قورئانو سوننەتو، پاشـان قسـەو لێکدانــەوەی زانایانو وردبوونەوەو ڕامانی خۆمانەوە هاتوە- دەخەینە ڕوو:

أ- ڕاگرتنی ئاژەڵو پەڕەور شتێکی ڕەوایە، چونکە خوا هەرچی لەبوونەوەردایە بۆ مرۆڤــی دروســتکردوە، وەك فەرموویــەتی: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ...﴿١٣﴾ الجاثية﴾، واتە: هەرچی لەئاسمانەکانو لــە زەویدایــە (خوا) هەمووی بۆتان مەیسەرکردوە...

پاشـان ئـاژەڵو پــەڕەور بەگشـتیی، بەشـێکن لــە جـوانیی (زینـة)، ئــەو جوانییەی،کە خوا نکوولّیی کردوە لە کەسێك،کە بڵێ: قەدەغەو حەرامـە، وەك فەرموویـــــەتی: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ .. ﴿٣٢﴾ الأعراف﴾.

(النوَّوي) لەوبارەوە گوتوویەتی[1]:

(اتِّخاذ الحَمامِ للفَرْخِ والبيض والأُنس، أو حمل الكتب، جائزٌ بلا كراهةٍ، وأما اللَّعب بها للتطيّر فالصحيح أنه مكروه، فإن انضَمَّ اليه قِمارٌ ونحوه رُدَّت الشَّهادة)، واتە: کۆتر ڕاگرتن بەمەبەستی بەچکەو هێلکەو بۆ دڵخۆشیی، یان نامە پێداناردن، دروستەو هیچ ناپەسندیی تێدانیە، بەڵام یاریی پێکردنی بـۆ فاڵگرتنەوە، ئەوە ڕای ڕاست ئەوەیە،کە ناپەسـندەو، ئەگـەر قومـارو وێنــەی

---

١) بڕوانە: (عون المعبود شرح سنن أبي داود)، ج١٣، ص١٩٤.

ویشی بچێتە پاڵ، ئەوە شایەدیی ڕەتدەکاتەوە (واتە: خاوەنەکەی پێی فاسیق دەبێ).

وشەی (تطیّر)م بۆیە بە (فاڵگرتنەوە) لێکداوەتەوە چونکە لە (طِیَرَة)وە هاتوەو ئەویش بە (الفَأْل الرديء يُتَشاءَمُ به)[1] ماناکراوە، واتە: فاڵگرتنەوەی خراپ، کە مایەی ڕەشبینی بێ.

ب- هەروەها ڕاگرتنی ئاژەڵو پەڕەور بەگشتیی، بۆیاریی پێکردنو خۆ پێوە خافڵاندن، وەك ئەوانەی،کە مەشق بە ئەسپو فیلو دولفینو ورچو مەیموونو... هتد دەکەن، دیسان دروستە، بە مەرجێك ئەزیەتدانیانی تێدا نەبێ، دەشگونجێ وێڕای هەردووك ئایەتی ژمارە (١٣)ی (الجاثية)و (٣٢)ی (الأعراف)،کەپێشتر هێنامانن، ئەم فەرموودەیەش بە بەڵگە بهێنرێتەوە:

(عن أنس بن مالك ﷺ قال: كان النبي ﷺ لِيُخالِطُنا حتى يقول لأخٍ لي صغير: يا أباعمير! مافَعَل النُّغَيرُ؟!) رواه البخاري، واتە: پێغەمبەر ﷺ تێکەڵیی دەکردین، هەتا بە برایەکی بچووکمی دەفەرموو: ئەی ئەبو عومەیر! نوغەیر چی لێهات؟!

دیارە (أبوعُمير) کوڕێکی گچکە بووەو بەچکە چۆلەکە[2]، یان بولبولێکی هەبووەو دوایی لێی مردار بووە، وەك لەڕیوایەتی دیکەدا هاتوە، ئیدی پێغەمبەریش ﷺ بەوبۆنەیەوە ئاوا دواندوویەتیو (مُلاطفة)ی کردوە.

ج- بەڵام ئەوەی،کە دروست نیە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئاژەڵو پەڕەورو ژیانداراندا بەگشتییو بەلای کەمەوە، ئەگەر قەدەغەش نەبێ، ناپەسند (مکروه)ە، بریتیە لە پێکەوە بەشەڕدانیانو بەنیشانەدا کردنیان، وەك لەم دەقانەی سوننەتدا بە ئاشکرا دیارە:

---

٢) (المعجم الوسيط)، ص. ٥٧٠

١) هەمان سەرچاوە، ص٩٣٦، کە گوتوویەتی: (النُّغَرُ: فَرْخُ العصفور و فَرْخُ البلبل.. والنُّغَيْرُ تصغير النغر).

* ((عن سعيد بن جبير قال: مَرَّ ابن عمر بفتيان من قُرَيشٍ قَد نَصَبوا طيراً وهم يرمونه وقد جعلوا لصاحب الطَّير كلَّ خاطِئَةٍ من نَبْلهم: فلمّا رأوا ابن عمر تفرَّقوا، فقال ابن عمر: من فعل هذا؟! لعن الله من فعل هذا، ان رسول الله ﷺ لَعَنَ من اتّخذ شيئاً فيه الروحُ غَرَضاً)) متفق عليه.

واته: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر - خوا لێیان ڕازی بێ- بەلای چەند گەنجێکی قورەیشیدا ڕەتبوو، کە باڵندەیەکیان کردبوو بەنیشانە، لەبەرانبەر ئەوەدا،کە هەر تیرێك نیشانەی نەپێکا بیدەنە کابرای خاوەن باڵندە، جا کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی عومەریان بینی، بڵاوبوون، عەبدوڵڵاش گوتی: کێ ئەمەی کردوە؟ نەفرینی خوا لەوکەسەبێ کە ئەمەی کردوە، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی لە هەر کەسێك کردوە،کەشتێکی ژیاندار دەکاتە نیشانە.

* ((عن ابن عباس رضي الله عنه : نهى رسولُ الله ﷺ عن التحريش بين البهائم)) رواه الترمذي، واته: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە،کە ژیانداران تێکبەربدرێن و پێکەوە بەشەڕبدرێن.

* ((دخلت إمرأة النّار في هِرَّةٍ رَبَطَتْها فلم تُطْعِمْها ولم تَدَعْها تأكُلُ من خشاش الأرض))، متفق عليه، واته: ئافرەتێك بەهۆی پشیلەیەکەوە چووە ئاگرەوە، حەپسی کردبوو خواردنی نەدایەو، نەشیهێشت لە زیندەوەری زەوی بخوات.

وشەی (خِشاش)،کەبەسەرو بۆرو ژێر خوێنراوەتەوەو کۆی (خِشاشة)، یان (خَشاشة)یە، بەمانای زیندەوەری زەوی (حشرات الأرض) دێ[1].

* ((مَن لايَرْحَمْ لايُرْحَم)) متفق عليه، واتە: هەرکەسێك بەزەیی نەنوێنێ، بەزەیی لەگەڵ نانوێنرێ -واتە لەلایەن خوای میهرەبانەوە-.

١) (المعجم الوسيط)، ص٢٣٥.

## جۆری هەشتەم : یارییـە جادووییـەکان :

هەموو ئەو یارییانەی،کـە پەیوەستن بـە جـادوو (سِحْر)ەوە، بـۆ سـێ‌و دوو قەدەغەن، چونکە جادووگەریی یەکێکە لە حەوت گوناهە زلە فەوتێنەرەکان، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبـەردا ﷺ هـاتوە: ((إجْتَنِبـوا السَّبْعَ الموبِقـات: الأشـراك باللّه... والسحر..)) متفق علیه، واتە: خۆتان لە حەوت گوناهە فەوتێنەرەکان دوور بگرن: هاوبەش بۆ خوادانان... وەجادووکردن..

بەپێی ڕواڵەتی قورئانیش، بابای جادووگەرو ئەوکەسەش، کـە جـادوو - بـە کردەوە- فێردەبێ، کافرن، وەك خوا - عـزّ وجـلّ- فەرموویـەتی: ﴿...وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ ... (١٠٢) البقرة﴾، واتە: ... بەڵکو شەیطانەکان کافربوون: خەڵکیان فێری جـادوو دەکـردو فێری ئەوەیان دەکردن،کە دابەزێنرابووە سەر دوو فریشتەکان لە بابل، کە هارووت‌و مارووت بوون، هیچ کەسیشیان فێرنەدەکرد،هەتا پێیان نەگوتبایـە ئێمـە مایـەی تاقیکرانەوەین، جا خۆت کافرمەکە - بەهۆی فێر بوونی جادووەوە-.

ئەو یارییانەش، کە وەك جادوو دەچن‌و بەتەردەستیی (خِفة الیَد) ئەنجام دەدرێن، مەگـەر بـۆ ئامـانجی خـراپ بـەکاربهێنرێن‌و، وەك جـادوو ڕابنوێنرێن،ئەگـەرنا قەدەغەنین: بەڵام واپێدەچێ لەبەر وەك جادوو چوونیان ناپەسندبن.

لە کۆتایی یاریی‌و وەرزشیشدا ، بەپێویستی دەزانم بەکورتی دوو مەسەلە بخەمە ڕوو:

## یەکەم: ئافرەتو وەرزشو یاریی:

لە هەموو ئەو یاریی‌و وەرزشانەدا،کە باسکران نێرومێ وەك یەکن، مەگەر بە بەڵگەیەکی ڕوونو ڕاشکاوی قورئان، یان سوننەت شتێك تایبەت کرابێ بە یەکێکیانەوە.

بەڵام بێگومان عەقڵو سروشتو عورف دەخوازن،کە هەرکام لە پیاوانو ئافرەتان ئەو جۆرە یاریی‌و وەرزشانە هەڵبژێرن،کە لەگەڵ سروشتو پێکهاتەیاندا دەگونجێن.

پاشان پێویستە لە یاریی‌و وەرزشکردنی ئافرەتاندا، دوو مەرجی دیکەش ڕەچاو بکرێن:

أ- داپۆشینی عەورەت: کە وەك پێشتریش باسمان کرد عەورەتی ئافرەت لە بەرانبەر پیاواندا تێکڕای جەستەیەتی،جگە لە دەمو چاوو هەردووك دەستی،هەتا مەچەکی.

ب- تێکەڵ نەبوون لەگەڵ پیاوان: چونکە بێگومان ئافرەتان هەرچەندە پۆشتەش بن،بەڵام لەکاتی ئەنجامدانی یاریی‌و وەرزشدا، دەبنە مایەی سەرنج ڕاکێشانو جووڵاندنی هەستو غەریزەی پیاوان، هەربۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەردووك جاری پێشبڕکەکردنی لەگەڵ عائیشەی هاوسەریدا - خوا لێی ڕازی بێ- بە خەڵکەکەی فەرموو: پێشبکەون (تقدَّموا!) وەك پێشتر فەرمایشتەکەمان هێنا.

بەڵام پێویستە بگوترێ: کە ئەوجۆرە یارییانەی ئافرەتان زۆرجمو جۆڵیان تێدا ناکەنو، نابنە مایەی بەرجەستەبوونی ئەندامەکانیان لەبەرچاوی پیاوان، بۆ

نموونە: پێشبڕکە فیکریی‌و زانستی‌یەکان، ئەوە ئیشکالی تێدانیە، کە هەردوو ڕەگەز بە هاوبەشیی بیانکەن.

## دووەم: سنووری عەورەتی پیاوو ئافرەت :

پێشتر -لە بەشی پێنجەمدا- بەدرێژیی باسی عەورەتی ئافرەتمان کردو، لێرە دووبارەی ناکەینەوە،بەلاّم بابزانین سنوری عەورەتی پیاو - واتە: ئەوەی،کە پێویستە پیاو لە بەرانبەر پیاوان‌و ئافرەتاندا داپۆشێ-کوێیەو چۆنە؟!

زانایان لەبارەی سنووری عەورەتی پیاوەوە، ڕاجیاییان هەیە:

(أحمد وأهل الظاهر وابن جرير ومالك في رواية والأصطخري الشافعي) دەلّێن: عەورەتی پیاو بەس پێش‌و پاش (القبل والدُّبر)یەتی، ،بەلاّم (أبوحنيفة و شافعي) دەلّێن: ڕان (فَخذ)یش عەورەتە[1].

شایانی باسیشە لایەنگرانی ڕای یەکەم چەند شتێك بەبەلّگە دێننەوە،کەئەم فەرمایشتە یەکێکیانە، ئەگەر بەهێزترینیشیان نەبێ:

((عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان رسولُ الله مُضْطجعاً في بيتي كاشِفاً عن فَخِذَيْه أوساقيه فأستأذن أبوبكرٍ فأذِنَ له وهو على تلك الحال، فتحدَّث، ثم أستأذن عمر فأذن لَهُ وهو كذلك فتحدَّث، ثم أستأذن عثمان فجَلَس وسوَّى ثيابَهُ... فلما خَرَجَ قالت عائشة: دخل أبوبكر فلم تَهْتَشَّ له ولم تُبالِهِ، ثم دخل عمر فلم تهتَشَّ لَهُ ولم تُبالِهِ، ثم دخل عثمان فَجَلَسْتَ وسوَّيتَ ثيابك؟

فقال: ألا أستحي من رَجُلٍ تستحي منه الملائكة؟! وفي رواية: إنَّ عثمان رجل حييٌّ وإني خَشِيْتُ إنْ أذِنْتُ لَهُ على تلك الحال أن لايبلغ الِيَّ في حاجته)). رواه مسلم.

١) بڕوانە: (أحكام اللعب والترفيه في الفقه الأسلامي)، نعمان عارف محمد.

واتە: عائیشە خوا لـێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لـە ژورەکەمـدا ڕاکشابوو هەردووك ڕانی، یان هەردووك لاقی دەرخستبوون، ئیدی ئەبوبەکر داوای مۆڵەتی کرد، ئەویش هەر بەوحاڵەی خۆیـەوە مۆڵـەتی داو قسـەی کـرد، پاشـان عومەر مۆڵەتی خواستو مۆڵەتی ویشیدا، هەربەوحاڵەیەوەو قسەی کـرد، ئنجـا عوسمان مۆڵەتی خواست ئەویش دانیشتو پۆشاکەکەی خۆی چاککرد... جاکاتێك ڕۆیشت، عائیشە پێی گوت: بۆچی ئەبوبەکر هات هیچ خۆتت تێك نـەداو گوێـت پێنەدا، پاشان،کە عومەر هات، هیچ خۆتت تێك نەداو گوێت پێنەدا، پاشـان،کە عوسمان هات، دانیشتیو پۆشاکەکەتت چاك کرد ؟!

ئەویش فەرمووی: ئایا شـەرم لـە پیاوێـك نەکـەم، کـە فریشـتەکان شـەرمی لێدەکەن ؟!

لە ڕیوایەتێکدافەرمووی: عوسمان پیـاوێکی شـەرمنەو ترسـام ،ئەگـەر هـەر بەوحاڵەتەوە مۆڵەتی بدەم، نەتوانێ ئیشەکەی خۆیم بۆ باس بکات.

هەروەها لایەنگرانی ڕای دووەم چەند شتێك بە بەڵگە دێننەوە، کە ئـەم دەقـە یەکێکیانە:

((عن علي رضي الله عنه أن النبـي ﷺ قال: لا تُبْرِزْ فَخِذكَ ولا تنظـرنَّ الى فخـذ حـيٍّ ولاميِّتٍ)) رواه أبوداود وضعَّفَهُ أبوحاتم، واتە: عەلی - خوا لێـی ڕازی بـێ- دەڵـێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕانـت وەدەرمەخـەو تەماشـای ڕانـی هـیچ زینـدووو مردووییێك مەکە.

هەروەها (ترمذي) لە (زرعة بن مسلم بن جُرهد الأسلمي عن جدَّه جرهـد)ەوە هێناویەتی،کە پێغەمبەر ﷺ بەلای (جُرهد)دا تێپەڕبووە لە مزگەوتدا،کە ڕانـی بەدەرەوە بووە، ئـەویش فەرموویـەتی: (إنَّ الفخِذَ عـورة): واتـە: بێگومـان ڕان عەورەتە.

منیش پێم وایە: ڕای یەکەم لەڕووی بەڵگەوە بەهێزترە،بەڵام هی دووەم دووربینی (إحتیاط)ی زیاتری تێدایەو لەکاتی ئاساییشدا دووربینی باشە،بەڵام ئەگەر تێگیراویی‌و پێویستییش هەبوو، دەرکەوتنی ڕان، دەرفەت‌و بواری تێدایە.

پوختەی مەبەستیش دەربارەی وەرزش‌و[1] یاریی لەم چەند دێرەدا دەخەینەڕوو:

هەموو جۆرەکانی یاریی‌و وەرزش، جگە لەوانەی بەدەقێکی ڕوون‌و ڕاشکاوی قورئان‌و سوننەت قەدەغەکراون، ڕەوان، بەڵام دەبێ:

١- لەسەر حیسابی ئەرکە شەرعییە تایبەتیی‌و گشتییەکان (العَیْنیة و الکفائیة) نەبن.

٢- بەپۆشاک‌و ئەدەبی شەرعییەوە بکرێن.

٣- زێدەڕۆییان تێدا نەکرێ و نەشکرێنە ئامانج‌و خولیا.

---

١- بۆ نووسینی ئەم بەشە تاڕاددەیەك سوودم لە: (الأسلام والفن)ی د. یوسف القرضاوي (فصل: فن اللّعب، ص١٢٦-١٣٣) و (أحکام اللعب والترّفیة في الفقه الأسلامي)ی نعمان عارف محمد، وەرگرتوە.

## خوێنـــەری بەڕێـــز!

## ئەم بەشی حەوتەمە لە دوو باسان پێکدێ، کە ئەمە ناونیشانەکانیانە:

باسی یەکەم: شایی و هەڵپەڕین.

باسی دووەم: چەپڵە لێدان و فیکەکێشان.

## باسی یەكەم: شایی و هەڵپەڕین:

### ١- پێناسەی شایی و هەڵپەڕین :

شایی‌و هەڵپەڕین،كە لەزمانی عەرەبیدا (رَقْص)و (زَفَن)ی پێدەگوترێ، دیاردەیەكی جیهانییەو لەنێو سەرجەم گەلانی دنیادا باوە، لە زمانی كوردیشدا هەركام لە وشەی: (شایی)و (هەڵپەڕین) بەكاردێن‌و، ئەگەر بشمانەوێ بەكورتی پێناسەی شایی‌و هەڵپەڕین بكەین، دەڵێین:

(بریتیە لە جووڵاندنی جەستە بەشێوەیەكی ڕێك‌و پێك‌و، بەپێی ئاوازی مۆسیقا، یان گۆرانییەكی تایبەت).

( المعجم الوسیط) لەوبارەوە گوتوویەتی: (رَقَصَ یَرْقُصُ رقْصاً، تَنَقَّلَ وحرَّك جِسْمَهُ على إيقاعِ الموسيقى أو الغناء)[1].

دیارە شایی‌و هەڵپەڕینیش جۆرو شێوەكانی یەكجار زۆرن، دەتوانین بڵێین: هەر گەل‌و كۆمەڵگایە نەك جۆرێك، بەڵكو چەندان جۆرە شایی‌و هەڵپەڕینی هەن‌و، ئەو دیاردەیە بەشێك‌و پێكهێنەرێكی گرنگی كلتووری هەرگەل‌و كۆمەڵگایەكە.

### ٢- حوكمی شایی وهەڵپەڕین :

شایی‌و هەڵپەڕین لەخودی خۆیدا، دەكەوێتە بازنەی عادەت‌و هەڵسوكەوتەكانەوە،كە وەك چەندان جار دووپاتمان كردۆتەوە: بناغە تێیاندا ڕەوایی‌و دەستكراوەیی یە.

بەڵام بێگومان ڕەوایی شایی‌و هەڵپەڕینیش وەك هەر عادەت‌و هەڵسوكەوتێكی دیكە، ڕەها (مطلق)و بێ بەندومەرج (قیدو شرط) نیە، بەڵكو ڕەچاوكردنی چەند مەرجێك پێویستە، وەك دوایی ئاماژەیان پێ دەكەین.

---

١) بڕوانە، ص٣٦٤.

شایانی باسیشە کە بۆ ئیسپاتی ڕەوایی شاییو هەڵپەڕین، وێڕای ئەو بنچینە شەرعییەی ئاماژەمان پێدا: (بناغە لە هەڵسوکەوتو عادەتدا ڕەواییو دەست کراوەیی‌یە)، دەتوانین چەندان دەقی سوننەتیش بە بەڵگە بێنینەوە: بۆ نموونە:

١- ((عن عائشة رضي الله عنها قالت: جاءَ حَبَشٌ يَزْفِنون (وفي رواية: جاء السودان يَلْعبون بين يدي رسول الله ﷺ))، (وفي رواية: كان الحبش يلعبون بحرابٍ لهم)، (وفي رواية: إنَّ الحَبَشَ لَعِبوا لرسول الله ﷺ) فدعاني النبي فاطَّلَعْتُ من فوق عاتِقِهِ، فَطأْطَأَ رسول الله ﷺ مَنْكِبَيْهِ فجعلت أنظر الى لَعبهم من فوق عاتِقِهِ، (وفي رواية: بين أُذُنِهِ وعاتِقِهِ) حتى كنت أنا التي أَنْصَرِفُ عن النظر اليهم، (وفي رواية: حتى شَبِعْتُ ثم انصرفْتُ))، رواه أحمد و مسلم والنسائي والحميدي في مسنده، واتە: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: حەبەشییەکان هاتن شایی‌یان دەکرد (وە لە ڕیوایەتێکدا: ڕەشپێستەکان هاتن لەبەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ یاریی‌یان دەکرد)، (وە لە ڕیوایەتێکدا: حەبەشییەکان بە نێزەکانیان گەمەیان دەکرد)، (وە لە ڕیوایەتێکدا: حەبەشییەکان یارییان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد)، جا پێغەمبەر بانگی کردمو، منیش لەسەر لاملی‌یەوە تەماشام کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ شانەکانی بۆ نزم کردم، منیش سەرم خستە سەرشانیو لەسەر لاملییەوە دەمڕوانیە یارییەکەیان، (وە لە ڕیوایەتێکدا: لە نێوان گوێو لاملییەوە)،هەتا خۆم وازم لە تەماشاکردنیان هێنا، (وە لە ڕیوایەتێکدا: هەتا تێربوومو وازم هێنا).

٢- ((عن عائشة رضي الله عنها: وضع رسول الله ﷺ ذَقْني على مَنكِبَيْهِ لأنظر الى زَفْنِ الحبشةِ، حتى كنت التي مَلِلْتُ فانصرفت عنهم، قالت: قال رسول الله ﷺ يومئذٍ: لتعلم يهودُ أن في ديننا فُسْحَةً، إني أُرسلْت بحنيفية سَمْحَةٍ)) أخرجه أحمد وإسناده حسن، واتە: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- گێڕاویەتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ چەناگەمی خستە سەرشانەکانی، تاکو تەماشای

هەڵپەڕینی حەبەشەییەکان بکەم، ،هەتاکو خۆم ماندوو بووم‌و وازم لە تەماشاکردنیان هێنا، دەڵێ: ئەو ڕۆژەش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با جولەکەکان بزانن،کە ئایینی ئێمە فراوانیی تێدایە، من بە بەرنامەیەکی پاک‌و ئاسانەوە ڕەوانەکراوم!

کەواتە: شایی‌و هەڵپەڕین وەك جۆرێك لە وەرزش‌و یاریی، یان خۆشی‌و شادیی دەربڕین، شتێکی ڕەوایەو لە ڕۆژگاری پێغەمبەریشدا ﷺ کراوە، ئنجا دیارە ئەمیش وەك سەرجەم‌هەڵس‌و کەوتەکان، بۆهەردووك ڕەگەزی نێرومێ ڕەوایەو، لە ڕۆژگاری پێغەمبەریشدا ﷺ جاری وابووە ئافرەت‌هەڵپەڕیوە، وەك‌ئەم فەرموودەیە دەیخاتەڕوو، کە پێشتر - لە بەشی سێیەمدا هێناومانە-:

((عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان رسول الله ﷺ جالِساً فَسَمِعْنا لَغطاً وصوت صِبْيانٍ، فقام رسول الله ﷺ فإذا حَبشيَّةٌ تَزْفِنُ والصبيان حولها، فقال: يا عائشة تعالِي فانظري...)) رواه الترمذي، واتە: عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو گوێمان لە غەڵبەغەڵب‌و دەنگی منداڵان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا، بینی ئافرەتێکی حەبەشەیی هەڵدەپەڕێ‌و منداڵیشی بەدەورەوە بوون، فەرمووی: هۆ عائیشە وەرە تەماشا بکە..

بەلاّم وەك پێشتریش گوتمان: شایی‌و هەڵپەڕینیش وەك هەر عادەت‌و هەڵس‌وکەوتێکی دیکە، بەڕەهایی ڕەوانیەو، پێویستە چەند مەرجێکی تێدا ڕەچاو بکرێن:

أ- پێکەوە هەڵپەڕینی ئافرەتان‌و پیاوان،کە لە کوردەوارییدا (ڕەش بەڵەك)ی پێدەڵێن، شتێکی حەرامە، چونکە چەندان جۆرە گوناهی لێوە پەیدا دەبن، کەواتە: دروست نیە پیاوو ئافرەت پێکەوە شایی‌و هەڵپەڕکێ بکەن.

ب- هەروەها هەڵپەڕینی ئافرەتان لەپێش چاوی پیاوان، مەگەر لە حالەتێکی دەگمەن‌و تایبەتی وەك ئەوەی ئافرەتە حەبەشەییەکەدا، ،ئەگەرنا دروست نیە، چونکە وادیارە ئافرەتە حەبەشەییەکە هەم پۆشتەو پەرداخ بووەو، هەم جووڵەو هەڵس‌وکەوتی وای نەکردوە،کە سەرنج‌و غەریزەی پیاوان بورووژێنێ.

وەك ئەو حەڕەكەو جمو جوڵو خۆیادانانەی،كە ئافرەتانی سەماكەری ئەم ڕۆژگارە دەیانكەنو، بە بەرجەستەكردنی مێینایەتیو ئەندامەكانی جێی سەرنجی پیاوان، كاریگەریی زۆر سەلبییو ورووژێنەر لەسەر پیاوان دادەنێن!

كەواتە: دەتوانین بڵێین:

بە دوو بەڵگە دروست نیە ئافرەتان لەپێش چاوی پیاوان شاییو هەڵپەڕكێ بكەن، ئەگەر هەرخۆشیان بنو تەنیاش بن:

یەكەم: بێگومان عەورەتی خۆدەرخستنی ئافرەتان بۆ پیاوان قەدەغەیەو وەك پێشتریش باسمان كرد: سنووری عەورەتی ئافرەت لە بەرانبەر پیاواندا هەموو جەستەیەتی، جگە لە دەمو چاوو هەردووك دەستی ،هەتا مەچەكی، دەجا هیچ كەس ناتوانێ نكوڵیی لەوە بكات، كە سەرجەم ئافرەتانی سەماكەر (راقصة)و بەشدار لە شاییو هەڵپەڕیندا زۆر بە ناشیرینی، جوانییو عەورەتی خۆیان دەردەخەن، مەگەر بەدەگمەن، دەنا ئەم بنچینەیە لەم ڕۆژگارەدا ڕیزپەڕ (شاذ)ی تێدا نیە!

ئنجا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەریش ﷺ كە دەفەرموێ: ((إِحفَظْ عَوْرَتِك الاّ مِنْ زوجتك أو ماملكت يَمينُكَ)) رواه أحمد وأصحاب السُنن، واتە: عەورەتی خۆت بپارێزە - لە دەركەوتن- مەگەر بۆهاوسەرتو كەنیزەكت.

بەڵێ ئەم فەرمایشتە هەرچەندە دوێنراو (مُخاطَب ) تێیدا پیاوە،بەڵام بێگومان ئافرەتیش دەگرێتەوە.

دووەم: مەگەر چۆن دەنا، ناگونجێ ئافرەت شاییو هەڵپەركێ بكاتو شاییو هەڵپەڕینەكەی نەبێتە مایەی بەرجەستە بوونی مێینایەتیی (أُنوثة)یەكەی، ئەگەر بە ئەنقەستیش خۆی بانەداتو جووڵەی ورووژێنەرو سەرنجڕاكێش نەكات، ئنجا خوای كاربەجێش ئافرەتانی قەدەغەكردوە لە هەر جموجووڵێكی ورووژێنەرو جوانییو مێینایەتیی خۆ دەرخەر، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَقُل

لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ...... وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ... ﴿٣١﴾ ﴿النور﴾، واتە: وە بە ئافرەتانی بڕوادار بڵێ، با لە نیگای چاوەکانیان بگرنەوەو داوێنیان بپارێزن و جگە لەوەی - بە ناچاریی- دەردەکەوێ جوانیی خۆیان دەرنەخەن، با لەچکەکانیان بەسەر بەرۆکو یەخەیاندابدەن.... با پێیان بەزەویدا نەکوتن بەمەبەستی پەیبران بەو جوانییەیان،کە شاردوویانەتەوە ..

هەڵبەتە ڕستەی (مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ) وەك چۆن دەگونجێ مەبەست پێی خڕخاڵو بازنو جۆرەکانی دیکەی خشڵ بێ، کە بەهۆی لەنجەولارو پێ بەزەویدادانی ئافرەتەوە، خرینگەو زرینگەیان بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی جەستەو لەشو لارو ئەندامەکانی ئافرەت بێ، کە بە هۆی لەنجەو لارو ڕۆیشتنێکی تایبەتەوە، بەشێوەیەك لە شێوەکان بەرجەستەو نمایان بن!

## باسی دووەم: چەپڵە لێدان و فیکە کێشان:

### ١- پێناسەی چەپڵە لێدان و فیکە کێشان :

چەپڵە لێدان (التصفيق) بریتیە لە پێکداکێشانی هەردووك لەپی دەستی ڕاستو چەپ، وەك (المعجم الوسيط) گوتوویەتی: (صَفَّق: مبالغة صَفَقَ بيديه: ضَرَبَ باطن إحداهما على باطن الأخرى)[١].

فیکە کێشان، یان فیتوو لێدان (الصَّفير) بریتیە لەدەنگێك،کە بەزارو هەردوو لێو پەیدادەکرێ، وەك (المعجم الوسيط) گوتوویەتی:(صَفَرَ: صَوَّتَ بِفَمِهِ وَشَفَتَيْهِ)[٢].

---

١) بڕوانە: ص٥١٧.

٢) بڕوانە: ص٥١٦.

## ٢- حوكمی چەپڵە لێدان و فیكە كێشان :

دیارە هەركام لە چەپڵەو فیكە لەجوغزی عادەتو هەڵسوكەوتەكانداو، ئەوانیش بناغە تێیاندا ڕەواییە، مەگەر شتێك بە بەڵگەیەكی ڕوونو تایبەت لەو بنچینە گشتییە هەڵاوێررابێ‌و جیاكرابێتەوە.

شایانی باسیشە كە هەندێك لە زانایان هەركام لە چەپڵە لێدانو فیكە كێشان بە حەڕامدادەنێن‌و بەهێزترین بەڵگەشیان ئەم ڕستە قورئانییەیە: ﴿ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ... ﴿٣٥﴾ الأنفال ﴾، واتە: نوێژەكەیان لەلای ماڵ -ی خوا- بەس فیكەو چەپڵە بوو.

لێرەدا خوای كاربەجێ لەبارەی هاوبەشدانەرەكانەوە دەدوێ‌و، بەوە ڕەخنەیان لێدەگرێ، كە نوێژەكەیان لەلای كەعبە، تەنیا چەپڵەلێدانو فیكەكێشان بوو! جا ئایا ئەم ڕستە قورئانییە دەگونجێ بكرێتە بەڵگەی قەدەغەبوونی چەپڵەو فیكە؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونكە:

خوای زاناو توانا لەبەر خودی (چەپڵەوفیكە) چەپڵە لێدانو فیكەكێشانی كافرەكانی، لەسیاقی سەرزەنشت كردندا باس نەكردوە، بەڵكو لەبەر ئەوەبووە،كە كافرەكان چەپڵەلێدانو فیكەكێشانیان بەنوێژو خواپەرستیی داناوە!

(ابن عطيّة) لەوبارەوە گوتوویەتی[1]: (والذي مَرَّ بي من أمْر العرب في غيرما ديوان: أن المُكاءَ والتصدية كان مِنْ فعل العرب قَبل الأسلام على جهة التَقرُّبِ به والتشرّع... وعلى هذا يستقيم تعييرهم وتَنقصّهم بأن شرعهم وصلاتهم وعبادتهم لم تكن رَهْبةً ولا رغبةً انّما كانت مُكاءً وتصدية من نوع اللّعِبِ ولكنهم كانوا يَتَزايدون فيها وقت النبيِّ ﷺ ليُشْغِلوه وأُمَّتَهُ عن القراءة والصلاة)، واتە: وە ئەوەی،كەمن لە زیاتر لە دیوانێكی شیعریدا بینیومە ئەوەیە،كە: فیكەو چەپڵە

---

١) (المحرّر الوجيز في تفسير كتاب الله العزيز)، ج٦، ص٢٩٣-٢٩٤.

لەپێش ئیسلامدا لە کردەوەی عەرەبان بووەو، وەك لە خوا نێزیکبوونەوەو خواپەرستیی کردوویانن... جا لەسەر ئەم بناغەیە، ڕاستە کە سەرزەنشت بکرێن‌و عەیبیان لێ بگیرێ بەوە،کە دینداریی‌و نوێژو خواپەرستیی‌یەکەیان بەهاندەری لەخواترسان‌و خوا خۆشویستنەوە نەبووە، بەڵکو تەنیا فیکەو چەپڵەیەك بووە لە جۆری گەمەو یاریی! بەڵام لەکاتی ئامادەبوونی پێغەمبەردا ﷺ لەلای،کەعبە لێیان زیاد دەکردن، تاکو خۆی‌و کۆمەڵەکەی لە نوێژو قورئان خوێندن بێئاگا بکەن.

هەروەها هەندێکی دیکە لە زانایان فەرموودەی: (التسبیح للرِّجال والتصفیق للنساء) متفق علیە، یانکردۆتە بەڵگەی قەدەغەبوونی چەپڵە لێدان لە پیاوان‌و گوتوویانە: چەپڵە لێدان لە تایبەتمەندییەکانی ئافرەتانە، بەڵام ئەمیش ڕاست نیە، چونکە:

أ- ئەگەر چەپڵەلێدان تایبەت بوایە بە ئافرەتانەوە، چۆن هاوەڵان - خوا لێیان ڕازی بێ- ئەو مەسەلەیان نەدەزانی‌و بۆ ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ چەپڵەیان لێدەدا؟

وەك لە سوننەتدا هاتوە: ((... مالي أَراكم أكثرتم من التصفيق؟ مَنْ رأَبه شَيئٌ في صلاته فَلْيُسَبِّحْ، فأنه إذا سبَّح التُفِتَ اليه، وانما التصفيق للنساء)) متفق علیە، عن سهل بن سعد الساعدي، واتە: ... ئەوە بۆچی دەتانبینم چەپڵەتان زۆر لێدا؟ هەرکەسێك لە نوێژەکەیدا ئیشکالێکی بۆ پەیدابوو، با (سُبحان الله) بکات، چونکە هەرکات (سُبحان الله)ی کرد ئاوڕی لێ‌دەدرێتەوە، بەڵام چەپڵە لێدان بەس بۆ ئافرەتانە..

ب- بەڵکو ئەو هەڵوێستەی هاوەڵان بەڵگەی ئەوەیە،کە عادەتیان وابووە چەپڵەیان بۆ ئاگادارکردنەوە بەکارهێناوە، هەربۆیەش کاتێك ویستوویانە پێغەمبەری خوا ﷺ -کە ئیمامیان بووە- ئاگادار بکەنەوە لەسۆنگەی ئەوەوە،کە لە نوێژدا ڕای قسەکردنیان نەبووە، ئەوەی،کە عادەتیان بووە بۆ ئاگادارکردنەوە، کە چەپڵەیە بەکاریان هێناوە.

ج- حیکمەتی دانرانی (تسبیح) بۆ پیاوانو چەپڵە (تصفیق)یش بۆ ئافرەتان هەر ئەوەیە،کەهەر چەندە بۆنێو نوێژ (سُبحان الله) گوتن گونجاوترە، بەلاّم چونکە ئافرەت دەنگی نزمە، چەپڵە کراوەتە بەدیلی.

د- ئنجا ئەگەر ڕستەی: (التصفیق للنساء) (چەپڵە لێدان بۆ ئافرەتانە) بکرێتە بەڵگەی تایبەتمەندبوونی چەپڵە بە ئافرەتانەوە، دەبوایە ڕستەی: (والتسبیح للرجال) و (سبحان الله گوتن بۆ پیاوانە)ش بکرێتە بەڵگەی تایبەتمەند بوونی (تسبیح) بە پیاوانەوەو، ئافرەتان بۆیان نەبوایە (سُبحان الله) بڵێن!!

بەلاّم لێرەدا پێویستە ئاگاداری ڕاستییەك بین، ئەویش ئەوەیە،کە:

عورفو باوی کۆمەڵگا کاریگەریی زۆری هەیە لەسەر: جوان، یان ناقۆلاّ هاتنە بەرچاوی زۆر لە کردەوەو ڕەفتاری لە ئەسڵدا، ڕەوا، بۆ نموونە: لە کۆمەڵگایەکدا، کە چەپڵەلێدانو فیکەکێشان، زیاتر هی ئافرەتو مندالاّن، یان هەرزەکارو گەنجانە، جوان نیە پیاوی کاملو بەساڵداچوو ئەو ڕەفتارەیان لێ بیشکوێتەوە، هەرچەندە هیچ کەسیش ناتوانێ بەبێ بەڵگەی شەرعیی ڕوون، شتی ڕەواو حەلاڵ لەخەڵکی قەدەغە بکاتو عورفو باوی خەڵكو کۆمەڵگاکانیش وەستاو نینو لە گۆڕانی بەردەوامدان.

لێرەشدا کۆتایی بەم بەشی حەوتەمە دێنینو بەرەو بەشی هەشتەمو کۆتایی ئەم کتێبە دەگوازینەوە:

# بەشی هەشتەم

# نوکتەو گاڵتەو

# قسەی خۆش و پێکەنین[1]




١) بۆ نووسینی ئەم بەشە سوودێکی باشم لە: (الأسلام والفن)ی د. یوسف القرضاوي، وەرگرتووە، بڕوانە: (فنّ الفكاهة والمَرَح). ص١٠٥-١٢٥.

## خوێنەری بەڕێز!

**ئەم بەشی هەشتەم و کۆتاییەش لە سێ باسان پێکدێ، کە ئەمە ناوونیشانەکانیانە:**

باسی یەکەم: پێکەنین لە قورئان و سوننەتدا.

باسی دووەم: گاڵتەو قسەی خۆش وپیکەنین لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ و هاوسەرو هاوەڵانی دا.

باسی سێیەم: حوکمی نوکتەو قسەی خۆش وپێکەنین و ئەو سنوورانەی نابێ ببەزێنرێن.

## باسی یەکەم: پێکەنین لە قورئان و سوننەتدا؛

پێکەنین حاڵەتێکی ئاسایی‌و سروشتی مرۆڤە، بگرە یەکێکە لەو تایبەتمەندییانە (خصائص)ی مرۆڤ، کە لە ژیاندارانی دیکەی سەرزەوی جیێی دەکەنەوە.

لە زۆر دەقی قورئان‌و سوننەتدا باسی پێکەنین کراوە، بۆ نموونە:

١- ﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضۡحَكَ وَأَبۡكَىٰ ﴿٤٣﴾ النجم﴾، واتە: خوا ئەوەیە، کە -مرۆڤی- هێناوەتە پێکەنین‌و گریاندوویەتی.

٢- ﴿ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكٗا مِّن قَوۡلِهَا... ﴿١٩﴾ النمل﴾، واتە: جا - سولەیمان (علیه السلام)- بەهۆی قسەکەیەوە (واتە: قسەی مێرووڵەکە) زەردەخەنە گرتی‌و پێکەنی...

٣- ﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴿٧١﴾ هود﴾، واتە: ژنەکەی(ئیبراهیم کە - سارا- بوو) ڕاوەستابوو، پێکەنی، ئێمەش مژدەی لەدایکبوونی ئیسحاق‌و دوای ئیسحاقیش یەعقوبمان پێدا.

٤- ﴿ فَلۡيَضۡحَكُواْ قَلِيلٗا وَلۡيَبۡكُواْ كَثِيرٗا جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨٢﴾ التوبة﴾، واتە: دەجا با - بەجێماوانی بێ‌عوزری جەنگی تەبوک- کەم پێبکەنن‌و زۆر بگرین، لە سزای ئەوەدا،کە وەدەستیان هێناوە -لە گوناهو خراپە-.

٥- ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنۡهَا يَضۡحَكُونَ ﴿٤٧﴾ الزخرف﴾، واتە: جا کاتێک - مووسا علیه السلام- بە نیشانەکانمانەوە هاتەلایان، پێی پێکەنین!

ئنجا بائەم دەقەش وەک نموونە لە سوننەت بێنینەوە، چونکە لە باسی دووەمدا چەند دەقێک لەوبارەوە دێنینەوە:

((عن عائشة رضي الله عنها قالت: بَيْنا أنا ورسول الله ﷺ جالِسان في البيت أستأذَنَتْ علينا امرأة كانت تُغَنيِّ، فلم تَزَلَ بها عائشة حتى غَنَّتْ فلما غَنَّتْ أستأذن عمر بن الخطاب ؓ فلما استأذن عمر أَلْقَت المُغَنِّية ماكانت في يدها وخَرَجَتْ، وأستأخرت عائشة عن مجلسها، فأذن له رسولُ الله ﷺ فَضحِكَ، فقال: بأبي وأُمِّي ممّا تضحكُ؟ فأخْبَرَهُ ماصَنَعت القَيْنَةُ وعائشة، فقال: عمر: وأما والله لا، أللهُ ورسولُهُ أحقَ يُخْشى يا عائشة!)) حديث حسنٌ أخرجه الفاكهي في (أخبار مكة) رقم: ١٧٤٠، وإسناده قويٌّ.

جا لەبەر ئەوەی ئەم دەقەمان پێشتر لە بەشی سێیەمدا هێناوەو ماناشمان کردوە لێرەدا مانای ناکەین.

## باسی دووەم: گاڵتەو قسەی خۆش و پێکەنین لەژیانی پێغەمبەر ﷺ و هاوسەرو هاوەڵانیدا:

پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە هەموو ڕوویێکەوە تێرو تەواو بووە، بگرە لە لووتکەی تەواویی‌دا بووە، یەکجار گفت‌و لفت شیرین‌و ڕووگەش‌و قسە خۆش بووە، ئەوەتا هاوەڵانی بەڕێزی بە: قسە خۆشترین کەس (أفْكَه النّاس)[1] وەسفیان کردوە، یەکێك لە هاوەڵان گوتوویەتی: (ما رأيتُ أحداً أكثر تَبسُّماً من رسول الله ﷺ) رواه أحمد، واتە: هیچ کەسێکم نەدیوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەم بە زەردەخەنەتر بووبێ.

لە سیرەو سوننەتی پێغەمبەردا، گەلێك قسەی خۆش‌و هەڵوێستی گاڵتە ئامێز، لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕراونەوە، لە مامەڵەی لەگەڵ هاوسەرو هاوەڵانیدا -خوا لێیان ڕازی بێ-، کە ئەمە چەند نموونەیەکیانن:

---

١) بڕوانە: (كنز العُمّال) رقم: ١٨٤٠٠.

یەك: جارێکیان پیاوێك هاتەلای پێغەمبەری خوا ﷺو داوای لێکرد، کە حوشترێکی بداتێ، ئەویش فەرمووی: ((لا أحْمِلك الاّ على وَلَد النّاقة! فقال: يارسول الله وماذا أصْنَعُ بِوَلَدِ الناقة؟ قال: وهل تَلِدُ الأبِلَ الاّ النُّوَقُ؟!)) رواه الترمذي وصححَّه ورواه أبوداود، واتە: بەس سواری بەچکە حوشترێکی مێچکەت دەکەم! ئەویش گوتی: جا ئەی پێغەمبەری خوا چی لە بەچکە حوشتر بکەم؟! فەرمووی: ئەدی حوشتری نێرەش هەر لە مێچکە حوشتر نابن!!

دوو: ((عن عائشة رضي الله عنها: أنَّ نبيَّ الله ﷺ أتَتْهُ عجوزٌ من الأنصار، فقالت: يارسول الله! أُدع الله أن يُدْخلَني الجنَّة، فقال له نبيُّ الله ﷺ إنَّ الجنَّة لايَدْخُلُها عَجوزٌ! فذهب نبيّ الله ﷺ فَصلّى، ثم رجع الى عائشة، فقالت عائشة: لَقَدْ لقيتْ من كلمتك مَشَقةً وشِدَّةً! فقال نبيُّ الله: إن الله إذا أدخلَهُنَّ الجنَّةَ حوَّلَهُنَّ أبكاراً)) رواه الطبراني والترمذي في الشمائل وابن المنذر والبيهقي وغيرهم وحَسّنه الألباني في (غاية المرام)، واتە: عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- گێڕاویەتەوە،کە پیرەژنێکی ئەنصاریی هاتۆتە لای پێغەمبەری خوا ﷺو گوتوویەتی: ئەی ڕەوانەکراوی خوا! داوام بۆ لە خوا بکە بمخاتە بەهەشتەوە! پێغەمبەری خواش پێی فەرمووە: بێگومان پیرەژن ناچێتە بەهەشتێ! پاشان پێغەمبەر ڕۆیشتوە نوێژی کردوەو، دوایی هاتۆتەوە لای عائیشە، عائیشەش گوتوویەتی: ئەو پیرەژنە بەهۆی قسەکەتەوە زۆر دڵی توندو نارەحەت بووە! پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئەوە هەروایە، چونکە خوا، کە دەیانخاتە بەهەشتەوە دەیانگۆڕێ بۆ کچ!

سێ: ((قال زَيدُ بن أسْلَمْ: ان امرأة يقال لها: أُمُّ أيْمَن جاءت الى النبي ﷺ فقالت: إن زوجي يدعوك، قال: ومَن هو؟ أهو الذي بِعَيْنه بَياضٌ؟ قالت: والله ما بعينه بياضٌ! فقال: بلى إن بعينه بياضاً، فقالت: لاوالله! فقال: مامن أحدٍ الاّ بعينه بياضٌ)) أخرجه الزبير بن بكار في كتاب (الفكاهة و المَرَح) ورواه ابن أبي الدنيا، واتە: زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: ئافرەتێك،کە ئومموئەیمەنی پێدەگوترا، هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: مێردەکەم بانگت دەکات، فەرمووی: مێردەکەت کێیە؟ ئەوکەسەیە،کە چاوی سپییێتی تێدایە؟ گوتی: نە

بەخوا، چاوی سپیەتی تێدانیە! فەرمووی: با چاوی سپێتی تێدایە، گوتی: نە بەخوا! فەرمووی: هیچ کەس نیە،کە چاوی سپێنەی نەبێ!

چوار: ((عن أنس ﷺ: كان لأبي طلحة ابن يقال لَهُ: أَبو عُمَيْر، وكان رسول الله ﷺ يأتيهم ويقول: يا أبا عُمَيْر! مافعل النُّغَيْرُ؟!)) متفق عليه، واتە: ئەبوطەڵحە کوڕێکی هەبوو، ئەبوعومەیری پێ دەگوترا، پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی دەکردن‌و دەیفەرموو: هۆ ئەبا عومەیر نوغەیر چی لێهات؟!

پێشتریش باسمان کرد کە (نُغَير) بچوککراوەی (نُغَر)ە‌و، ئەمیش بەچکە چۆلەکە، یان بەچکە بولبولە.

پێنج: ((قالت عائشة رضي الله عنها: كان عندي رسولُ الله ﷺ وسودة بنت زَمْعة فَصَنَعَتُ حَريرةً وجئتُ به فَقُلْت لِسَوْدَةَ: كُلي، فقالت: لاأُحِبُّهُ، فقُلت: والله لتأكلنَّ أو لألَطِّخَنَّ به وَجْهَكِ! فقالت: ماأنا بذائقَتِه، فأخذت بِيدي من الصَّفحة شَيئاً منه فَلَطَخْتُ به وجْهَها، ورسولُ الله ﷺ جالِسٌ بيني وبَيْنها، فَخَفَضَ لَها رسولُ الله رُكْبَتيه لتَسْتَقيد منِّي فتناولَتْ من الصَّفحة شيئاً فَمَسَحَتْ به وَجهي، وجعل رسولُ الله ﷺ يَضْحَك)) أخرجه الزبير بن بكار في كتاب (الفكاهة والمَزَح) وأبويعلى بأسنادٍ جيِّد، واتە: عائیشە - خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: جارێک پێغەمبەری خوا ﷺ‌و سەودەی کچی زەمعە (هاوسەری پێغەمبەر)م لەلابوون پەڵوولەیەکم[1] لێنابوو، هێنام‌و بە سەودەم گوت: بخۆ! گوتی: حەزی لێناکەم، گوتم بەخوا، یان دەخۆی، یان لەدەم‌و چاوتی هەڵدەسووم! گوتی: لێی ناچێژم، منیش لە قاپەکە هەندێکم بەدەستم گرت‌و لەڕوویم هەڵسوو، پێغەمبەری خواش لەنێوان من‌و ئەودا دانیشتبوو، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەژنۆیەکانی خۆی بۆ نزم کردن،تاکو تۆڵەم لێبکاتەوە، ئەویش هەندێکی لە قاپەکە هەڵگرت‌و بەدەم‌و چاومی داهێنا، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی کرد بە پێکەنین.

---

١) بۆیە (حريرة)م بە (پەڵوولە) لێکداوەتەوە چونکە بە: (دقيق يُطْبَخُ بِلَبَنٍ أودَسَمٍ) پێناسە کراوە، بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص١٦٦.

شەش: ((رويَ أن الضحّاك بن سفيان الكلابي كان رجلاً دَميماً قَبيحاً، فلما بايعَهُ النبي ﷺ، قال: إن عندي إمرأتين أحْسَنُ من هذه الحميراء -وذلك قبل أن تنْزِلَ آية الحجاب- أفلا أنْزِلُ لك عن إحداهُما فَتَتَزَوَّجُها؟ وعائشة جالسة تَسْمَعُ! فقالت: أَهيَ أَحْسَنُ أم أنْتَ؟! فقال: بَلْ أنا أحْسَنُ منها وأكرمُ، فضحك رسولُ الله ﷺ من سؤالها إيّاه لأنه كان دميماً) قال الحافظ العراقي: أخرجه الزبير بن بكار في (الفكاهة والمرح) وللدار قطني نحو هذه القصة مع عُيَيْنَة بن حِصْن الغزاري بعد نزول الحجاب من حديث أبي هريرة، واتە: گێڕراوەتەوە، کە ضەحاکی کوڕی سوفیانی کیلابیی،کە پیاوێکی نابووتو ناشیرین بووە، کاتێك پێغەمبەر ﷺ بەیعەتی لەگەڵ کردوە، گوتوویەتی: من دوو ژنم هەن لەم سپیلکەڵەیە جوانترن - ئەوەش بەر لە دابەزینی ئایەتی پەردە بوو- جا ئایا وازت بۆ لە یەکێکیان بێنمو بیکەیە هاوسەرت؟! عائیشەش دانیشتبوو گوێی گرتبوو! جا پێی گوت: ئایا ژنەکەت جوانترە یان خۆت؟! ئەویش گوتی: بەڵکو من جوانترو بەرێزترم لەو! ئیدی پێغەبەری خواش ﷺ پێکەنی بەهۆی پرسیارکردنی عائیشەوە لێی لەوبارەوە، چونکە نابووت بوو!

حەوت: ((كان نُعَيمان بن عمر الأنصاري لايدخل المدينة طُرفة الاّ إشترى منها، ثم جاءَ بها الى النبي ﷺ فيقول: هذا أهْدَيتُهُ لك، فإذا جاءَ صاحِبُها يُطالِبُ نُعَيمان بِثَمَنِها، أحْضَرَهُ الى النبي ﷺ قائلاً: إعْطِ هذا ثَمَنَ مَتاعه، فيقول: أوَلَمْ تُهْدِهِ لي؟! فيقول: إنّه والله لم يكن عندي ثَمَنُهُ ولَقَدْ أحْبَبْتُ أن تَأكُلَهُ، فَيضحك ويأمُرُ لِصاحِبه بِثَمَنِه)) رواه الزبير بن بكار في (الفكاهة والمرَحَ)، واتە: نوعەیمانی کوڕی عەمری ئەنصاریی هەرمیوەیەکی[1] نۆبەرە هاتبایە مەدینەوە حەتمەن لێی دەکڕی، پاشان بۆ پێغەمبەری ﷺ دێناو دەیگوت: ئەمە دیاریی منە بۆ تۆ! ئنجا کاتێك خاوەنەکەی دەهاتو نرخەکەی لە

---

١) سیاقی فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێ، کە مەبەست لە (طُرْفَة) میوەی نۆبەرەیە، ئەگەرنا وشەی(طرفة) هەموو شتێکی تازەو سەیر دەگەیەنێ، بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٥٥٥.

نوعەیـــمان داوا دەکـرد، دەیــبردە لای پێغەمبــەر ﷺو دەیگــوت: پــارەی کەل‌وپەلی ئەمە بدە! ئەویش دەیفەرموو: ئەدی بەدیاریی بۆت نەهێنا بــووم؟ دەیگوت: بەخوا نرخەکەیم لەلا نەبوو، حەزیشم کـرد بیخــۆی! ئیــدی ئــەویش پێدەکەنی‌و فەرمانی دەکرد، کە نرخەکەی بدەنە خاوەنەکەی!

هەشـــت: ((عـن ربيعة بن عثمان قال: دَخَلَ أعرابيٌّ على النبـي ﷺ وأناخ ناقتَـهُ بِفنائِه، فقال بعض الصحابة لِنُعَيْمان الأنصاري: لو عَقَرتَها فأكلْناها فإنـا قَـدْ قِرِمْنَا الى اللّحْمِ! فَفَعَل، فخــرجَ الأعرابــيُّ فصـاح: واعقـراهُ يامحمـــد! فخـرج النبـي ﷺ فقال: مـن فعل هذا؟ فقالوا: النُّعيْمـان، فأتْبَعَـهُ يَسْأل عَنْـهُ حتـى وجَدَه قَدْ دَخَل دار ضباعة بنت الزّبير بن عبـدالمطلب واختفـى تحت سِرْبٍ لها فَوْقَها جَريدٌ، فأشار رَجلٌ الى النبـي حيث هو، فأخرَجَهُ، فقال له: ما حملك على ما صَنَعْتَ؟! قال: الذين دلُّوك عليَّ يارسول الله، هم الذين أمروني بذلك ، قال: فجعل يَمْسَحُ التراب عـن وجْهِهِ ويَضْحَكُ، ثم غَرِمَها للأعرابيِّ)) رواه الزبير بن بكار في (الفكاهة والمرح)، واتە: ڕەبیعەی کوڕی عوسمان دەڵێ: عەرەبێکی دەشــتەکی چووە لای پێغەمبەر ﷺو حوشترەکەی لە حەوشەکەدا یــەخدا، هەنــدێك لــە هــاوەڵانیش بــە نوعەیـــمانی ئەنصــارییان گــوت: ئەگــەر ســەرت بڕیبایــەو خواردبامان، چونکە تامەزرۆی گۆشتین! ئەویش سەری بڕی، کابرای دەشتەکیش هاتەدەرێ‌و هاواری کرد، کێ ئەمەی کرد: هاوار موحەمەد لێیان ســەربڕیوم! ئیدی پێغەمبەریش ﷺ هاتەدەرێ‌و فەرمووی، کێ ئەمەی کردوە؟! گوتیــان: نوعەیـمان، ئەویش خەڵکی وەدواخست سۆراغی بکەن، سەرەنجام زانــی، کــە چۆتە ماڵی ضیباعەی کچی زوبەیری کوڕی عەبدولموطـەلیب‌و لەوێ خۆی لە قۆڵتێکداشاربۆوە،کە لاسکە دارخورمای لەسەربوون، جا پیاوێك ئاماژەی بــۆ پێغەمبەر کرد بۆ ئەو شوێنەی،کە تێیدا بوو، ئەویش دەریهێناو پێی فەرموو: چ شتێك پاڵی پێوەنای وابکەی؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوانەی منیان پێشانی تۆدا، هەر ئەوان بوون،کــە فــەرمانیان پێکــردم ئــەوە بکــەم! ئیــدی

پێغەمبەریش ﷺ بەدەم پێکەنینەوە تۆزو خۆڵی لە دەموچاوی کردەوە، پاشان بۆ کابرای دەشتەکی بژارد.

نــۆ: (وقال الزبير: حَدَّثني عَمِّي عن جَدِّي قال: كان مَخرمة بن نوفل قد بلغ مائة وخمس عشرة سنة: فقام في المسجد يُريد أن يبول فَصاح به الناس: المسجِدَ المسجِدَ! فأخَذَ نُعَيْمان بن عمرو بيده وتَنحَّى به ثم أَجْلَسَهُ في ناحية أخرى من المسجد، فقال لَهُ: بُلْ هنا! قال: فَصاحَ بهِ الناسُ، فقال: فَمَنْ أتى بي الى هُنا؟ قالوا: نُعَيْمان، قال: أَما إنَّ لِلّه عليَّ إن ظَفَرْتُ بهِ أن أَضْرِبَهُ بِعصايَ هذه ضَرْبَةً تبلُغُ منه ما بَلَغَتْ!

فَبَلغ ذلك نُعَيْمان فمكث ما شاءَ الله، ثم أَتاه يَوْماً وعثمان قائمٌ يُصلِّي في ناحية المسجد، فقال لِمَخْرِمة: هل لك في نُعَيْمان؟! قال: نعم، قل: فأخذ بيده حتى أَوْقَفَهُ على عثمان رضي الله عنه، وكان اذا صلَّى لايَلْتَفِتُ، فقال: دونك هذا نُعَيْمانُ فَجَمَعَ يَدَهُ بِعَصاه فَضَرَبَ عثمان فَشَجَّهُ، فَصاحُوابِهِ: ضَرَبْتَ أَمير المؤمنين!) ذكره الحافظ ابن حجر في (الأصابة) نَقْلاً عن (الفكاهة والمَرَح)، واتە: زوبەیر -واتە زوبەیری کوڕی بەککار- گوتوویەتی: مامم لە باپیرمەوە بۆی گێڕامەوە گوتی: مەخرەمەی کوڕی نەوفەل گەیشتبووە سەدو پازدە ساڵ، جارێك دەیەوێ لە مزگەوتێدا میز بکات، خەڵکیش هاواری لێدەکەن: مزگەوتە مزگەوت! نوعەیمانی کوڕی عەمریش دەستی دەگرێو جێیی دەکاتەوەو، دەیباتە لایەکی دیکەی مزگەوتو دایدەنیشێنێو پێی دەڵێ: لێرە میزبکە! دەڵێ: خەڵکیش هاواری لێدەکەن، ئەویش دەڵێ: ئەوە کێ هێناومی بۆ ئێرە؟! دەڵێن: نوعەیمان، دەڵێ: پەیمان بێ لەگەڵ خوا،ئەگەر لێم هەڵبکەوێ بەم گۆچانەم زەبرێکی بێڕەزای لێبدەم!

نوعەیمانیش ئەوەی پێدەگاتەوە، جا ماوەیەك،کە خوا بیەوێ دەمێنێتەوە، پاشان ڕۆژێك لەکاتێکدا،کە عوسمان -خوا لێی ڕازی بێ- ڕادەوەستێو نوێژ دەکات لەلایەکی مزگەوت، دێتەلای مەخرەمەو دەڵێ: لە نوعەیمان دەخەفتێی؟ دەڵێ: بەڵێ: ئەویش دەستی دەگرێ ،هەتا لەسەر عوسمان

ڕایدەگرێ، ئەویش عادەتی وابووە،کە نوێژی کردوە ئاوڕی نەداوەتەوە، ئنجا پێی دەڵێ: ئەمە نوعەیمانەو لێیبدە! ئیدی ئەویش بەهەموو هێزییەوە گۆچانێك لە عوسمان دەداتو سەری دەشکێنێ، خەڵکیش هاواری لێدەکەن: لە ئەمیری بڕوادارانت دا!!

دە: (روي عن أُمِّ سلمة رضي الله عنها قالت: خرج أبوبكر الصديق ﷺ في تجارة الى بُصْرى قبل موت النبي ﷺ بِعامٍ ومَعَهُ نُعَيْمان وسُوَيبطُ بن حَرْملة رضي الله عنهما، وكانا قد شهدا بَدْراً وكان نُعَيْمانُ على الزّاد، فقال لَـهُ سُوَيبطُ:- وكان رَجُلاً مَزّاحاً -أَطْعِمْني! فقال: لا حتى تجيءَ أبوبكرٍ، فقال: أما والله لأغيظَنَّك! فَمرّوا بِقومٍ، فقال لهم سُويبط: تشترون مِنِّي عَبداً؟ قالوا: نعم، قال: إنه عبدٌ لَهُ كلامٌ، وهو قائل لكم: إنّي حُرٌّ، فإن كنتم اذا قال لكم هذه المقالة تركتموه، فلا تفسِدوا عليَّ عَبْدي، قالوا: بَلْ نَشتريه منك، قال: فاشتروه منه بعشر قلائص، قال: فجاؤا فوضَعوا في عُنُقِه عِمامةً أوحبْلاً، فقال نُعَيْمان: ان هذا يَسْتَهْزِيءُ بكم، وإنِّي حُرٌّ لَسْتُ بِعَبْدٍ، قالوا: قد أَخْبَرنا خَبَرَكَ، فانطلقوا به فجاءَ أبوبكرٍ فأخبره سُويْبط، فأتبعهم ، فَردَّ عليهم القلائص وأَخَذَهُ، فلما قَدِمُوا على النبي ﷺ أخبروه، قال: فَضَحِك النبيُّ وأصحابُهُ منها حولاً)

أخرجه ابن أبي شيبة وابن ماجه، وأبوداود الطيالسي والروياني ولكنهما جعلا المازح هو النعيمان والمبتاعَ سويْبطاً، واتە: لە ئوممو سەلەمەوە - خوا لێی ڕازی بێ- گێڕراوەتەوە گوتوویەتی: ئەبوبەکری صیددیق - خوا لێی ڕازی بێ- بە ساڵێك بەر لە مردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ بازرگانی چوو بۆ بوصراو، نوعەیمانو سوەیبیطی کوڕی حەرمەلەی لەگەڵدا بوون - خوا لێیان ڕازی بێ-، هەردووکیشیان بەشداری جەنگی بەدریان کردبوو، جا نوعەیمان لەسەر زادو زەخیرە دانرابوو، سوەیبیط - کە پیاوێکی گاڵتە باز بوو- پێی گوت: خواردنم بدەیە! گوتی: هەتا ئەبوبەکر نەیەت، نابێ، گوتی: دە بەخوا دەبێ ڕقت هەڵسێنم! ئیدی بەلای کۆمەڵێکدا ڕۆیشتن، سوەیبیط پێی گوتن: کۆیلەیەکم

لێدەکڕن؟ گوتیان: بەڵێ، گوتی: بەڵام ئەوە کۆیلەیەکە قسەی هەن، پێتان دەڵێ: من ئازادم! جا ئێوە، ئەگەر هەرکات ئەو قسەیەی پێتانگوت، وازی لێ دێنن، ئەوە کۆیلەکەمم لێ تێك مەدەن! گوتیان: بەڵکو لێت دەکڕین، دەڵێ: لێیان کڕی بە دە حوشتران[1]، دەڵێ: جا هاتن مێزەرێك، یان پەتکێکیان خستە ملی، نوعەیمانیش گوتی: ئەمە گاڵتەتان پێدەکات، من ئازادمو کۆیلە نیم! گوتیان هەواڵی تۆی پێداوین -کە ئەو جۆرە قسانە دەکەی!- ئیدی بردیان، جا کاتێك ئەبوبەکر هاتەوە سوەیبیط هەواڵی پێدا، ئەویش خەڵکی شوێن خستو حوشترەکانی دانەوەو وەری گرتەوە، جا کاتێك چوونەوە لای پێغەمبەر ﷺ هەواڵیان پێدا، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی ساڵێك بەم ڕووداوە هەر پێدەکەنین.

دیارە ئەم ڕووداوو بەسەرهاتانەو هاوێنەکانیشیان بەڕوونیی تێیاندا دیارە، کە پێغەمبەری خوا ﷺو هاوسەرو هاوەڵانی بەڕێزی - خوا لێیان ڕازی بێ-، وێڕای ئەوەی،کە جیددییەتی زۆر لە ژیانیاندا هەبووە، تاڕاددەیەکی زۆریش کراوەو قسەخۆشو ڕووگەش بوونو گاڵتەو قسەو نوکتەی خۆشیشیان هەبووەو بەپێچەوانەی بۆچوونی هەندێك،کەسەوە بە پاساوی دینداریيو تەقواوە وشكو داخراوو بێ زەوق نەبوون!

ئێستاش دەگوازینەوە بۆ باسی سێیەمو کۆتایی ئەم بەشە:

## باسی سێیەم: حوکمی نوکتەو قسەی خۆش و پێکەنین و ئەو سنوورانەی نابێ ببەزێنرێن:

خوێنەری بەڕێز!

---

١) (قِلاص) کۆی (قَلوص)ە، کە بە حوشتری بارهەڵگر دەگوترێ، هەتا دەگاتە تەمەنی نۆ ساڵیی، بڕوانە: (المعجم الوسيط)، ص٧٥٥.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو دەقانەدا،كە ڕابردن، زۆر بەڕوونیی دیارە، كەنوكتەو قسەی خۆش‌و پێكەنین‌و گاڵتەكردن، ڕەوا (مُباح)ن‌و، بگرە ژیان بەبێ ئەندازەیەك لەوجۆرە شتانە، وشك‌و ناخۆش دەبێ‌و تەحەممولكردنی قورس دەبێ، ئنجا دیارە پێغەمبەری خواش ﷺ كە سەرمەشقی ئێمەی مسوڵمانە، لە هەموو ڕوویێكەوە تێروو تەواوو گونجاوو تەبا بووە لە سنوری شەریعەتدا، وەك (زید بن ثابت) –خوا لێی ڕازی بێ- دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((كُنتُ جارَهُ فكان اذا نَزَل عليه الوحي بَعَثَ اليَّ فَكَتَبْتُهُ لَـهُ، فكان اذا ذكرنا الدُّنيا ذكرها مَعَنا، واذا ذكرنا الآخرة ذكرها معنا، واذا ذكرنا الطَّعامَ ذكره معنا، قال: فكلُّ هذا أُحدِّثكم عن رسول الله ﷺ)) رواه الطبراني بأسنادٍ حسن، واتە: من دراوسێی بووم، جا عادەتی وابوو: كاتێك وەحی بۆ دادەبەزی بەدوایدا دەناردم‌و بۆم دەنوسییەوە، ،ئەگەر باسی دنیامان كردبایە، لەگەڵمان باسی دەكرد،كاتێك باسی دوارۆژمان كردبایە لەگەڵماندا باسی دەكرد، كاتێك باسی خواردنمان دەكرد لەگەڵماندا باسی دەكرد، هەموو ئەوەی باسی دەكەم لەبارەی پێغەمبەری خواوەیە ﷺ.

بەڵام بێگومان هەرشتێك لە سنووری سروشتیی خۆی چووەدەر، با لە بنەڕەتدا ڕەواش بێ، حوكمەكەی دەگۆڕێ بەرەو ناپەسندیی (كراهیـة)و بگرە قەدەغەیی (حُرْمَـة)یش، بۆیە گاڵتەو نوكتەو قسەی خۆشیش، دەبێ لە سنووری شەریعەت نەچێتە دەرێ، تاكو بەڕەوایی بمێنێتەوەو، ڕەچاوكردنی ئەم مەرجانەی خوارەوەش پێویستە بۆ ئەو مەبەستە:

## ١- نابێ درۆكردن بكرێتە هۆكاری پێكەنینی خەڵك :

لەوبارەشەوە بەڵگە زۆرن، بۆ نموونە:

أ- ((وَيْلٌ للذي يُحَدِّثُ فَيَكْذِبُ لِيُضحِك القومَ، وَيْلٌ لَـهُ، وَيْـلٌ لَـهُ، وَيْـلٌ لَـهُ)) رواه النسائي وأبوداود والترمذي وحسَّنه عن بَهْزِ بن حكيمٍ عن جدِّه، واتە: سزای سەخت بۆ

ئەوکەسەی،کە قسان دەکات درۆ دەکات، تاکو خەڵکەکە بهێنێتە پێکەنین، سزای سەخت بۆ وی، سزای سەخت بۆ وی، سزای سەخت بۆ وی.

ب- ((عن أبي هريرة ﷺ قال: قالوا: يا رسول الله إنك تُداعِبنا! قال: إنّي لا أقول إلاّ حَقّاً)) رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح، ورواه البيهقي، واته: -هاوەڵان- گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ گاڵتەمان لەگەڵ دەکەی! فەرمووی: -بەڵێ-، بەلاّم جگە لە هەق شتێکی دیکە نالێم!

## ٢- نابێ گاڵتە بە خەڵك كردن و بە سووك سەیركردنیانی تێدابێ:

ئەمیش مەرجێکی دیکەی بەڕەوایی مانەوەی گاڵتەو قسەی خۆشەو، بەڵگەش لەوبارەوە زۆرن، بۆ نموونە:

أ- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ ...(١١) الحجرات ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! باکۆمەڵێکتان گاڵتە بەکۆمەڵێکی دیکە نەکات...

ئاشکراشە، کە (گاڵتە بەیەکدی کردن) زۆرجیایە لە (گاڵتە لەگەڵ یەکداکردن)! هەر بۆیەش، یەکەمیان قەدەغەو دووەمیان ڕەوایە.

ب- ((... بِحَسْب إمريء من الشرّ أنْ يَحْقِرَ أخاه المسلم...)) رواه مسلم، واتە: مرۆڤ ئەوەندە خراپەی بەسە، کە برای مسوڵمانی بەسووك بگرێ...

ج- ((عن عائشة رضي الله عنها أنّها ذكرت إحدى ضرائرها فَوَصَفَتْها بالقِصَرِ تعِيبُها به، فقال ﷺ: يا عائشة! لقد قُلْتِ كلمةً لَوْ مُزِجَتْ بماء البحر لَمَزَجَتْهُ)) رواه أبوداود والترمذي وقال: حسن صحيح، واتە: عائیشە -خوای لێی ڕازی بێ- گێڕاویەتەوە،کە ڕۆژێك باسی یەکێك لە هەوێیەکانی خۆی کردوەو، بە کورتە باڵای پێناسەی کردوە وەك ڕەخنە لێگرتنی، ئەویش ﷺ فەرموویەتی: ئەی عائیشە! قسەیەکت کردوە، ئەگەر لەگەڵ ئاوی دەریادا تێکەڵ بکرێ دەیگۆڕێ!

## ٣- نابێ ببێتە مایەی ترساندنی هیچ کەس :

بۆ سەلماندنی پێویستیی ئەم مەرجەش بەڵگە زۆرن، بۆ نموونە:

أ- ((عن عبدالرحمن بن أبي لَيلى قال: حدَّثنا أصحابُ محمدٍ رضي الله عنهم أنَّهم كانوا يَسيرون مع النبي ﷺ فقام رجلٌ منهم، فانطلق بعضُهُم الى حَبْلٍ معه، فأخذه فَفَزِعَ، فقال رسول الله ﷺ: لايَحِلُّ لِرَجُلٍ أن يروِّع مُسْلِماً)) رواه أبوداود، واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلا دەڵێ: هاوەڵانی موحەممەد -خوا لێیان ڕازی بێ- بۆیان باسکردین،کە جارێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەڕۆیشتن پیاوێکیان هەڵسا - بۆ ئیشێك - جا هەندێکیان چوون پەتێك،کە پێی بوو بردیان، ئەویش - کە گەڕایەوە پەتەکەی نەمابوو- ترسا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بۆ هیچ پیاوێك ڕەوا نیە،کە مسوڵمانێك بترسێنێ.

ت- ((لايأخُذْ أحدكم مَتاعَ أخيه لاعباً ولا جادّاً)) رواه الترمذي وحَسَّنه، واتە: هیچ یەکێکتان،کەلوپەلی برایەکەی نە بەگاڵتە نە بە جیددیی، نەبات.

## ٤- پێویستە لەکاتی گونجاودا بێ و، بێ جێ نەبێ :

ئەمیش مەرجێکی دیکەیە بۆ بەڕەوایی مانەوەی گاڵتەو قسەی خۆش، دیارە عەقڵ‌و مەنتیق‌و زەوقی سەلیمیش، ئەم مەرجە پەسندو بگرە پێویستیش دەکەن، ئەوەتا خوای کاربەجێ سەرزەنشتی کافرەکانی کردوە،کە لەجیاتی گریان لەکاتی بیستنی قورئاندا پێکەنیون: ﴿ أَفَمِنْ هَٰذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ ﴿٦٠﴾ النجم﴾، واتە: ئایا سەرتان لەم قسانە سوڕدەمێنێ: پێدەکەنن‌و ناگرین؟!

بەڵێ بابای عاقڵو دانا هەرشتە لە شوێنی شایستەی خۆیدا دادەنێو، وەك ماشو برنج تێکەڵیان ناکەتو بە پێچەوانەشەوە دایاننانێ، (أصمعي) لەمبارەوە ئەم قوڵە نەزیلەیە دەگێڕێتەوە:

دەڵێ: لە بیابان ئافرەتێکم بینی، کە بە گەردنکەچییەوە لەسەر بەرماڵەکەی نوێژی دەکرد، بەڵام کاتێك نوێژەکەی تەواوکرد چووە بەر ئاوێنەو دەستی کرد بە خۆرازاندنەوەو خۆی جوان کرد!

دەڵێ: منیش پێم گوت: ئەمەیان لەکوێو ئەوی دیکە لەکوێ؟!

ئەویش گوتی:

وَلِلَّهِ مِنِّي جَانِبٌ لا أُضَيِّعُهُ
وَلِلَّهوِ مِنِّي والبطالة جَانِبٌ

واتە: بەلای خوادا لایەنێکم هەیە بەزایەی نادەم، هەروەها لایەنێکی دیکەی کات بەسەربردنو خۆ خافڵاندنیشم هەیە.

دەڵێ: ئیدی زانیم، کە ئەو ژنە خواپەرستەو مێردی هەیەو خۆی بۆ جوان دەکات.

## ٥- نابێ لە ئەندازەی سروشتیی و ماقوولی بچێتە دەرێ:

گوتراوە: (کل شيءٍ جاوَزَ حَدَّهُ انقلب ضِدَّهُ) هەرشتێك لەسنووری خۆی دەرچوو، پێچەوانەی خۆی دەبێتەوە، دیارە پێشتریش چەند جارێك باسمان کرد، کە زێدەڕۆیی و تێپەڕاندن (الأسراف والأفراط) حوکمی شتە ڕەوایەکان دەگۆڕن بۆ ناڕەوا، تەنانەت ئەو شتە، ئەگەر ئاو خواردنەوەش بێ، وەك خوا - عزّ وجلّ- فەرموویەتی: ﴿... وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ الأعراف ﴾، واتە: ... بخۆنو بخۆنەوەو زێدەڕۆیی مەکەن، مسۆگەر ئەو (خوا) زێدەڕۆیی کەرانی خۆش ناوێن.

(علي بن أبي طالب)یش - خوا لێی ڕازی بێ- لەوبارەیەوە گوتوویەتی: (إعْطِ الكلام منَ المُزْحِ بمقداره ماتُعطي الطَّعام من المِلْح)، واتە: بەئەندازەی خوێ، کەلە چێشتی دەکەی، گاڵتەو قسەی خۆش ڕەگەڵ قسەکردن بخە!

لێرەشدا کۆتایی بەم بەشی هەشتەمە دێنین‌و، بە کۆتایی پێهێنانی ئەم بەشەش، کۆتایی بە سەرجەم بەش‌و باس‌و بابەتەکانی ئەم کتێبە دێنین‌و، لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەشدا دەڵێم:

بەگوێرەی تواناو بۆلوان هەوڵمداوە،کە، چی ڕاست‌و هەق، یان ڕاستترو هەقترە لە هەموو ئەو بابەت‌و مەسەلانەدا،کە توێژیومانن‌ەوە، ئەوە بڵێم‌و بنووسم‌و هەوڵیشمداوە،کە بە هیچ جۆرێك قەناعەتی پێش بیرکردنەوە بەکارنەهێنم‌و، وەك کۆلکەدار خۆم بە ڕووباری نەقڵ‌و عەقڵدا بدەم‌و، بۆکوێیان بردم پێی ڕازی بم، بەڵام بێگومان هیچکەس ، جگە لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە شەڕو خراپەی نەفس‌و شەیطان سەلامەت‌و پارێزراو نابێ‌و، منیش هەرچی هەق‌و ڕاستییم تێدا پێکاوە، ئەوە بە چاکەو بەخششی خوای بەخشەرو بە بەزەیی دەزانم‌و، هەرچی تێشیدا بەهەڵەداچووم، ئەوە فیتی نەفس‌و شەیطانەو، ئایین‌و بەرنامەی تێرو تەواوو پاك‌و بێگەردی خوای تاك‌و پاك لێی بەرییە.

سبحانك اللّهم وبحمدك أشهد أن لا اله الاّ أنت أستغفرك وأتوب اليك

٢٠ جمادي الثانية ١٤٢٩ك /٢٤
حوزەیرانی ٢٠٠٨ز
هەولێر

# بەرهەمەکانی دانەر

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی ٢/ ٢٠٠٦.
٢- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام‌و ڕێچکان. چاپی ٣/ ٢٠٠٦
٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤ دا. چاپی ١ /١٩٨٧
٤- کۆمەڵی خـوا. چاپی ١ / ١٩٨٨
٥- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەوچۆنە؟ چاپی٣ /٢٠٠١
٦- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامی. چاپی ١ /١٩٨٩
٧- ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ کامەیە؟! چاپی ١/ ١٩٨٩
تێبینی: دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروبڕوای مسوڵمان) وە دواتر ئەمیش خرایە نێو کتێبی (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە .
٨- ڕێگای صالح بوون‌و بەرەو خوا چوون. چاپی ٥ /٢٠١٢
تێبینی: وەرگێڕدراوە بۆ عەرەبی‌و لەژێر چاپە .
٩- کوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! چاپی ١ / ١٩٨٩
١٠- حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغووت. چاپی ٢ /٢٠٠٥
١١- سۆزی نەتەوایەتی‌و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسـلامدا. چاپی ٣ /٢٠٠٥
١٢- مسـوڵمانی کامڵ/بەشی یەکەم: بیروبڕوای مسوڵمان. چاپی ١٩٩٧/١
تێبینی: ((دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە)).
١٣- چارەسـەری کێشـەی کورد لە نێوان ئیمان‌و پەرلەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٢
١٤- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان‌و نەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٣
١٥- بزووتنەوەی ئیسلامیی‌و ئایندەیەکی گەش‌و ڕوون. چاپی ١ / ١٩٩٥
١٦- پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦
١٧- چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسـلامییەکانی کوردستان. چاپی ١ /١٩٩٦
١٨- ئیسلام‌و کێشـە هەنووکەییەکان. چاپی ١ /١٩٩٥
١٩- بـا وریـا بیـن! داڕووخـانی ڕەوشـت کۆمەڵگاکـەمان بـەرەو هەڵدێر دەبـات.
چـاپی ٢ /٢٠٠٦.

٢٠- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی یەکەم/ خواپەرستی بەگشتی، پاكوخاوێنی .

٢١- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی دووەم/ نوێژ بەرپاکردن .

٢٢- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی سێیەم/ ماڵ بەخشینو زەکات.

٢٣- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی چوارەم/ ڕۆژوو گرتن، حەجو عومرە، زیکری خوا.

٢٤- گەڕانەوە بۆ لای خـوا ﷻ . چاپی ٥ /٢٠١٠

٢٥- زانایانی ئیسـلام کێنو چۆنن ؟! چاپی ٣ / ٢٠١١

تێبینی : بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢٦- بنچـینە گرنگـەکانی هەڵسوکـەوتی شـەرعییانەو ژیرانـە لەگـەڵ وردە بابەتـە خیلافییـەکاندا، چاپی ١ / ١٩٩٩ .

تێبینی: ئەم نامیلکەیە باسێکی بەرگی یەکەمی کتێبی: (خواپەرستی ئیسـلامیی)یە، بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێـڕراوەو چاپیش کراوە.

٢٧- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێران کردن دا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٨- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چییەو چۆنە؟ چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٩- بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتیەکانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی ڕەسەن .

تێبینی: (ئەم نامیلکەیە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی).

٣٠- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانجو هەڵوێستەکانی. چاپی ١ /٢٠٠١

٣١- پاسـاوو بەڵگـە شـەرعییەکانی بنیاتنـانی کۆمـەڵی ئیسـلامیی، ئاڵقەکانی: ١و ٢ و ٣ و ٤ . چاپی ١ / ٢٠٠١

٣٢- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانیو ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /٢٠٠٠.

٣٣- ئافرەتو خێزان لە سایەی شەریعەت دا . چاپی ٢ / ٢٠٠٥

٣٤- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم . چاپی ٥ / ٢٠٠٥

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٥- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشكو برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ /٢٠٠٢

٣٦- سـنوورە قەدەغـەکان مەشـکێنن! (چـاوپێکەوتنی دکتۆرحسـین محمـد عزیـز). چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣٧- چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٨- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٩- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنجو ئاگادارییەك. چاپی ١/ ٢٠٠٢

٤٠- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٤١- جیهاد لەڕێی خوادا چییەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ؟ چاپی١/ ٢٠٠٢.

٤٢- ئەشکەنجەو زیندان (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر) چاپی ٣/ ٢٠٠٩ .

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپو بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە.

٤٣- کارو پڕۆژەی ئیسلامیمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی ٢/ ٢٠٠٦ .

٤٤- ئیسلامو مسوڵمانەتیوکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٤٥- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/١، ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی چییەو چۆنە؟! ١ تا ١٢ چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٦- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٢، خوا بە یەکگرتن (التوحید) لە بەدیهێنەرایەتییو پەروەردگارێتی دا. ١٣ تا ٢٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٧- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٣، خوا بەیەکگرتن لە ناوو سیفەتو لە پەرستراوێتی دا، ٢٧ تا ٣٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٨- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٤، ئیمان بە فریشتەکانی خوا (عزّو جل)، کتێبەکانی خوا (عزّو جل)، پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام). ٣٧ تا ٤٠ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٩- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٥، ئیمان بە ڕۆژی دوایی قەزاو قەدەر ٤١ تا ٤٥ . چاپی ١ / ٢٠٠٨

٥٠- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/٦، تایبەتمەندییو دیدو بۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست. ٤٦ تا ٥٠ . چاپی ١ / ٢٠٠٨

٥١- تەوژمی ئیسلامییو عەلمانییو خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیان. چاپی ١/ ٢٠٠٧، چاپی ٢/ ٢٠١١

